74

# رۆژانەکانی بۆلیڤیا



نوسینی:
چێ گیڤارا




د. فیدڵ کاسترۆ
پێشەکی بۆ نوسیوە

وەرگێڕانی:
سامان عەلی حامید

ئارنیستۆ چێ گیڤارا

# ڕۆژانەکانی بۆلیڤیا

**دکتۆر فیدڵ کاسترۆ**

**پێشەکی بۆ نووسیوە**

**وەرگێڕانی: سامان عەلی حامید**

**چاپی یەکەم**

**سلێمانی**................. 2006

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە(74)

ناوی کتێب: ڕۆژانەکانی بۆلیڤیا
بابەت: یاداشت
نوسینی: ئارنیستۆ چێ گیڤارا
وەرگێڕانی: سامان عەلی حامید
تایپ: وەرگێڕ
شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
دیزاین: فوئاد کەولۆسی
ساڵی چاپ: 2006
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم ـ سلێمانی
تیراژ: 1000 دانە
ژمارەی سپاردن: (626) ی ساڵی 2006 ی پێدراوە

# پێشەکییەکی پێویست

چێ لەژیانیدا وەکی جەنگاوەرێك وا راهاتبوو تێبینی و سەرنجە رۆژانەکانی بەوپەڕی بایەخ و گرنگیدانەوەو لەسەرەوەختی رێکردنە دوورودرێژەکان بەنێو ناوچە سەختەکان و جەنگەڵ و دارستانە شێدارەکان و کاتێك کاروانی پارتیزانان کە پشتیان لەژێر باری کۆڵەپشت و کەلوپەل و چەکەکانیاندا چەمابووەوە...بەمەبەستی پشودان لەرێ لایان دەداو وچانیان دەدا یاخود کاتێك کە رێچکەی پارتیزانان فەرمانی راوەستانی پێدەدرا بۆ هەڵدانی خێوەت لەکۆتایی رۆژێکی پڕ لەماندوێتیدا، تۆماربکات...ئەوێ رۆژێ دەمانتوانی چێ، وەکی لەدواییدا کوباییەکان بەوپەڕی رێزەوەو هەر لەیەکەمین ساتەکانەوە ئەم ناوەیان بەسەردا دابڕی، ببینین کە دەفتەرێکی بچوکی لە بەرباخەڵی دەردەهێناو تیایدا تێبینییەکانی خۆی بەدەستخەتی پزیشکێك تۆماردەکرد کە بەهۆی گچکەیی پیتەکانییەوە خوێندنەوەی دژواربوو.

ئەو یادەوەرییانە کە توانی تۆماریان بکات و لەفەوتان بیانپارێزێت، دواتر دەربارەی نووسینەوەی بیرەوەرییە مێژووییە جوان و سەرنجراکێشەکانی سەبارەت شۆڕشی کوبا یارمەتییاندا، کە یادەوەریگەلێکی بڕشت و دەوڵەمەندن بەناوەرۆکە شۆڕشگێڕو پەروەردەیی و، مرۆییەکانیان. ئێمە ئەمجارەو بەهۆی ئەو نەریتەوە کە چێ دەستبەرداری نەبوو، دیارە

مەبەسـتمان لەنـەریتی تۆمـارکردنی رۆژانـەی رووداوە دیارەکانـە، زانیاریگـەلێکی تێروتەسـەل‌و ئێجگـار وردو دروسـتمان لەبەردەسـتدایە، زانیاریگـەلێکی بـەنرخ دەربـارەی ئـەو چـەند مانگـە لـەژیانی لـەبۆلیڤیا کـە دلێرانە بەسەری برد.

ئەم رۆژانەیە کە لەراستیدا بۆ ئەوە نەنووسراوە تاوەکو بڵاوبکرێتەوە، وەکـی ئامرازگـەلی کـارکردن‌و بـۆ بڕیـاردانی بـەردەوام لەسـەر رووداوەکـان‌و بارودۆخـەکان‌و کەسـەکان بەکـەڵکی دەهـاتن‌و، دەرفـەتی ئەوەشـیان بـۆ دەرەخسـاند جلـەو بـۆ بـیری تیـژی رەخنـەی شـل بکـات. ئـەم رۆژانەیـە بەشێوازێکی سادە نووسراوەو هەر لەسەرەتاشەوە تا کۆتایی پارچەیەکی تەواو یەکانگیری پێکهێناوە.

هـەروەها نابێـت ئەمـەمان لەیادبچـێت: ئـەم رۆژانەیـە لەسـاتە دەگمەنـەکانی وچان‌و، لەگەرمەی شـەکەتیی جەستەیی‌و، تێکۆشـانێکی دلاوەرانـەدا کە لە وزەی مرۆڤ دەردەچێت، نووسراوە. رۆژانەیەکن‌و، لەم نێوەندەدا نووسراون: نێوەنـدی پابەندییـە ماندوکـەرەکانی وەکـی سـەرکردەی گروپێـك لەجـەنگاوەران لـەقۆناغی دژواری سـەرەتای خەباتێکدا کـە لەهەلومـەرجێکی مـادیی هێنـدە سـەخت‌و دڵڕەقانـەدا بـەرپابووە کـە ناچێتە ئەقڵـەوە. ئەمـەش جارێکی دی شێوازی کـارکردنی چێ‌و، ویست‌و ئیرادە پۆڵایینەکـەیمان بۆ ئاشکرا دەکات.

چـێ لـەم رۆژانەیـەو، لـەمیانی ئـەو شـیکردنەوە تێرونەسـەلەیدا کـە بـۆ رووداوەکـانی هـەموو رۆژێکـی دەکـات، ئـەو چـەونیی‌و رەخنـەو گازندانـە دەردەخات کە بەشێوەیەکی بێ چەندوچون هاورێی گەشەکردنی شۆڕش‌و جەنگی پارتیزانیی دەبن.

ئـەم چەشـنە رەخنانـە ناکرێـت‌و ناشـێت لـەتۆماری رۆژانـەی ئـەو تیمـە جـەنگاوەرە بـەولاوە زیاتربێت بەنایبەت لەقۆناغێکدا کە تیایـدا هێشتا ئـەم

تیمه تهنها گرووپێکی بچوك و سهرهتاییه: لهبهرئهوه ناچاره بهرهنگاری مهرجگهلێکی مادیی ئێجگار سهخت و دوژمنێکی لهرووی ژمارهوه زیاتر بێتهوه...رهنگه کهمترین کهمتهرخهمی و سادهترین چهوتیی ببێته مایهی مالوێرانی و، سهرکرده پێویسته تهواو توندبێت و، کهڵك لههموو فاکت و رووداوێك وهربگرێت ئیدی چهنده بچوکیش بن، بۆ پهروهردهکردنی جهنگاوهران و چوارچێوهکانی داهاتووی تیمگهلی نوێی جهنگاوهران.

دامهزران و دروستبوونی پارتیزانان ئهوه دهخوازێت که ههمیشه رووهو ئابروو ویژدانی ههر تاکهکهسێك ههنگاو ههڵبگرێت. چێ ش دهیزانی چۆن و به چ شێوهیهك ژێگهلی ههستیاری شۆڕشگێڕان دهوروژێنێت. کاتێکیش که چهند جارێکی یهك لهدوای یهك سهرزهنشتی مارکۆس ی کردو ههڕهشهی ئهوهی لێکرد که شێوه دهرکردنێکی ئابڕوبهرانه لهگروپهکه دهری دهکات، مارکۆس لهوهڵامدا وتی: پێش ئهوهی ئهو کاره بکهن گولله بارانم بکهن و بمکوژن! دواتر مارکۆس زۆر ئازایانه گیانی خۆی بهختکرد...ئهو پیاوانهش که متمانهی ئهو پهتیی و بێگهردی کردبون و، پاشان رۆژێك لهرۆژان و لهبهر هۆیهك لههۆکان ناچاربوو سهرکۆنهیان بکات، ههمان ئاقار وهبهردهگرن. چێ سهرکردهو، براو، مرۆڤێك بوو بهڵام ههروهها دهشیزانی چۆن چۆنی توندیی دهنوێنێت و دڵڕهقانه ههڵسوکهوت دهکات کاتێك که ههڵوێستهکه ئهوه بخوازێت...تا ئهوپهڕی سنورو، لهتهك خۆیدا دڵڕهق وتوندتربوو وهك ئهوهی لهتهك کهسانی تردا. چێ دیسپلینی لهسهر بناغهی ویژدانی ئهخلاقیی جهنگاوهرو، هێزی مهزنی ههڵقوڵاوی ناخی خۆی وهکی نموونهو سهرمهشقێك، دامهزراند.

لهنێو رۆژانهکانیدا ههندێکجار باسی ریجس دۆبرێ دهکات و، ئاست و ئهندازهی ئهو پهژارهیه دهردهخات که بهندودهستگیرکردنی ئهو نووسهره شۆڕشگێڕه دوچاریان کردووه. ئهو نووسهرهی که بهئهرکێك راسپاردهی

ئەورووپا كرابوو ئەگەرچی ئەو خۆی لەناخی دڵییەوە حەزی بەمانەوە لەنێو جەنگی پارتیزانییدا دەكرد. هەربۆیە، سەبارەت حوكم و بڕیاردان لەسەر هەڵسوكەوت و رەفتاری دۆبریێ، هەندێك دودڵیی و جاروباریش هەندێك گومان دەردەبڕێت.

چێ نەیتوانی لەنزیكەوە ئاگاداری ئەو داستانە بێت كە دۆبریێ لەنێو چنگی دەزگاكانی داپلۆسیندا گوزەرانی كرد، هەروەها نەشیتوانی ئاگاداری هەڵوێستی توندوئازایانەی بێت لەبەردەم ئەو كەسانەدا كە دەستگیریان كردو ئەشكەنجەیاندا.

بەڵام وێڕای ئەوە هێمای بۆ بایەخی سیاسی زۆروزەوەندی دادگاییەكەی كردو. لەنێو رۆژانەكانیداو لەرۆژی سێی تشرینی یەكەمدا، واتە پێش شەش رۆژان لەكوژرانی و لەنێوەندی هەلومەرجێكی سەختدا دەنووسێت: "هەواڵی ئەوەمان بیست كە چاوپێكەوتن لەگەڵ دۆبریێدا كراوەو ئەویش لەبەرنگاربوونەوەی داواكەرێكدا كە هەراسانی كردووە ئێجگار چاونەترس و دلێر بووە."، ئەم واژانە دوایین ئاماژەبوون بۆ دۆبریێ.

لەبەرئەوەی ئەم رۆژانەیە چەند جارێك هێما بۆ پەیوەندییەكانی شۆڕشی كوبا بەبزوتنەوەی پارتیزانانەوە دەكات هەربۆیە رەنگە هەندێك كەس بڵێن ئێمە سەروەختێك كە بڵاوی دەكەینەوە كارێكی وروژێنەر دەكەین كە لەباریدایە نەیارانی شۆڕش و ئیمپریالیستە بانكییەكان و هاوپەیمانانیان لەدیكتاتۆرانی ئەمەریكای لاتین بە بەهانەگەل بۆ پشتیوانیكردنی نەخشەكانیان كە ئامانجی گەمارۆدانی كوباو گۆشەگیركردن و دەستدرێژیكردنە سەرێتی، تەیاربكات.

جێی حۆیەتی ئەوە بیری ئەو كەسانە بخەینەوە كە ئەمجۆرە حوكم و بڕیارانە دەدەن و پێیان بڵێین: ئیمپریالیزم هیچ رۆژێك لەرۆژان پێویستیی بە بەهانەگەل نەبووە تاوەكو كاروكردەوە ئابڕوبەرەكانی لە هەر شوێن و حێیەك

لەجیهانـدا ئـەنجام بـدات و تەقەللاکانیشـی لـەپێناو تێکشـکاندنی شۆڕشـی کوبـادا لەگـەڵ دەرچـوونی یەکـەمین یاسـای شۆڕشـگێڕیی لەولاتەکەمانـدا دەستپێیکرد، ئەویش لەبەر ئاکە هۆکارێکی ئاشکراو رۆشن کە ئەمەیە: ئەو رۆڵـەی کـە ئـەم ئیمپریالیزمـە دەیگێڕێـت پاسـەوانیکردنی کۆنەپەرسـتیی جیهانییـەو، داینـەمۆی سـەرەکی دژە شـۆڕش و پـارێزەری ئـەو بونیـادە کۆمەلایەتییە دواکەوتوو و نامرۆڤایەتییانەشە کە لەجیهاندا هەن.

رەنگە هاوکاریکردنی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕیی بکرێتە بەهانە، بەلام هـەرگیز هۆکاری ئەو دەستدرێژییانە نابێت کە یانکییەکان دەیکەن. رەتکردنـەوەی هاوکاریی نێونەتەوەییش بەمەبەستی داماڵینی بەهانە لەئیمپریالیزم چیدی نییە جگە لەسیاسەتی کۆمیدی نەعامەو تەواو نامۆ بەسیمای نێونەتـەوەیی شۆڕشـە کۆمەلایەتییـە هاوچـەرخەکان، هـەروەها دابـڕان لـەهاوکاریکردنی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕیی بەمانای داماڵینی بەهانـە لەئیمپریالیزمی یانکیی نایـەت بـەڵکو لەراسـتیدا مانـای هاوکـاریکردنی ئـەو ئیمپریالیزمـەو سیاسـەتەکەیەتی کـە ئامـانجی ئەوەیـە دەسـت بەسـەر جیهانـدا بگرێـت و کۆیلەی بکات.

کوبـا دەوڵـەتێکی بچـوکەو ئابورییەکەشـی، وەکـی ئـابوری سـەرجەم ئـەو دەوڵەتانەی کە کۆلۆنیـالیزم و ئیمپریالیزم داگیری کردون و ماوەی چەندین سـەدەگەل چەوسـاندونییەتییەوە، ئابورییـەکی دواکـەوتووە. کەوتووەتـە دوریـی 90 میـل لەکـەنارەکانی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانەوەو، ویلایەتـە یەکگرتووەکان بنکەیەکی دەریایی لەسەر خاکەکەیدا هەیە(1)و...لەهـەوڵ و کۆششـیدا بـۆ وەدیهێنـانی گەشـە ئـابوری و کۆمەلایەتییەکـەی، روبـەروی چەندین کۆسپ و تەگەرە بووەتەوە.

لەوەتـەی سـەرکەوتنی شۆڕشـەوە مەترسـیگەلێکی گـەورە روبـەروی ولاتەکەمان بووەتەوە بەلام ئیمپریالیزم هـەرگیز نـەیتوانیوە ملکەچی بکات و

ئێمە زۆر گوێ بەو ئاستەنگانە نادەین کە وەبەرگرتنی هێڵ وئاراستەیەکی راست ودروستی شۆڕشگێڕانە روبەرومانی دەکاتەوە.

هەرچی لەلایەنی شۆڕشگێڕیشەوەیە بڵاوکردنەوەی رۆژانەکانی چێ لەبۆلیڤیا، مەسەلەیەکە ساتێك دودڵیی هەڵناگرێت. چونکە رۆژانەکانی چێ کەوتنە دەست باریانتۆس و ئەویش دەسبەجێ کۆپییەکی پێشکەش بەدەزگای هەواڵگریی ئەمەریکاو، پینتاگۆن و، حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان کرد. هەندێك لەو رۆژنامەنووسانەش کە پەیوەندییان بەدەزگای هەواڵگریی ئەمەریکاوە هەیە توانییان رێگایەك بۆ پەیداکردنی ئەم رۆژانانە لەنێو خودی بۆلیڤیا خۆیدا بدۆزنەوەو وێنەیان گرت و بەڵێنی ئەوەیاندا کە لەکاتی ئێستادا بڵاوی نەکەنەوە(2).

حکومەتەکەی باریانتۆس و سەرکردە سەربازییە گەورەکان هۆگەلێکی زۆریان هەیە بۆ پەردەپۆشکردنی ئەم رۆژانەیە کە دەرفەتی، ئەوەمان بۆ دەرەخسێنێت دەرکی ئەو کەنەفتییە سەرتاپاگیرە بکەین کە سوپای بۆلیڤیا گیرۆدەیەتی، شانبەشانی دەرککردن بەو شکستانەی کە بەدەستی گروپێك لەو جەنگاوەرە کۆڵنەدەرانە دوچاری بوو کە توانییان تەنها لەماوەی چەند هەفتەیەك لەشەڕو پێکداداندا دەست بەسەر نزیکەی دووسەد پارچە چەکیدا بگرن.

وێڕای ئەوە، چێ، باریانتۆس و رژێمەکەی بەهۆی دەستەواژەگەلێکەوە وەسف دەکات کە هێندە راست ودروستن تاهەتایە مێژوو بەنەمریی دەیانهێڵێتەوە، ئیمپریالیزمیش خاوەنی هۆگەلی تایبەتی خۆی بوو لەبڵاونەکردنەوەی ئەم رۆژانەیەدا: چونکە چێ و نموونە بلیمەتەکەی رۆژ لەدوای رۆژ لەجیهاندا روو لەزیادبوونن. بیروڕاکانو..ئەو وێنەیەش کە لەبارەیەوە نیگارکراوەی ناوی خەباتی دژ بەو زوڵم و ستەمانەی حە

چەوساوەکان دوچاری دەبن، لای خوێندکاران و، رۆشنبیران لەتێکڕای جیهاندا مایەی بایەخ و گرنگیدانێکی زۆرە.

بۆ نموونە لەنێو خودی ویلایەتە یەکگرتووەکان خۆیدا، بزوتنەوەی رەشپێستەکان و خوێندکارە پێشکەوتنخوازەکان وێنەی چێ یان بەرزکردەوە...وێنەکانی ئەو بەجۆرێك لەخۆپیشاندانە خەباتکارییە مەزنەکان لەپێناو مافە مەدەنییەکان و دژ بەدوژمنکاری و دەستدرێژی بۆ سەر ڤێتنام بەرزکرانەوە هەر دەتوت دروشمەکانی جەنگەکە خۆین. مێژوو تەنها بەدەگمەن، ئەگەر نەڵێین لەنموونەی هەر نییە، وێنەو ناوو نموونەیەکی بۆ باسکردوین کە بەو خێراییە زۆرەو بەو توانا مەزنە خۆی بەسەر مرۆڤایەتییدا سەپاندبێت. چونکە چێ بەرجەستەی ئەو گیانە نێونەتەوەییە دەکات کە تایبەتمەندییەکی جیهانی ئەمڕۆکەو پتر لەجیهانی ئەمڕۆکەش تایبەتمەندییەکی جیهانی داهاتووە... لەبێگەردترین و خاوێنترین شێوە لەشێوەکانیدا.

لەو کیشوەرەوە کە تا دوێنێی نزیك بەدەستی دەوڵەتە کۆلۆنیالیستییەکان دەچەوسێنرایەوەو، کە تا ئەمڕۆکەش ئیمپریالیزمی یانکیی دەیچەوسێنێتەوەو لەبارێك لەدواکەوتن و پاشکەوتوویی ستەمگەرو ترسناکدا دەیهێڵێتەوە، ئەو روخسارە سەرسوڕهێنە هەڵوەستە دەکات و خەباتی شۆڕشگێڕیی بەوێنەی گەردەلولێکی سەرتاپاگیر تەنانەت بەرەو ناوجەرگەی پایتەختە ئیمپریالیی و کۆلۆنیالییەکان بەرپادەکات.

ئیمپریالیستەکان لەهێزی ئەم سەرمەشقەو هەموو ئەو شتانە کە دەیناسێنن دەترسن...دروست ئەوەی کە رێگای بڵاوکردنەوەی ئەم رۆژانەیەشی لێگرتن..بەهاو نرخە بنەڕەتییەکەی بوو: مەبەستم لەوەیە گوزارشتێکی زیندوی کەسایەتییەکی سەرسوڕهێن و، وانەیەك بوو دەربارەی جەنگی پارتیزانیی لەپەرۆشیی وگەرمیی وگرژیی رۆژەکاندا نووسرابوو و، بەرمیلێك

بوو لەباروت و، بەڵگەی راستەقینەی ئەوەبوو کە مرۆڤی ئەمەریکیی لاتینی مرۆڤێکی لەبەردەم ئەو کەسانەدا کە میللەتان کۆیلە دەکەن و لەبەردەم سوپاو لەشکرە کرێگرتەکانیاندا، کەنەفت و بێتوانا نییە.

رەنگە ئەوەش لەبەرژەوەندییاندا نەبێت کە شۆڕشگێرە ساختەو هەلپەرست و. جادوگەرەکان لەهەموو چەشن وجۆرێك لەوانە ئاشکرابکرێن کە خۆیان بەمارکسیی و، کۆمۆنیست دەزانن و بەقسە خۆیان هەڵدەکێشن و لەبارەی حوکمدان لەسەر چێ ش هیچ دوودڵییەکیان نەنواندو وتیان: بەهەڵەداچوو. لەروانگەی ئەوانەشدا کە کەم هێرشبەرترن چێ چیدی نەبووجگە لەسەرکێش یاخود ئایدیالیستێك و، گیانلەدەستدانیشی چیدی نییە جگە لەکورتکردنەوەی خەباتی شۆڕشگێڕیی چەکداریی لەئەمەریکای لاتین داو...دەڵێن:"ئەگەر چێ، کە مەزنترین داکۆکیکارە لەم بیروڕایانەوجەنگاوەرێکی بەئەزمونە، لەجەنگەپارتیزانییەکاندا گیانی لەدەستداو جولانەوەکەشی بۆلیڤیایان ئازادنەکرد...ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە رێگایەکی چەوێڵی وەبەرگرتووەو بەهەڵەداچووە!...".

زۆربوون ئەوخوێڕییانەی کە بەمەرگی چێ شاگەشکەوکامەران بوون بێئەوەی لەشەرماندا سور هەڵبگەرێن چونکە هەڵوێست و لێکدانەوەکانیان بەوێنەی تەبابوونی لەگەڵ هەڵوێستی ئیمپریالیزمدا، لەتەك هەڵوێستی ئەو دیکتاتۆرانەدا؛ کە تا بینە قاقایان رۆچووەتە نێو کۆنەپەرستییەوە، تەواو کۆك وتەبایە.

بەمجۆرە پاکانە بۆ خۆیان دەکەن یاخود پاکانە بۆ ئەو سەرکردە ناپاکانە دەکەن کە بۆ ساتێك لەبارەی رێبەرایەتیکردنی خەباتی چەکدارییەوە دودڵییان نەنواند بەڵام نیازە راستەقینەکانیان، وەکی لەدواییدا دەرکەوت، ئامانجی تێکشکاندنی گروپگەلی جەنگاوەران و پەکخستنی کاری شۆڕشگێڕیی و سەپاندنی چارەسەرو رێگاچارە سیاسییە شەرمەزارو

کۆمیدییەکانی خۆیانە چونکە تەواو کەنەفتن و ناتوانن ئاقارو ڕێگایەکی دیکە وەبەربگرن... بەمجۆرە بیانو بۆ ئەم کەسانە دەدۆزنەوە: ئەوانەی کە نایانەوێت شەڕبکەن و، ئەوانەی کە هەرگیز لەپێناوی میللەت و لەپێناو ئازادکردنیدا ناجەنگێن و، ئەوانەی بیروباوەڕە شۆڕشگێڕییەکانیان شێواندووەو کردویانەتە تلیاکێکی ئاینیی کە نە ناوەڕۆك و نە پەیامێك بێشکەشی جەماوەر دەکات و، ئەوانەی کە ڕێکخستنەخەباتکارەکانی میللەتیان کردووەتە ئامرازگەل بۆ لەیەکدی گەیشتن لەتەك چەوسێنەران لەناوەوەولەدەرەوەوەڕاو، بۆ ئامرازگەل بۆ داکۆکی لەسیاسەتگەلێکی تەواو دوور لەبەرژەوەندییە ڕاستەقینەکانی میللەتە چەوساوەکانی ئەم کیشوەرە.

چێ مەرگ و گیانلەدەستدانی خۆی لەشەڕدا بەمەسەلەیەکی سروشتی و پێشبینیکراو تەماشا دەکردو، بەتایبەت لەنێو دوایین نووسینەکانیدا هەوڵیداوە ئەم رووداوە ئاشکرابکات: گیانلەدەستدانی من کاروانی بێ چەندوچوونی شۆڕش لەئەمەریکای لاتیندا، ڕاناگرێت. لەنێو پەیامەکەشیدا بۆ کۆنگرەی سێ کیشوەرەکە جارێکی دیکە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کاتێك کە وتی: "سەرلەبەری کاروکردەوەکانمان هاواری شەڕێکە دژ بەئیمپریالیزم... لە هەر شوێن و جێیەك مەرگ و مردن ڕووبەڕومان بێتەوە پێشوازی لێدەکەین بەو مەرجەی ئەم هاوارەمان ببیسترێ و دەستێکی دی درێژبێت تاوەکو لەدوای خۆمان چەکەکەمان هەڵبگرێت..".

ئەو خۆی بەسەربازێك لەنێو شۆڕشدا سەیر دەکردو هەرگیز گوێی بەپاراستنی گیان و ژیانی خۆی نەدەدا. ئەوانەی کە لەکۆتایی خەباتیدا لەبۆلیڤیا سەرنەکەوتنێکی ئایدیاکانی دەبینن دەتوانن بەهۆی هەمان ئەم بیرکردنەوە ساویلکانەیەوە نکوڵی لەبەهای ئایدیاو تێکۆشانی سەرجەم ئەو مەزنە خەباتگێڕو بیریارە شۆڕشگێڕانەش بکەن کە پێش ئەو

هاتن... بەدامەزرێنەرانی مارکسیزمیشەوە کە نەیانتوانی بەرلەوەی بمرن پەیامەکەیان تەواوبکەن و بەروبومی تەقەللا مرۆییەکانی خۆیان ببینن.

لەکوباشدا گیانلەدەستدانی خۆسێ مارتی(3) یاخود ماسیۆ لەگۆڕەپانی شەڕدا... لەتەك دەستێوەردان و پەلاماری ئیمپریالیزمی دوابەدوای کۆتایی شەڕی سەربەخۆیی و گیانلەدەستدانی داکۆکیکارگەلێکی لێهاتوو لەشۆڕشی سۆشیالیستییلەنموونەی خۆلیۆ ئەنتۆنیۆ میلا کە لەلایەن کرێگرتەکانی ئیمپریالیزمەوە تیرۆرکرا، هەموو ئەمانەو بۆ ماوەیەکی دورودرێژ، ڕێگایان لەسەرکەوتنی ئەو جوڵانەوەیە نەگرت کە لەوەتەی سەدساڵ لەوەوبەرەوە دەستییێکردو.. هەرگیز کەسیش ناتوانێت لەدادپەروەریی بێگەردی ئەو مەسەلەیە کە نەو خەباتگێڕانەی پێشوو لەپێناویدا تێکۆشان و لەراستی ودروستیی بیروباوەڕە سەرەکییەکانیان کە بەردەوام سروشی بەشۆڕشگێڕە کوباییەکان بەخشیوە، بکەوێتە گومانەوە.

ڕۆژانەکانی چێ بەهۆی ئەو سەرنجانەی کە لەدوتوێیاندا هاتووە بوارودەرفەتی ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێت دەرکی ئەوە بکەین کە چەندە تواناکانی لەبارەی سەرکەوتنەوە راستەقینە بوون و چەندە توانای وەرچەرخێنیجەنگی پارتیزانان سەیروسەرسوڕهێن بوو. چێ لەبەردەم نیشانە دڵنیاکانیلاوازیی رژێمی بۆلیڤیاو هەرەسی خێرایدا، نووسیویەو دەڵێت: "حکومەت بەخێرایی هەرەسیدەهێنا... ئەگەر لەم ساتەدا سەد پیاوی دیکەمان لەتەکدابووایە!".

چێ، بەحوکمی ئەزمونە کوباییەکەی، ژمارەی ئەو کەڕەتانەی دەزانی کە تیایاندا گروپە بچوکە شۆڕشگێڕەکەمان هێندەی نەمابوو تەفروتونابکرێت. ئەگەر تەفروتوناش بکرایە تارادەیەك هۆکارەکەی بۆ ڕێکەوت و هەلومەرجیسەخت ودژواری جەنگ دەگەڕایەوە... بەڵام ئایا ئەمە مافی ئەوە بە هەر مرۆڤێك دەدات کە ئەم ئاقارو هێڵەمان بەئاقارو هێڵێکیچەوت لەقەڵەم

بـدات و...وەکـی نموونەیـەك بەردەسـتی بخـات کـە لەباریدایـە شـۆڕش دابمرکێنێتەوەو وا لەمیللەتانیش بکات هەست بەکەنەفتیی بکەن؟

مێـژوو پـڕە لـەو جوڵانـەوە شۆڕشـگێڕییانەی کـە زیـاد لـەجارێك شکسـتیان هێناوە، لەنێو خودی کوباخۆشیدا ئایا پێش شەش ساڵ بەر لەسـەرکەوتنی یـەکجارەکی خـەباتی چـەکداریی میللـەت، ئـەزمونی مۆنکـادامـان گـوزەران نەکرد؟ هەندێك کەس نێوان بیست‌وشەشـی تـەممووزی سـاڵی 1953ی وادەی هێرش بۆ سەر مۆڵگەی مۆنکادا لەسانتیاگۆ کوبا و، دووی کـانونی یەکـەمی سـاڵی 1956ی وادەی دابـەزین لـەگرانمـایـان بـەو جـۆرە سـەیر دەکـرد کـە خـەباتی شۆڕشـگێڕیی بەرامبـەر سـوپایەکی هاوچـەرخی پڕچـەك بەباشـترین جۆری چەك، خەباتێکی بێهودەیەو کاری گرووپێك لەجەنگاوەران چیدی نییە جگـە لـەوەهمێك لەوەهمـەکانی ئایدیالیسـتان و خـاوەن بۆچـوون و روانگـە دوورەکان کە بەم کارەیان(ئێجگار بەهەڵەدا دەچن).

دواتر لەپێنجی‌کانونی‌یەکەمی ساڵی 1956دا ئەو شکستە توندە کە گرووپـە شۆڕشـگێڕە نالێهاتووەکـە دوچـاری‌بوو و بەتـەواوی پەرتـەوازە بـوو هـات و بەتـەواوی راسـتیی ئـەم پێشـبینییە بەدبینانەیەی‌سـەلماند. بـەڵام لـەپاش تێپەڕبوونی تەنها 25مانگ..ئەو جەنگاوەرانەی کە لەژیاندا مابوونەوە هێندە هێزوئـەزمونیان پەیـداکرد کـە بـۆ تێکشـکاندنی ئـەم سـوپایە پێداویسـت و زەروریین.

هەمیشـــە لەهـــەموو دەوران و گشـــت هەلومەرجێکـــدا، بەهانـــەو بیـــانوی زیاتروزیاتر دەبێت بۆ شەڕنەکردن..بەڵام هەمیشە ئەم هەڵوێستە تاکە رێگا دەبێـت کـە رووەو ئـازادی نامانبـات. چـێ نـەژیا تـاوەکو دروسـتیی بیروبۆچـوونەکانی خـۆی ببینێـت بـەڵام بـەخوێنی خـۆی ئاویـدان. هەڵبـەت شۆڕشـگێڕە ساختەکانیش کـە رەخنـەی لێـدەگرن، بەترسـنۆکی سیاسـیی و

•

هـــەژاریی تاهەتاییانـــەوە دەربـــارەی کـــارکردن...دەژیـــن تـــاوەکو دەرك بەهەقیقەتی قسە قۆڕەکانی خۆیان دەکەن.

ئەوەی مایەی سەرنجە ئەوەیە یەکێك لەنموونەکانی ئەو شۆڕشگێڕانە کە رۆژانـە لـەئەمـەریکای لاتیندا دەردەکـەوێت، دیـارە مەبەستم لـەو کەسـەش ماریۆ مۆنجەیە، کە وەکی دواتر لەرۆژانەکاندا دەیبینین، نازناوی سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی بۆلیڤیای هەڵگرتبوو، بڕوای وابێت کە مافی ئەوەی هەیە سـەرکردایەتی سیاسـیی و سـەربازیی جولاّنـەوە شۆڕشـگێڕییەکەی بۆلیڤیـا لەچیّ بسەنێت.

لەبەرئـەوەی نـاوبراو بـەڵێنی دابـوو دەسـتبەرداری پۆستەکەی خـۆی بێـت لەنێوەنـــدی پـــارتی نـــاوبراودا لـــەپێناو وەرگرتنـــی ســـەرکردایەتی ئـــەو جولاّنەوەیەدا...هەربۆیە بڕوای وابوو تەنها بوونی لەم پۆستەدا مافی ئـەوەی پێدەدات کە داوای ئەو بڕشتە بکات. هەڵبەت ماریۆ مۆنجە هـیچ ئـەزمونێکی لـــەبارەی جـــەنگی پارتیزانییـــەوە نـــەبوو و هـــەرگیز لەژیانیشـــیدا نەچـــووەتە شەڕەوەو نەجەنگاوە..کاتێکیش کە خۆی بەکۆمۆنیست زانیـوە هـیچ رۆژێك لەرۆژان هەستی بەوە نەکردووە کـە ئـەرکی سەرشـانی ئەوەیـە لەشـۆڤێنیزمی ریســـواو بێنرخـــی جـــەنگاوەرانی ســـەرەتای ســـەربەخۆیی تێپـــەڕێنێت، بەوچەشنەی کە خەباتگێڕانی پێشوو کردویانـە. (سـەرانێکی کۆمۆنیست)ی لـەم چەشـن وجۆرەو بـەم چەمك و واتایـە دەربارەی خـەباتی دژ بـەئیمپریالیزم لـەم کیشـوەرەدا، لـەخوار ئـەو ئاسـتەدا مانـەوە کـە تایبەتمەندییـەکی هـۆزە نیشـــتیمانییەکان بـــوو لەبەرەنگاربوونـــەوەی پـــەلامارو داگیرکـــاریی کۆلۆنیالیستە ئەوروپییەکاندا.

کەواتـە ئـەوەتا سـەرکردەی پـارتی کۆمۆنیسـت لەدەوڵەتێکـدا کـە نـاوی بۆلیڤیـــای هـــەڵگرتووەو پایتەختـــە مێژووییەکەشـــی بـــەناوی دوو ئازادکەرەکەیـــەوە نـــاوی(ســـوکەر)ی هـــەڵگرتووەو هەردوکیشـــیان خـــەڵکی

ڤەنزەوێلان...دەیتوانی لەپێناو ئازادکردنی یەکجارەکی میللەتەکەیدا پشت بەیارمەتی بەهرە سیاسیی وسەربازییەکەی بلیمەتێکی شۆڕشگێڕی راستەقینە ببەستێت، کە بەهیچ کلۆجێك مەسەلەیەکی لەچوارچێوەی سنورە بەرتەسك ودەستکردو تەنانەت ستەمگەرەکەی ئەم دەوڵەتەدا قەتیس نەبوو..بەڵام هیچ شتێکی لەوە بەلاوە باشتر نەبوو کە بچێتە نێو مقۆمقۆی داخوازیگەلێکی شەرمەزارانەو نادروستەوە...بەمەبەستی ئەوەی خۆی سەرکردایەتی جولانەوەکە بگرێتەدەست.

بۆلیڤیا هیچ دەروازەیەکی لەسەر دەریا نییەو...بۆئەوەی ئازادبێت و لەدەست گەمارۆیەکی ترسناکیش رزگاری بێت، پتر لە هەر دەوڵەتێکی تر پێویستیی بەسەرکەوتنی شۆڕش لای هاوسێکانی هەیەو..ئەو دەسەلات و تواناو ئەزمونە بەرفراوانەی کەچێ هەیبوو دروست ئەویان کردبووە ئەو مرۆڤەی کە تەواو سازو ئامادەبوو بۆ خستنەگەڕی جولانەوەی ئازادیخوازی ئەو ولاتە. بەرلەوەش کە کەرتبوون لەنێو پارتی کۆمۆنیستی بۆلیڤیادا رووبدات، چێ پەیوەندیگەلێکی لەتەك هەندێك لەسەرکردەو خەباتگێڕەکانیدا دامەزراندو داوای ئەوەی لێکردن کە یارمەتی جولانەوەی شۆڕشگێڕیی لەئەمەریکای لاتیندا بدەن...هەندێك لەو خەباتگێڕانە بەموڵەتی پارتی ناوبراو و لەئەرکگەلێکی هەمەجۆرو بەدرێژایی چەند ساڵێك کاریان لەتەکدا کرد.

کەرتبوونی نێو پارتەکە هەلومەرجێکی تایبەتی هێنایە ئاراوەو..ئەو خەباتگێڕانەی کە هاوکاری چێیان کرد بوونە دوودەستە. بەڵام وێڕای ئەوە چێ مەسەلەی خەبات لەبۆلیڤیای وەکی رووداوێکی گۆشەگیرو دوورە پەرێز تەماشانەدەکرد بەڵکو وەکی بەشێك لەجولانەوەی ئازادیخوازی شۆڕشگێڕیی سەیری دەکرد..کە دەربارەی پەلکێشان بەرەو دەوڵەتانی تری ئەمەریکای باشور دواناکەوێت. ئەو نیازی وابوو

جولانەوەیەکی داماڵراو لە هەر گیانێکی گۆشەگیریی ڕێکبخات هەموو ئەو کەسانە تەیاریکات کە دەیانەوێت خەبات لەپێناو ئازادکردنی بۆلیڤیاو تێکڕای میللەتانی ژێردەستەی ئیمپریالیزم لەئەمەریکای لاتیندا بکەن. بەڵام لەقۆناغی سەرەتای سازکردنی بنکەی جەنگی پارتیزانییدا، بەشێوەیەکی سەرەکی وابەستەی یارمەتیدانی گروپێك لەو هەوادارە چاونەترس و نهێنگیرانە بوو کە لەکاتی کەرتبوونەکەدا لەنێو پارتەکەی مۆنجەدا مانەوە. لەبەرئەوە وەکی ڕێزێك بۆ ئەو کەسانە سەرەتا بانگهێشتی مۆنجەی کرد کە بێت بۆ سەربازگەکە بۆ لای ئەگەرچی حەزیشی لێنەدەکرد. لەدواییشدا بانگهێشتی موازیس گیڤارای کرد کە سەرکردەیەکی سەندیکالیی کرێکارانی کانەکان و رابەرێکی سیاسییە پەیوەندییەکانی بەپارتی کۆمۆنیستەوە بچڕیوەو دواتر بەشداری لەدامەزراندنی قەوارەیەکی دیکەدا کردووەو پاشان لەم قەوارەیەش دوورکەوتووەتەوە پاش ئەوەی لەگەڵ ئۆسکار زامۆرادا بوویەتی بەناکۆکی..زامۆرا وەکی مۆنجە وا بوو چونکە ئەویش پێشان لەبەردەم چێدا بەڵێنی ئەوەی دابوو کە لەپێناو ڕێکخستنی خەباتی چەکداریی لەبۆلیڤیادا کاربکات بەڵام لەبری ئەوەی بەڵێنەکانی بباتەسەر..سەروەختێك کە زەنگی کارکردن لێیدا..خوێرییانە دەستەوسان راوەستاو ..دواتر، لەپاش گیانلەدەستدانی چێ، بووە یەکێك لەوانەی کە بەناوی مارکسیزمەوە رەخنەی لەچێ دەگرت و قینی بەسەردا دادەباراند.

هەرچی موازیس گیڤارایە بێ هیچ دودڵییەك پەیوەندی بەچێوە کردو ئەو کۆمەکەی خۆی پێشکەش کرد کە بەر لەهاتنی چێ بۆ بۆلیڤیا پێشنیاری کردبوو بۆی و دواتریش لەپێناو مەسەلەی شۆڕشگێڕییدا ئازایانە گیانی خۆی بەختکرد.

گرووپی جەنگاوەرە بۆلیڤییەکانیش کە تا ئەو کاتە لەنێو پارتەکەی مۆنجەدا مانەوە، شوێن پێی مۆزایسیان هەڵگرت..ئەم گرووپە لەلایەن ئانتی وکۆکۆپیریدۆوە ڕێبەرایەتی دەکرا کە دواتر وەکی دوو جەنگاوەری دلاوەرو دەرکەوتوو ناویان دەرکرد..ئەوانە لەپارتی کۆمۆنیست جودابوونەوەو کۆڵنەدەرانە پشتیوانییان لەچێ کرد..بەڵام مۆنجە لەم ئاکامە توڕەو بێزاربوو و هەموو تەقەللایەکی خۆی خستەکار بۆ تێکدانی جوڵانەوەکە لەرێگای دەستگیرکردنی خەباتگێڕە کۆمۆنیستە مەشقپێکراوەکان لەلاپاز کە لەوەدابوون پەیوەندی بەجەنگاوەرەکانەوە بکەن، ئەم ڕووداوە بوونی پیاوگەلێکمان بۆ دەردەخات کە تەواو سازو ئامادەن لەنێو ریزە شۆڕشگێڕییەکاندا بجەنگێن پاشان دەبینین هێندە نابات بەهۆی مانۆرگەلی سەرکردە کەنەفت و جادوگەرەکانەوە..بەشێوازێکی تاوانگەرانە لایانداوە.

چێ هیچ بایەخ و گرنگییەکی کەسیی بەپۆست وسەرکردایەتی و ئاهەنگەکانی ڕێزلێنان نەدەدا بەڵام بەتوندی بڕوای وابوو کە سەرکردایەتی سەربازیی و سیاسیی لەخەباتی شۆڕشگێڕیی چەکداریی(جەنگی پارتیزانیی)دا کە شێوەیەکی بنەڕەتییە بۆ کارکردن لەپێناو ئازادکردنی میللەتانی ئەمەریکای لاتیندا، بەهۆی ئەو هەلومەرجە ئابوری و سیاسیی و کۆمەڵایەتییەی کە لەسەرجەم دەوڵەتانی کیشوەرەکەدا باڵادەست و باوە، دەبێت سەرکردایەتییەکی یەکگرتوبێت. هەروەهاخەبات تەنها لەرێگای جەنگی پارتیزانییەوە دەکرێت و دەشێت سەرکردایەتی بکرێت نەك لەنووسینگەگەلێکی بیرۆکراسیی گەرموگوڕی نێو شارەکانەوە. بەتایبەت سەبارەت بەم خاڵەیان ئامادە نەبوو کەمترین سازش بکات، هەروەها ئامادەش نەبوو سەرکردایەتی گرووپێك لەجەنگاوەرانی شۆڕشگێڕ کە هەر لەگەڵ فراوانبوونی ریزەکانیدا ئامادەیە خەباتێکی سەرتاپاگیر لەئەمەریکای

لاتیندا دەست پێ بکات، بەئەقڵگەلێکی خاڵیی بێئەزمون و خاوەن روانگەیەکی بەرتەسك و شۆڤێنیی بسپێرێت. چێ برِوای وابوو پێویستە ئەم شۆڤێنیزمە کە هەندێکجار لەنێو لایەنە شۆرِشگێرِییەکانی دەوڵەتانی دواکەتووی ئەمەریکای لاتیندا وەکی سۆزێکی کۆنەپەرستانەی پێکەنیناوی و نەزۆك بەربڵاوە، قەڵاچۆبکرێت. لەپەیامەکەشیدا بۆ کۆنگرەی سێ کیشوەرەکە دەڵێت:"پێویستە بەجۆرێك پەرە بەنێونەتەوەییەکی پرۆلیتاریی راستەقینە بدەین..ببێتە ئەو بەیداخەی کە لەسایەیدا لەپێناو مەسەلەی پیرۆزی رزگاربوونی مرۆڤایەتیدا خەبات دەکەین و تیایدا گیانلەدەستدان لەژێر دروشمەکانی ڤێتنام یاخود ڤەنزەوێللا یاخود لاوس یاخود گینیا یاخود بۆلیڤیادا..ئەگەرچی تەنها ناوی شانۆ هەنوکەییەکانی خەباتی چەکداریمان هێناوە، وەکی یەك سەبارەت ئەمەریکی یاخود ئاسیاوی یاخود ئەفریکی و تەنانەت ئەوروپییش ببێتە کارێکی ئابرومەندو ئارەزوکراو. هەر دڵۆپە خوێنێك کە لەسەر خاکی دەوڵەتێکی دیکەو لەژێر ئالآیەکدا دەرێژرێت کە لەسایەیدا لەدایك نەبووە..ئەزمونێکی بەنرخە بۆ ئەو جەنگاوەرەی کە گوزەرانی کردووەو لەباریدایە بەشداری لەئازادکردنی نیشتیمانە راستەقینەکەی خۆیدا بکات و، هەر میللەتێکیش کە ئازاد دەبێت..قۆناغێکە لەشەرِەکە بۆ بەرژەوەندی ئازادکردنی میللەتێکی دی دەستەبەر دەکرێت."

هەروەها چێ برِوای وا بوو گرووپی شۆرِشگێرِان پێویستە جەنگاوەرگەل لەتێکرِای دەوڵەتانی ئەمەریکای لاتین لەخۆبگرێت و، جەنگی پارتیزانییش لەبۆلیڤیا پێویستە قوتابخانەیەك بێت بۆ شۆرِشگێرِان کە تیایدا خۆیان لەسەر شەرِکردن رابهێنن. هەروەها برِوای وا بوو لەم ئەرکەدا، شانبەشانی دەستگیرۆیی بۆلیڤییەکان، گرووپێکی بچوك لەو جەنگاوەرە بەئەزمونانەش یارمەتی بدەن کە تارادەیەك هەموویان لەهاورِێیانی سییرامایسترای بوون

لەسەروەختی خەباتی شۆڕشگێڕیدا لەکوباو، لێهاتوویی و تواناو گیانی قوربانیدانیانی لەبەرچاوبوو. هیچ کام لەو هاوڕێیانە لەبەپیرەوەچوونی بانگەوازەکەیدا دودڵییان نەنواندو، هیچ کامیان دەستبەرداری نەبوون و، هەروەها هیچ کامیشیان خۆیان بەدەستەوە نەدا.

چێ جەنگی بۆلیڤیای هێندە سەرسەخت و لێهاتوو و نموونەییانە سەرکردایەتی کرد کە بووەتە سەرمەشق و وەکی نموونە دەهێنرێتەوەو هێمای بۆ دەکرێت. دەتوانین بڵێین ئەو، بەهۆی دەرککردنی قوڵی بەبایەخی ئەو پەیامەی کە بۆ خودی خۆی هەڵبژارد، لە هەر ساتێك لەساتەکاندا بەگیانێکی ئەوتۆ پەتیی لەبەرپرسیارێتی رەفتاری کرد کە سەرزەنشت ناکرێت. سەروەختێکیش جەنگاوەرە شۆڕشگێڕەکان هەندێك کەمتەرخەمییان کرد دەسبەجێ هۆشیاری کردنەوەو چارەسەری چەوتییەکانی کردن و ئەمەشی لەنێو رۆژانەکانیدا باس کردووە.

لەبۆلیڤیا دژە فاکتەرگەلێکی سەیرو سەرسوڕهێن لەدژی چێ کۆبوونەوەو یەکیانگرت. ئەو جودابوونەوەیەش کە ئەو بڕوای وا بوو لەچەند رۆژێکی کەم تێناپەڕێت، درێژەی کێشا، جودابوونەوەی بەشێك لەجەنگاوەرە لێهاتووەکان کە هەندێکیان نەخۆش بوون یاخود لەژێر تاقیکردنەوەی پەتییکردندا بوون..چەند مانگێکی خایاند کە هەر نەدەبڕایەوەو..چێ لەماوەی ئەوچەند مانگەدا هەموو کۆششی خۆی بۆ سۆراخکردنیان تەرخانکرد..چونکە پەیوەندی نێوان هەردوو گروپەکە لەناوچەیەکی ئێجگار سەختدا بچڕابوو..هەر لەو ماوەیەدا نەخۆشیی رەبۆ پەلاماریدا کە پێشان لەسەر هێورکردنەوەی بەهۆی دەرمانگەلێکی ئێجگار سادەو ساکار راهاتبوو و..کە هەر لەگەڵ نەبوونی هێورکەرەوەدا دەبووە دوژمنێکی سامناك، ئەم نەخۆشییە بێبەزەییانە پەلاماری چێ ی داو، دوای ئەوەی دوژمنیش ئەو دەرمانانەی دۆزییەوە کە وەکی پەدەگ و ئازوخە بۆ جەنگاوەرانی

شاردبووەوە، ئیدی نەخۆشییەکە بووە گرفتێکی مەترسیدار..ئەم ڕووداوەو لەناوچوونی گروپی ئەو جەنگاوەرانەش لەمانگی ئابدا کە پەیوەندی پێیانەوە بچڕابوو، بایەخێکی سەرەکی لەڕێڕەوی ڕووداوەکاندا هەبوو. بەڵام چێ بەویستو ئیرادەیەکی پۆڵایینەوە بەسەر ئازاری جەستەییدا زاڵبوو و، ئەو ڕووداوانە نە لە ورەی کارکردنی ئەویان لاوازکردو نە لەئازایەتیشیان کەم کردەوە.

چێ چەندین پەیوەندی بەجوتیارە بۆلیڤییەکانەوە هەبوو و...سروشتی بەدگومانو ترسئامێزی ئەو جوتیارانە چێی سەرسام نەدەکرد کە تەواو بەئەقڵییەتیان ئاشنابوو چونکە لەچەند بۆنەیەکی تردا تێکەڵاویان بوو بوو و لەتەکیاندا ژیابوو: دەرکی ئەوەی دەکرد کە پێویستە لەپێناو ئەوەدا کە لایەنگیرییان مسۆگەربکات سەرکردایەتی کارێکی درێژخایانو سەختو خۆراگرانە بکاتو هەرگیز لەو بارەیەشەوە دڵی کرمێ نەبوو کە لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا ناتوانێت ئامانجەکانی خۆی وەدیبهێنێت. ئەگەر بەوریاییشەوە لەئاقاری ڕووداوەکان وردبینەوە دەبینین جەنگی پارتیزانیی تاوەکو مانگی ئەیلول، واتە پێش چەند هەفتەیەك لەگیانلەدەستدانی چێو سەروەختێك کە ژمارەی ئەندامەکانی بۆ نزمترین ئاست دابەزی..پارێزگاری لەتواناکانی کارکردنیخۆی کردو هەندێك چوارچێوەی بۆلیڤیی لەنموونەی جوتە برا: ئانتیو کۆکۆ پیریدۆ ناوبانگیان دەرکردو لەبارەی سەرکردایەتییەوە مژدەی تواناگەلێکیان دا. بۆسەی هیگیراس تاکە کردەوەیە کە سوپا دژ بەو گروپە کە چێ ڕێبەرایەتی دەکات ئەنجامیداو تیایدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا کاتێك کە بەرۆژی ڕووناك پێشڕەوی گروپەکە کوژراو ژمارەیەك لەئەندامەکانیشی زامداربوون..سەروەختێك کە گروپەکە لەرێگادابوو بەرەو ناوچەیەك کە جوتیارەکانی خاوەنی هۆشیارییەکی سیاسیی باشترن(ئەم ئامانجە لەنێو ڕۆژانەکاندا باس

نەكراوەو هەندێك لەئەندامانی گروپەكە كە لەو بۆسەیە رزگاریان بووە بۆیان باس كردوین).

ئەم بۆسەیە پێگەی ئەوانی هێندە مۆڵەق كرد كە زاڵبوون بەسەریدا دژواربوو. ئەم رێكردنە رۆژانەیە بەدرێژایی چەند رۆژێكی بەردەوامو لەسەر هەمان رێ، گومانی لای دانیشتوانی ناوچەكە دروست كرد كە ئەوان بۆ یەكەمین جاربوو بەو رێیەدا تێپەڕكەن، لەگەڵ باوەڕی تەواویاندا بەوەی كە دوژمن لەساتێك لەساتەكاندا دێتە سەر رێگایانو رێیان پێدەگرێت..دروست ئەم رێكردنە پڕ بوو لەمەترسیو چیٚش دەركی بەراستی ئەوە كردبوو و بڕیاریدا، بەمەبەستی یارمەتیدانی ئەو پزیشكە كە لەبارێكی جەستەیی ئێجگار خراپدابوو، گروپەكە روبەروی مەترسی بكاتەوە، چیٚ لەسەروەختی بۆسەكەدا نووسیویەو دەڵێت: "گەیشتینە بۆجیۆ..لەوێندەر دوێنێ خەڵكانێك ئێمەیان لەخوارەوە بینیبوو..بەدەربڕینێكی تر رادیۆپامبا(4)جاری گەیشتنی ئێمەیدا..چیدی رێكردن لەگەڵ هێسترەكاندا مەترسیدارەو هەموو تەقەللایەكی منیش بۆ ئەوەیە رێكردنی پزیشكەكە تابكرێت لەباشترین هەلومەرجدابێت چونكە زۆر سستولاواز بووە"..لەرۆژی دواتریشدا نووسیویەو دەڵێت:"پێشڕەوەكە لەكاتژمێر یەك(كاتژمێر سیانزە)داو لەهەوڵێكدا بۆ راگەیشتن بەجاگۆیو تاوەكو لەوێندەر بڕیار دەربارەی هێسترەكانو پزیشكەكە بدات، رێكردنی دەستپێكرد"..كەواتە ئەو بەشوێن چارەسەرێك بۆ نەخۆشەكەدا دەگەڕا تاوەكو بتوانێت ئەم رێگایە جێبهێڵێتو رێوشوێنی پێویست وەبەربگرێت.

بەڵام لە دوای نیوەڕۆی ئەو رۆژەداو پێش ئەوەی پێشڕەوی گروپەكە بگاتە جاگۆی كەوتنە نێو بۆسە كوشندەكەوە، ئیدی تیمەكەی خستە نێو تەڵزگەیەكەوە كە شوێنی دەربازبوونی نەبوو و لەپاش چەند رۆژێكی كەم تیمەكە دوای ئەوەی لەدۆڵی یۆرۆدا گەمارۆدرا، دوایین شەڕی خۆی كرد.

ئەو کارە دلێرانەیە کە ئەم گروپە لەشۆڕشگێڕان کردیان..دروست کارێکی ئێجگار سەرسوڕهێن بوو. بەتەنها خەباتکردن دژ بەو سروشتە دژەی کە دەورەی دابوون..بۆ خۆی لاپەڕەیەکە لەدلاوەریی. ئەم ژمارە کەمە لەمرۆڤگەل ئەرکی جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە گەورەوگرانە لەئەستۆی خۆیان بگرن، کارێکە لەمێژوودا بێ وێنەیە.

باوەڕو قەناعەتی تەواویان بەوەی کە توانای شۆڕشگێڕیی بێشوماری میللەتانی ئەمەریکای لاتین بێدارکرایەوەو..متمانەی بێ چەندوچونیشیان بەخۆیان و بڕیاریان دەربارەی تەرخانکردنی ئەو توانایە بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجە، هەموو ئەمانە ڕەهەندە ڕاستەقینەکانی ئەو پیاوانەمان پێشچاودەخەن.

ڕۆژێك چێ لەبۆلیڤیا ئەمەی بەجەنگاوەران ڕاگەیاند:"ئەم چەشنە لەخەبات دەرفەتی ئەوەمان بۆ دەرەخسێنێت کە ببینە شۆڕشگێڕو بەبەرزترین ئاستی ڕەگەزی مرۆڤایەتی ڕابگەین، بەڵام هەروەها زەمینەی ئەوەشمان بۆ خۆش دەکات کە ببینە پیاوگەل، لەبەرئەوە ئەو کەسانەی کە هەست دەکەن ناتوانن بەم دوو قۆناغە ڕابگەن، بارگەوبنەیان بپێچنەوەو دەستبەرداری جەنگی پارتیزانیی بن".

ئەوانەی کە تا دوایین سات لەتەکیدا خەباتیانکرد سەلماندیان کە شایستەی ئەم تایبەتمەندییە شکۆمەندانەن. ئەوانە هێما بۆ ئەو چەشنە لەشۆڕشگێڕان دەکەن کە ئەمڕۆکە مێژوو داوایان لێدەکات ئەم ئەرکە سەختودژوارە لەئەستۆبگرن: ئەرکی وەرچەرخاندنی شۆڕشگێڕانەی ئەمەریکای لاتین.

ئەو دوژمنەی کە پاڵەوانانی خەباتی سەرەتا لەپێناو سەربەخۆییدا ڕووبەڕوی بوونەوە دەسەڵاتی داروخاوی کۆلۆنیالیزم بوو. هەرچی شۆڕشگێڕانی ڕۆژگاری ئەمڕۆشمانە دوژمنەکەیان لەمەدا بەرجەستەیە: بەهێزترین بنکەی سەربازگەی ئیمپریالیستیی تەیار بەتەکنەلۆجیاو پیشەسازی نوێ. ئەم

دوژمنــە لەولاتێکــدا ســوپایەکی بــۆلیقیی تــازەونوێی دامەزرانــدووەو بەچەك وجبەخانە تەیاری کردووە کە میللەتەکەی هێزە سەربازییە کۆن و تیرۆریستییەکەی تێکشـکاندووە، دواتـر ئـەم دوژمنــە یارمـەتی چـەکی پێشکەش کـردووەو لـەپێناو قەڵاچـۆی جـەنگی پارتیزانییـدا دەسـتگیرۆیی کـردووە..بەهـەمان رێگـاو شـێوازیش یارمــەتی و کۆمــەکی ســەربازیی و تەکنـەلۆجی خـۆی پێشـکەش بـەتێکڕای هێزەکـانی تـیرۆرو داپڵۆسـین لەکیشـوەرەکەدا دەکات. کاتێکیش کە ئەم رێ وشـوێنانە بەس نـابن ئیـدی راسـتەوخۆ بـەهۆی سـوپاو هێزەکـەی خۆیـەوە دەسـت وەردەدات و دێتـە ناوەوە..وەکی ئەو کارەی کە پێشان لەدۆمۆنیکان(5)دا کردی.

سەرکەوتنی خەبات دژ بەم دوژمنە پێویستیی بەو چەشنە لەشۆڕشگێران و پیاوگـەل هەیـە کـە چـێ باسـی کـردون. بـەبێ ئـەم جـۆرە لەشۆڕشگێران و پیاوگـەلی ئامـادە بـۆ ئەنجامـدانی ئـەو کـارەی کـە ئەنجامیانـداو، بـەبێ ئـەم ئازایەتییـە لەبەرەنگاربوونـەوەی لەمپـەرە گەورەکانـداو، بـەبێ ئـەم بڕیـاری مەرگـە کـە هـەموو سـاتێك لەتەکیانـدابوو و، بـەبێ ئـەم باوەڕبوونـە تۆکمەیـە بەدادپـەروەریی مەسـەلەکەیان و بـەبێ ئـەو بـاوەڕە توندوتۆڵـەیان بـەهێزی نەبەزی میللەتان لەبەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی ئیمپریالیزمی یانکیی‌دا کە دەرامەتــــە ســــەربازیی وتەکنەلۆجی وئابورییەکانی ســــەرجەم جیهــــان دەگرێتەوە..بەبێ هەموو ئەمانە هیچ رێیـەکی دی بۆ ئازادبوونی میللەتانی ئەم کیشوەرە لەگۆڕێدا نییە.

خودی میللـەتی ئەمەریکای باکور پەیتاپـەیتا خەریکە دەرکی ئـەوە دەکات ئـەو بونیـادە سیاسییە بـاڵا و زەبەلاحـەی کـە ئـەم دەوڵەتـە بـەرێوە دەبـات، لەمێـژە ئـەو کۆمـارە شـاعیرییەی جـاری جـاران نـەماوە کـە دامەزرێنـەرانی لەوەتــەی نزیکــەی دووسەدســاڵ لەوەوبــەر دروســتیانکرد.. رۆژانــەو بەشــێوازێکی دڵڕەقانــە روبــەروی دڕنــدەیی سیســتەمێکی نائــەقڵانی و

سەرشێتو نامرۆیی و کێوی دەبێتەوە کە رۆژ لەدوای رۆژ ئەمەریکییەکان زیاتروزیاتر گیرۆدەی قوربانیانی جەنگە دوژمنکارییەکانو تاوانە سیاسییەکانو لادانە رەگەزپەرستییەکانو جیاکارییە بەدبەختەکانی لەنێوان بوونەوەرە مرۆڤایەتییەکانو، بەخەساربردنی ئاشکرای دەرامەتە ئابوریو زانستیو مرۆییەکانی‌دەبن، کە خاوەندارییان بۆ ئامێرە سەربازییە کۆنەپەرستو تیرۆریستییەکەی دەگەڕێتەوە، ئەمە لەجیهانێکدا کە سێ لەسەر چواری دانیشتوانەکەی لەبرسێتیو پاشکەوتوییدا دەژین.
تەنها وەرچەرخانی شۆڕشگێڕیی لەئەمەریکای لاتین‌دا دەتوانێت دەرفەتی ئەوە بۆ میللەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان هەمواربکات کە حیساباتە تایبەتەکانی خۆی لەتەك ئیمپریالیزمدا یەکلایی بکاتەوە..هاوکات گەشەکردنی جولانەوەی خەباتی میللەتی ئەمەریکا دژ بەم سیاسەتە ئیمپریالیستییە بۆ ئەوە دەیسازێنێت کە ببێتە هاوپەیمانێکی کاریگەرو یەکلاکەرەوەی جولانەوەی شۆڕشگێڕیی ئەمەریکای‌لاتین.
ئەم بەشە لە نیوە گۆی زەوی پێویستە وەرچەرخانێکی شۆڕشگێڕیی قوڵ بەخۆوە ببینێت: دەنا ئەو جیاوازییە زەبەلاحەو ئەو نابەرابەرییە کە لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا لەنێوان لەلایەك نەتەوەی بەهێز کە بەشێوەیەکی خێرا دەبووە نەتەوەیەکی پیشەسازی لەکاتێکدا کە خودی یاسای میکانیزمە کۆمەڵایەتیو ئابورییەکەی رووەو لوتکە بەرزەکان دەیانبردو، لەلایەکی دی گرویی(بەڵکانیزمەکراو)ی پاشماوەی ئەم کیشوەرە، ئەم جیاوازیو ناهاوسانگییە هێدی هێدی بەشێوەیەکی ترسناك زیاد دەکەن نەك تەنها لەبەر ئەو جیاوازییە گەورەیەی ئەمێستا لەئابوریو زانستەکانو تەکنەلۆجیاکاندا بەڵکو هەروەها بەهۆی ئەو تێکچوونە سامناکەشەوە کە دواتر ئیمپریالیزم لەماوەی بیست ساڵی دواییو بەجۆرێکی خێرا بەسەر میللەتانی ئەمەریکای لاتین‌یدا دەسەپێنێت.

ئێمـه لەوەبـەرگرتنی ئـەم ڕێگایـەدا سـازو ئامـادەین بـۆ ئـەوەی هـەژارتر و، لاوازترو، پتر وابەستەی ئەم ئیمپریالیزمە بین و ژێردەستەی بین. ئـەم ڕوانگـە بەدەبینانەیـــە بـــۆ داهـــاتوو، بارتـــەقای ئـــەوەی بەســـەر میللـــەتانی ئەمـەریکای لاتین دا جێبـەجێ دەبێـت، بەسـەر میللـەتانی ئـەفریکاو ئاسـیاشـدا جێبەجێ دەبێت. ئەگەر نەتـەوە پیشەسازییە وابەستەکانی ئـەوروپاو بـازاڕە هاوبـەش و دامـەزراوە زانسـتییەکانی لەسـەر ئاسـتی کیشـوەری نـاوبراو لەخـەمی ئـەوەدا بـن لەپێشـبڕکێکە دوابکـەون و بەترسـەوە لەئەگـەری وەرچـەرخانیان بـۆ کۆلۆنیـالی ئـابوری بـۆ ئیمپریـالیزمی یـانکی بکۆڵنـەوە، ئـەدی داخـۆ داهـاتوو بـۆ میللـەتانی ئەمـەریکای لاتین چـی لەتـەك خۆیـدا هەڵگرتووە؟

لەبـەردەم تـابلۆی ئـەم هەلومەرجە ڕاستەقینەو ئاشکرایەدا کە بەشێوازێکی بـێ چەندوچـون بەسـەر چارەنووسـی میللەتانماندا زاڵـدەبێت و چـۆکی پـێ دادەدات..ئەگەر هەر لیبرالیستێك یاخود ریفۆرمیستێکی بۆرجوازیی یـاخود شۆڕشـگێڕێکی سـاختەو جادوگـەری کەنـەفت لـەبارەی ئەنجامـدانی هـەر ئەرکێکـەوە، تـوانی چارەسـەرێك بـۆ دواکـەوتنی ئـابوری و زانسـتیی تەکنەلۆجیی کەڵەکەبووی ماوەی سەدەگەلێك بدۆزێتەوە، سـەبارەت جیهـانی پیشەسازی و بەتایبـەت سـەبارەت ویلایەتەیـەکگرتووەکان کـە ئێمـە هەنوکـە وابەستەین و لەداهاتووشدا بەشێوەیەکی تۆکمەتر وابەستەی دەبین و، ئەگـەر ئـەم چارەسـەرە وەرچـەرخانێکی قوڵ و دەستوبردی شۆڕشـگێڕیی نـەبوو کـە هێـزە ئـەخلاقی و مـادی و مرۆییـەکانی ئـەم بەشـە لـەجیهان بـۆ پاڵپێوەنـانی بـەرەو پێشـەوە سـازو تـەیاربکات و، ئەگـەر ئـەو شـێوازە تەلیسـماوییەی پێشنیارکرد و هێمای بۆ ئەو ڕێگا تەلیسماوییە کرد بۆ ڕاگەیشتن بەوەو، ئەگـەر ئـەم ڕێگایـە جیـاوازبوو لـەو ڕێگایـەی کـە چـێ نیگـاری کێشـاو کـە دیکتاتۆرییـەت و سـتەمگەرو سیاسـییەکان، واتـە کرێگرتـە یانکییـەکان و

سەردارانیان لەخاوەن مۆنۆپۆلە یانکییەکان، رادەماڵێت و گسك لێدەدات...با دەسبەجێ و بەگوێرەی ئەو کاتەی کە هەلومەرجەکە دەیخوازێت ئەو کارە بکات و بێت و چێ بەدرۆبخاتەوە.

بەڵام لەراستیدا هیچ کەسێك نە خاوەنی وەڵامێکی ئابڕومەندانەو نە کارێکی لۆژیکییە ئومێدی راستەقینە لەدڵ و دەروونی 300ملیۆن بوونەوەری مرۆییدا، کە دانیشتوانی ئەمەریکای لاتین(6)ن، ببوژێنێتەوە، کە شێوە هەژارییەکی بەدبەختانە زۆرینەی هەرە زۆریان هەژارن. ئەو دانیشتوانەی کە لەماوەی 25ساڵدا دەبنە 600ملیۆن و مافی خۆیانە ژیانێکی خۆشگوزەران و شارستانی بگوزەرێنن. ئایا ئەوە خۆشحاڵیی لەرادەبەدەر نییە کە لەبەردەم دەستپێشخەریی چێ و ئەو کەسانەدا کە لەتەکیدا گیانیان لەدەستدا تاوەکو بەویەڕی ئازایەتییەوە داکۆکی لەبیروباوەڕەکانی بکەن، بێدەنگ بین؟ چونکە ئەو داستانەی کە ئەم گروپە لەمرۆگەل دروستیانکرد و لەدوتوێیدا ئەو نموونە باڵایە سەبارەت رزگارکردنی سەرتاپای کیشوەرێك هەبوو، بەباڵاترین بەڵگە دەمێنێتەوە دەربارەی ئەو کارەی کە ویست و دلاوەریی و مەزنیی مرۆڤایەتی دەتوانێت ئەنجامی بدات. نموونەی ئەو مرۆگەلانە، ویژدانەکان رۆشن دەکەنەوەو رابەرایەتی میللەتانی ئەمەریکای لاتین دەکەن چونکە دواتر هەژاران و چەوساوەکان کە چێ لەپێناویاندا گیان و ژیانی خۆی بەختکرد، بەپیر بانگەوازە دلێرانەکەیەوە دەچن و، چونکە ئەو دەستانەی کە دواتر بۆ چەك هەڵگرتن رادەکێشرێن و ئازادبوونە یەکجارەکییەکەی بەدیدەهێنن..دەستگەلێك دەبن.

***

چێ دوایین دێڕەکانی رۆژانەکانی خۆی لەحەوتی تشرینی یەکەمدا نووسی. بۆ رۆژی دواترو، کاترمێر سیانزەو، لەدۆڵێکی تەنگەبەردا کە تیایدا خۆی و هاوڕێکانی لەچاوەڕوانی داهاتنی شەوداو بۆ شکاندنی تەوقی گەمارۆکە

خۆیان قایم کردبوو. لەلایەن هێزێکی بێشوماری دوژمنەوە پەلاماردران. ئەو ژمارە کەمە لەپیاوان کە ئەو تیمەیان پێکهێنابووو لەپێگەگەلێکی تاکەکەسیی لەنێو روبارەکەو لەبەرزاییەکانی دۆڵەکەدا خۆیان قایم کردبوو، ئازایانە بەرەنگاری تێکڕای ئەو سەربازانە بوونەوە کە دەورەیان دەدان و لەهەموو لایەکەوە پەلاماریان دەدان، دلێرانە شەڕیانکرد تا شەو داهات. لەو گرووپەی کە لەچێوە نزیکبوو هیچ ئەندامێك بەزیندویی دەرباز نەبوو. وەکی پێشانیش باسمانکرد لەبەرئەوەی چێ ئەو پزیشکە کە باری تەندروستیی ئێجگار خەراپ بووو هەروەها جەنگاوەرێکی پیرۆڤی (خەڵکی پیرۆ) کە ئەمیش هەر باری تەندروستیی خراپ بوو هاوڕێی بوون، هەربۆیە هەموو شتەکان هێما بۆ ئەوە دەکەن کە چێ هەرچی لەتوانایدا هەبوو کردی لەپێناوی ئەوەدا کە پارێزگاری لەکشانەوەی هاوڕێکانی بەرەو ناوچەیەکی ئارامتر بکات، هەر ئەمەشە راقەی برینداربوون و پێکرانی خودی چێ خۆشیمان بۆ دەکات. چونکە پزیشکەکە لەم شەڕەدا گیانی لەدەست نەدا بەڵکو لەدوای چەند رۆژێك لەبەرپابوونی ئەو شەڕەو، لەشوێنێکدا کە زۆر لەدۆڵی یۆرۆوە دوور نییە، گیانی لەدەستدا. سروشتی بەردەلانی سەختی ناوچەکەش کارێکی وای کردبوو کە، ئەگەر ئەستەمیش نەبێت، دژواربێت جەنگاوەران بتوانن یەکتری ببینن و لەرێگای بینینەوە پەیوەندی بەیەکدییەوە بگرن، چونکە ئەوانەی کە لەدەروازەکەی تری دۆڵەکەدا داکۆکییان لەپێگەکە دەکرد چەند سەد مەترێك لەچێوە دوور بوون. لەنێوان ئەوانەشدا ئانتی بیریدۆ هەبوو کە تا ئێوارەو داهاتنی شەو بەربەرچی هێرشەکەیان دایەوەو دواتر توانییان لەدوژمن دووربکەونەوەو رووەو ئەو خاڵی بەیەکترگەیشتنە هەنگاو هەڵبگرن کە پێشتر دەستنیشان کرابوو.

ئێمەش توانیمان بەوردی و لەنزیکەوە ئاگاداری ئەوەبین کە چێ سەرباری زامەکانی لەسەر شەڕکردن بەردەوام بوو تا ئەوەبوو لولەی تفەنگەکەی کە

لــەجۆری 2- M بــوو بــەهۆی گوللەیــەکی وێڵــەوە پێکــراو ئیــدی کــەڵکی بــەکارهێنانی نــەما. ئــەو دەمانچــەیەش کــە پێــی بــوو لــەدوای بزربــوونی شانەکەی ئیدی هیچ سودێکی پێ نەگەیاند..ئەم هەلومەرجە سەرسوڕهێنە شــرۆڤەی ئــەوەمان بــۆ دەکــەن کــە چــۆن توانییــان بەزینــدویی دەســتگیری بکەن..ئەو زامانــەی کە لاقەکانی پێکابوو لەبارەی رێکردن بەتــەنیا پــەکیان خستبوو بەڵام زامگەلێکی کوشندە نەبوون.

چــێ پــاش ئــەوەی دەســتگیرکرا بــەرەو گونــدی هــیگێراس گواســترایەوەو لەوێنــدەر مــاوەی 24 کاتــژمێر بەزینــدویی مایــەوەو لــەو ماوەیەشــدا ئامــادە نــەبوو وشــەیەك لەگــەڵ ئــەو کەســانەدا ئاڵوگۆڕبکــات کــە دیلیــان کردبــوو، هەرچی ئەو ئەفسەرە سەرخۆشەیشە کە ویستبووی سوکایەتی پــێ بکات چێ شەپازلەیەکی تێسرەواندبوو.

لەلایان، لەوێنــدەر کە باریانتۆس وئۆفانــدۆ و ســەرکردە ســەربازییەکانی دیکە کۆبوونەوە... هەمووان بەبێ چەندوچون بڕیاری ئەوەیاندا چێ تیرۆر بکەن. ئێمــە زانیاریگــەلێکی وردو تێروتەســەلمان دەربــارەی ئــەو رێوشــوێنانە لەبەردەســتدایە کــە ئــەوان بــۆ جێبــەجێکردنی ئــەم بڕیــارە شــەرمەزارەیان لەقوتابخانەی گونــدی هیگێراس‌دا وەبــەریانگرت..هەریەکە لــەمێجۆر میگیل ئــایۆرواو، کۆلۆنێــل ئانــدریاس ســیلنش کــە دوو ئەفســەرن لەقوتابخانەگــەلی یانکیییەکانــدا مەشــقی ســەربازییان تــەواوکردووە، زانیــاری پێداویســتیان بەردەســتی ئەفســەری پــۆل:مــاریۆ تــیران خســت لــەپێناو جێبــەجێکردنی پرۆسەی تیرۆرکردنەکەدا. کاتێك کە ئەفسەری پۆلی ناوبراو، پاش ئەوەی تەواو خۆی سەرخۆش کرد، هاتە نێو قوتابخانەکەوە، چێ گوێی لەدەنگی ئەو گوللانــە بــوو کــە بــووە هــۆی گیانلەدەستدانی دوو جــەنگاوەر:یــەکێکیان بۆلیڤیی‌وئەوی دیکەشیان پیرۆڤی بوو..کاتێکیش کە جەللادەکە هاتە لای‌و چێ هەستی بەدودڵییــەك کــرد لــەلای، ئازایانــە پێــی گــوت: "تەقــە بکــە!

مەترسە!". ئەفسەرەکەش چاوشۆڕانە بەرەو دواوە گەڕایەوە، ئەمەش وای لەئایۆرواو سیلنشی جوتە سەرۆکی کرد کە جارێکی دی فەرمانی بەسەردا بکەنەوەو ئەویش ئەمجارە هاتەوە ژوریّو فەرمانەکانی بەتەقاندنی چەند گوللەیەك لەشەستیرەکەیو لەسەرەوە بۆ خوارو لەناوقەد بەرەو خوارەوە جێبەجێ کرد.

جەللادو پیاوکوژەکان فەرمانی ئەوەیان پێدرابوو لەکاتی گوللەبارانکردندا گوللەکانیان ئاراستەی دڵ یاخود کەللەی سەر نەکەن بۆ ئەوەی دەسبەجێ گیان لەدەست نەدات بەتایبەت دوای ئەوەی پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاوبووەوە کە چێ لەپاش چەند کاتژمێرێك لەشەڕکردن گیانی لەدەستداوە. بەمجۆرە بەشێوەیەکی دڵڕەقانە درێژە بە سەرەمەرگو گیان سپاردنی چێ درا تا ئەو دەمەی رەقیبێکی سەرخۆش بەهۆی دەمانچەکەی خۆیەوە گوللەیەکی نا بەلای چەپی سنگییەوەو بەو هۆیەشەوە کۆتایی بەژیانی چێ هێنا. ئەم رەفتارە شێوە ناکۆکییەکی درندانە بەو رێژە ناتەباو ناکۆکە کە چێ، بێ هیچ جیاوازییەك، لەژیانی ئەو چەندین ئەفسەرو سەربازانەی سوپای بۆلیڤیای نا کە بەردەستی کەوتنو دیلی کردن.

دوایین ساتەکانی ژیانی چێ لەنێو دەستی دوژمنە ترسنۆکەکانیدا ئێجگار تاڵو سەختو گران بوو بەڵام ئەو پتر لە هەر مرۆڤێکی دی لەجیهاندا ئامادەبوو بۆ خۆراگرتن لەبەردەم ئەم ئەزمونەدا.

***

ئێمە ناتوانین لەئێستادا ئەوە ئاشکرا بکەین کە چۆن چۆنی ئەم رۆژانەیە بەدەستی ئێمە راگەیشتوون، هێندە بەسە کە بڵێین بەبێ بەرامبەر پەیدامان کردووەو...سەرجەم ئەو سەرنجانەی لەخۆگرتووە کە لەنێوان ئەم دوو بەروارەدا نووسراون: حەوتی تشرینی دووەمی ساڵی 1966ی وادەی گەیشتنی چێ بۆ ناتکاهوازو، حەوتی تشرینی یەکەمی ساڵی 1967، واتە

ئـەو رۆژەی کـە لەئێوارەکەیـدا شـەڕی دۆڵـی یـۆرۆ بـەرپابوو. چـەند لاپەڕەیـەکیش هـەن نوقسـانن و هێشـتا بەدەسـتمان رانەگەیشـتوون، بـەڵام لەبەرئەوەی لاپەڕەگەلی رۆژانێکن کە هیچ رووداوێکی گرنگ تیایاندا رووی نـەداوە هەربۆیـە نـاوەرۆکی رۆژانـەکان بـەهیچ کلۆجێـك بـەو هۆیـەوە تێـك نەچووەو نەشێواوە.

رەسـەنیی ئـەم بەڵگەنامەیـە هـەرگیز جێـی گومـان نییـە بـەڵام وێـڕای ئـەوە تێکڕای کۆپییـە لەبـەرگیراوەکان خراونەتـە ژێـر پشـکنینێکی وردەوە ئەمـەش نەك تەنها بـۆ دڵنیـابوون لەرەسـەنایەتی بـەڵکو هـەروەها بـۆ دەرخسـتنی هـەر شێواندنێك، چەندە بچوکیش بێت، کە بکرێت و بشێت تیایدا بکرێت. بـەڵام سـەرباری ئـەوە رووداوەکـان بـەراورد بەرۆژانـەکانی یـەکێك لـەو جەنگاوەرانـە کراوە کە خۆی لـەو بۆسـەیە دەربـاز کـردووەو هـەردوو بەڵگەنامەکـە لەهـەموو روویەکـــەوە چـــوونیەك دەرچـــوون. ئەمـــەو، هـــەروەها ئـــەو گەواهییـــە تێروتەسەلەی کە ئەو جەنگاوەرانەی دی داویانە کـە خۆیـان دەربازکردووەو گـوزەرانی هـەموو رووداوەکانیـان کـردووە، گـەردێك لـەگومانی لەراستیی و دروسـتییان نەهێشـتووە. بـەمجۆرە قەناعـەتی تـەواوی ئـەوەمان لا دروسـت بـووە کـە سـەرلەبەری ئـەم کۆپییـە لەبەرگیراوانـە بەوپـەڕی ئامانەتـەوە رۆژانەکانی چێمان بۆ دەگوازنەوە.

کردنـەوەی کـۆدی ئـەم نووسـینە دژوارو بچـکۆلانەیە..کارێـك بـوو رەنـج و تەقەللایەکی زۆری ویست و بەیاریدەی هاوکاریی شێلگیرانەی ئالیدا مارش دی گیڤـارای ژنـە هـاوڕێی چـێ جێبـەجێ بـوو. دواتـر دەزگاکـانی چـاپ وبڵاوکردنەوەو ئـەم گۆڤارانـە لەیـەك کاتـدا رۆژانـەکان پـەخش و بڵاودەکەنەوە: دەزگای ماسپیرۆ لەفەرەنسا، دەزگای فیلترینیلی لەئیتاڵیا، دەزگای تریکۆنت فیرلاگ لـەکۆماری یـەکگرتووی ئـەڵمانیا، گۆڤاری رامبار لەویلایەتـە یـەکگرتووەکان، دەزگـای رۆیـدۆ ئـابیریکۆ لەفەرەنسـا بـەزمانی

**ئیســـپانی، گۆڤـــاری بۆنتۆڤینـــال لەچـــیللی، دەزگـــای ســـیگلۆ لەمەکسیكو...هەروەها لەچەند دەوڵەتێکی دیکەشدا بڵاودەکرێتەوە.**

**نەسرەوتن تا سەرکەوتن**

**فیدڵ کاسترۆ**

# 7ی تشرینی دووەم1966

ئەمرۆکە قۆناغێکی تازەونوێ دەستپێدەکات. لەشەوداو لەپاش گەشتێك کە خراپ نەبوو و دوو رۆژی خایاند، گەیشتینە کێڵگەکە. لەدوای گەیشتنمان لەرێگای کۆشاپمباوە، گەیشتنی‌من و پاشنگۆ(7) کە لەدوو ئۆتۆمبیلی جیپدا خۆمان شاردبووەوە، دەسبەجێ پەیوەندییەکانمان دەستپێکرد.

کاتێك لەکێڵگەکە نزیکبووینەوە ئۆتۆمبیلێکیانمان راگرت و ئۆتۆمبیلێکیانمان بەکارهێنا بۆ ئەوەی گومان لای خاوەن زەوییەکی هاوسێ دروست نەکەین کە دەستیکردبووە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ئەوەی کە ئێمە کار بۆ بەرژەوەندی، دامەزراوەیەك دەکەین کۆکایین بەرهەم دەهێنێت. سەیر لەوەدایە تۆمینی(8)، کە بەزمان وەسف ناکرێت، بەکیمیاگەری هەموو گروپەکە تەماشادەکرا. لەماوەی گەشتی دووەمیشدا، سەروەختێك کە لەسەر رێکردنمان بەردەوام بووین، بیگۆت(9)، وەختێك کە ناسیمی، هێندەی نەمابوو بکەوێتە نێو چەمەکەوەو ئۆتۆمبیلە جیپەکەی لەهەڵدێردا گرتەوە. بەمجۆرە ماوەی نزیکەی20کیلۆمەترێك لەسەر رێکردنەکەمان بەردەوام بووین‌و لەنیوەشەودا گەیشتینە کێڵگەکە کە لەوێندەر سیان لەکرێکارانی حیزب لەچاوەڕوانی هاتنی ئێمەدا بوون.

بیگۆت وتی هەڵوێستی حیزب هەرچۆنێك بێت من ئامادەم هاوکاریتان بکەم. بەڵام دەستبەرداری لایەنگیریی مۆنجە نابێت چونکە وا دیارە رێزی لێدەنێت‌وخۆشی دەوێت. هەروەها وتی رۆدۆڵفۆوکۆکۆ هەمان ئامادەیی دەردەبڕن بەڵام دەبێت هەوڵبدەین حیزب هانبدەین بەشداری لەشەڕدا بکات. داوام لێکرد هیچ بەحیزب رانەگەیێنێت تا ئەو وەختەی مۆنجە، کە یارمەتیمان دەدات، لەگەشتەکەی بۆ بولگاریا دەگەڕێتەوە. ئیدی ئەویش بە هەردوو خاڵەکە قایل بوو.

## 8ی تشرینی دووەم

ڕۆژمان لەجەنگەڵودارستانەکان لەنزیك ڕووبارێکەوە کە لە سەد مەتر پتر لەکوختەکەوە دوور نییە، بەسەربرد. مێشولەیەکی فرە جارسکەر شوێنمان کەوت ئەگەرچی ناشگەزێت. هەموو ئەو جروجانەوەرانەی کە تائێستاکە لەرێ توشیان بووین لەچەشنە گەورەوبچوکەکانی مێشولەو گەنەی ماڵیاتن. بیگۆت بەیارمەتی ئارگاناراز ئۆتۆمبیلی جیپەکەی دەرکردو لەسەر کڕینی هەندێك پێویستیی وەکی بەرازومریشك رێککەوتین. من نیازم وا بوو ڕووداوەکانی گەشتەکە تەنها بۆ زانیاری تۆماربکەم بەڵام لەچاوەڕوانیی هاتنی گروپەکەی دیکەدا ئەو ئەرکەم بۆ هەفتەی داهاتوو هەڵگرت.

## 9ی تشرینی دووەم

هیچ شتێکی تازە نییە. منوتۆمینی چووین تەماشایەکی ڕێرەوی روباری نانکاهوازومان کرد(لەراستیدا .جۆگەشە نەك رووبار) بەڵام ڕووەو سەرچاوەکەی سەرنەکەوتین. ڕێرەوەکەی سەختو هەردەو ناوچەکەش پێدەچێت ئاوەدان نەبێت. دەتوانین بەکەمێك خۆراهێنانەوە ماوەیەکی درێژخایان لێرەدا بمێنینەوە. دوابەدوای بارینی بارانێکی زۆر ناچاربووین جەنگەڵەکان جێبهێڵین و، بەرەو کوختەکە گەڕاینەوەو لەوێندەر شەش گەنەی ماڵیاتم لەنێو جلوبەرگەکانمدا دەرکرد.

## 10ی تشرینی دووەم

پاشنگۆوپۆمبۆ بەمەبەستی ئاشنابوون بەشوێنەکان، بەیاوەریی سیرافان کە یەکێکە لەهاوڕێ بۆلیڤییەکان، دەرچوون. کەمێك لەئێمە زیاتر ڕۆیشتن و

گەیشتنە خاڵی پەلبوونی رووبارەکە...وا دیارە جۆگەیەکی بچوکە، لەپاش گەڕانەوەیان لەکوختەکەدا مانەوە خەریکی دەمەتەقێ بوون ئیدی شۆفێری گارانازەکە کە هاوڕێ لەتەك پیاوەکان و کەلوپەلە کڕدراوەکانیاندا هاتبوو، بینینی. منیش لەپای ئەو کردارەیان سەرزەنشتم کردن و، بڕیارماندا سبەینێ بەیانی زوو بەرەو دارستانەکان بگوازینەوەو لەوێندەر بەیەکجاری خێوەتێك هەڵدەین. هەرچی تۆمینیشە دەتوانێت هاتوچۆبکات چونکە دەیناسن و وا دەزانن یەکێکە لەبەکاربەرانی کێڵگەکە. بارودۆخ بەخێرایی روو لەخراپی دەکات و پێویستە لەوە دڵنیابم کە وێڕای هەموو شتێك کاروبارەکان دەرفەتی ئەوەمان بۆ دەرەخسێنێت کە بنێرین بەشوێن پیاوەکانماندا. چونکە تەنها لەتەك ئەواندا هەست بەحەوانەوە دەکەم.

## 11ی تشرینی دووەم

ئەمڕۆ بەبێ هیچ شتێکی تازە تێپەڕی، رۆژمان لەخێوەتێکی نوێدا بەسەربرد کە لە بەری ئەوبەری کوختەکە هەڵماندابوو و لەوێندەر شەومان کردەوە.

پەتای نەفرەتیی ناچارمان دەکات خۆمان لەپێخەفی داخراوی بەپەردەکوللە دەورەدراودا قایم بکەین(من تاکە کەسم کە پەردەکوللەم هەیە). تۆمینی چوو سەردانێکی لارگانارازی کردو هەندێك پێویستیی وەکی: مریشك و قەلەمونی لێکڕی. وادیارە ئەو لەهیچ شتێك بەدگومان نییە.

## 12ی تشرینی دووەم

رۆژێکی دی بێ هیچ شتێکی تازەیە. گەشتێکی کورتمان بۆ ئامادەکردنی زەوی بەکەڵك بۆ هەڵدانی خێوەتەکەمان لەسەروەختی گەیشتنی ئەندامانی گروپەکەی دیکەدا، ئەنجامدا. ناوچە هەڵبژێردراوەکە دەکەوێتە دووریی نزیکەی سەد مەترێك لەسەرەتای گۆڕستانەکەو لەسەر گردۆچکەیەك کە هەندێك چاڵی تیادایەو دەتوانرێت بکرێنە ئەشکەوت بۆ شاردنەوەی

خۆراك و شتگەلی دیکە. لەکۆی ئەو سێ گرووپە کە هەریەکەیان لەدوو پیاو پێکدەهات، دەبوو گرووپی یەکەم بەم نزیکانە، واتە لەکۆتایی ئەم هەفتەیەدا کە ئێمەی تیادایین، بگاتە کێڵگەکە. قژی سەرم، ئەگەرچی مووەکانیشی کەمن، گەشە دەکات و دەڕوێتەوە، هەروەها تاڵە سپییەکانیشم بوونەتە زەردو هەڵوەرینیان دەستپێکردووەو ردێنیشم خەریکە دەردێتەوە. نزیکەی دوو مانگێکی دیکە بۆ باری ئاسایی خۆم دەگەڕێمەوە.

## 13ی تشرینی دووەم

رۆژی یەکشەممە. هەندێك لەراوچییان لەنزیك شوێنی نیشتەجێکەمانەوە تێپەڕین. لەکرێکارانی ئارگانارازو پیاوگەلێکی چیایی و لاوگەلێکی رەبەنن بۆ ئەوە دەشێن لەریزەکانی ئێمەدا سازبکرێن، جگە لەوە قینێکی ئێجگار زۆریشیان لەسەردارەکەیانە. زانیاری ئەوەیان پێداین کە لەدووریی نزیکەی هەشت رۆژ رێکردن لێرەوە کوختگەلێك هەن لەسەر رێرەوی رووبارەکە دروستکراون و سەرەولێژییەکانیشی پڕ لەئاوە. لەوە زیاتر هیچی تازە نییە.

## 14ی تشرینی دووەم

هەفتەیەکە لەنێو خێوەتەکەداین. پاشنگۆ کەمێك خەمباریی پێوە دیارە وەك ئەوەی هەست بەتەنهایی بکات. دەبێت جارێکی دی ورە بهێنێتەوە بەبەری خۆیدا. ئەمرۆکە دەستمان بەهەڵکەندنی کونێك کرد هەموو ئەو شتانەی تێدەئاخنین کە سەرنج رادەکێشن و بەگژوگیاو لقوپۆپی داورەدرەخت دایدەپۆشین و هەوڵدەدەین بەپێی توانا لە شێ و تەڕبوونیش بیپارێزین. ئێستاکە لەهەڵکەندنی چاڵێك بووینەوە کە قوڵاییەکەی دەگاتە مەترونیوێك و کونەکەش بەو چاڵە دەستپێدەکات.

## 15ی تشرینی دووەم

لەســەر ئیشــکردن لەهەڵکەنــدنی کونەکــە بــەردەوام بــووین: بــەیانیان پۆمبـۆوپاشـنگۆو، دوای نیـوەروانیش تـۆمینی ومـن کـاری تیـادا دەکـەن. سـەروەختێك لەکاتـژمێر شەشـدا دەسـتمان لەهەڵکەنـدن هـەڵگرت کونەکـە قولاییەکەی گەیشتبووە دوو مەتر. ئومێدمان وایە سبەینێ تـەواوی بکـەین و هـەموو ئـەو شـتانەی تیادا بشـارینەوە کـە رەنگـە گومـان لای دەوروبـەرمان دروست بکـەن. باران لەشـەودا ناچاری کـردم پێخەفـە داخراوەکـەم جێبهێڵم پاش ئەوەی بەهۆی بچوکیی بەرگە پلاستیکەکەوە تـەربوو. لـەوەش بترازێت هیچی تازە نییە.

## 16ی تشرینی دووەم

هەڵکەندنی کونەکە تەواوبوو و شاردرایەوەو ئەمێستا تەنها شاردنەوەی ئەو رێگایـە مـاوە کـە دەمانباتـەوە سـەری. دواتـر هـەموو پێویسـتییەکانمان دەگوێزینـەوە ناوی و دەروازەکەشـی بەهۆی پارچە تەختـەو هـەروەها بـەقوڕ دادەخـەین و سـواغ دەدەیـن. نەخشـەی کونەکـە کـە ژمـارە 1ی بـۆ دانـراوە لەبەڵگەنامــەی ژمــارە 1دا هەیــە. ئەمــە تاکــە شــتی تازەیــە. .لەســبەینێ بەیانییەوە دەتوانین پێشبینی گەیشتنی دەنگوباس لەلاپازەوە بکەین.

## 17ی تشرینی دووەم

کونەکـە پـڕ بـوو لـەو شـتانەی کـە رەنگـە بەرچـاوکەوتن ودەرکەوتنیان بـۆ دانیشـتوانی کوختەکـە بـە زیـان بگەڕێنـەوە، هـەروەها بەشـێك لـەو خۆراکـە پـارێزراوەی نێویشــی تیـادا عـەمبارکرا. بەشـێوەیەکی تارادەیـەك باشـیش شاردرایەوە.

هیچ شتێکی تازەمان لەلاپازەوە بەدەست رانەگەیشت. گەنجانی کوختەکە قسەیان لەتەك ئارگاناراز دا کردو هەموو لەبارەی کڕینی هەندێك پێویستییەوە هاوبەشییان کردو ئارگاناراز جارێکی دی پێداگریی لەسەر بەشداریکردنیان لەدروستکردنی کۆکاییندا کرد.

## 18ی تشرینی دووەم

هیچ هەواڵێك لەلاپازەوە نەگەیشت. پاشنگۆوپۆمبۆجارێکی دی پرۆسەیەکی نوێیان بۆ ئاشنابوون بەرووبارەکە ئەنجامداو لەو بارەیەوە گومانی خۆیان دەربڕی کە شوێنی ئەم خێوەتگەیە نایاب ونموونەیی بێت. رۆژی دووشەممە لەتەك تۆمینی‌دا دەچین بۆ دڵنیابوون لەو مەسەلەیە. ئارگاناراز هات بۆ ئەوەی هەندێك بەرد لەرووبارەکە دەربهێنێت و ڕێگاکە چاکبکاتەوەوماوەیەکی باش مایەوە تاوەکو کارەکەی تەواوکرد. پێناچێت لەبوونی ئێمە لێرە بەدگومان بێت. هەموو شتێك بەجۆرێکی بێ گۆڕان گوزەر دەکات و پەیتاپەیتا شوێن دەمی مێشولەو گەنە بەلەشمانەوە دەردەکەوێت. بەیانیان ئێجگار ساردە.

## 19ی تشرینی دووەم

هیچ دەنگوباسێك لەلاپازەوە نییە. لێرەش هیچ شتێکی تازە نییە. رۆژمان لەنێو کوختەکەدا بەسەربرد و نەهاتینە دەرەوە چونکە ئەمڕۆکە رۆژی شەممەیەو رۆژانی شەممەوانیش راوچییان بەناوچەکەدا دەگەڕێن.

## 20ی تشرینی دووەم

لەنیوەرۆدا مارکۆس ورۆلاندۆ گەیشتن و، بەوهۆیەوە بووینە شەش کەس. دەسبەجێ دەستیانکردە گێڕانەوەی گەشتەکەو..هۆکاری دواکەوتن

لەوادەکەشیان گەڕاندەوە بۆ ئەوەی کە تەنها ماوەی هەفتەیەکە فەرمانی سەفەرکردنیان پێدراوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەوپەڕی خێرایی کە لەتوانادابێت، لەرێگای ساوپاولۆوە سەفەرەکەیان کردووە. نابێت لەماوەی پێش هەفتەی داهاتوودا پێشبینی گەیشتنی چوارەکەی تر بکەین. رۆدۆڵفۆش لەتەکیاندا هات و ناوبراو جێیەکی ئێجگار باشی لەناخمدا گرت و، پێدەچێت لەبیگۆت زیاتر ئامادەی بچڕینی پەیوەندییەکانی خۆی بێت بەهەموو شتێکەوە. هەرچی پابی(10)یشە سەرپێچی ئامۆژگارییەکانمی کرد و، دەربارەی بوونی من هەواڵی بە ئەوو هەروەها زانیاری بەکۆکۆش داوە، ئەمەش وەك دەردەکەوێت کێشمەکێشە لەسەر دەسەلات. هەندێك لەراسپاردەکانم بۆ مانێلا (هەردوو بەڵگەنامەی: 1،2)نووسی و، هەروەها وەڵامی پرسیارەکانی پابیشم دایەوە. رۆدۆڵفۆ بەیانی زوو جێیهێشتین.

## 21ی تشرینی دووەم

ئەمرۆکە یەکەمین رۆژە لەژیانی گروپەکە لەدوای زۆربوونی ژمارەکەی..باران بەلێزمە دەبارێت و جلوبەرگەکانمان تەڕبووەو بۆ بارەگا نوێیەکەمان دەگوازینەوە. ئەمێستا گەیشتووینەتەجێ و نیشتەجێ بووین ودەرکەوت کە خێوەتەکەمان لەراستیدا خێمەی ئۆتۆمبیلی بارەو ئاو زۆر هەڵدەمژێت بەڵام ویڕای ئەوە تارادەیەك لەباران پاراستینی.

ئەمێستاشوێنیخەوتن(پێخەفی سەفەری)یەك و بەرگێکی نایلۆنمان هەیەو، هەندێك چەکی تازەشمان بۆ هاتووە. مارکۆس"گاران"(11)ی پێیەو، دواتر لەجبەخانەکە(م2)دەدەین بەرۆلاندۆ. جۆرج لەتەکماندا مایەوە بەڵام لەکوختەکەدا مایەوە بۆ ئەوەی سەرپەرشتی چاککردنی کێڵگەکە بکات. داوام لەرۆدۆڵفۆ کرد شارەزایەکی کشتوکاڵییم بۆ پەیدابکات کە جێی

متمانەبێت. هەوڵدەدەین ئەم رەوشە تائەوپەڕی ماوە کە لەتوانادابێت درێژە پێبدەین.

## 22ی تشرینی دووەم

من وتۆما وجۆرج چووین لەرێگای رووباری نانکاهوازووەوە خاك وزەوی ناوچەکەمان پشکنی بۆ ئەوەی لقی تازەی ئەو رووبارە بپشکنین کە دۆزیبوومانەوە، بەڵام لەبەر ئەو بارانە زۆرەی کە دوێنێ باری رووبارەکەمان بۆ نەدۆزرایەوەو تەنها لەدوای ئەرك وماندوبوونێکی زۆر ئەوجا بەشوێنی مەبەست راگەیشتین. لقە تازەکە جۆگەیەکی بچوك و خاوەن رێرەوێکی بەرتەسکە ئەگەر بەباشی سازبکرێت بۆ ئەوە دەشێت کە خێوەتێکی هەمیشەیی لەتەنیشتەوە هەڵبدرێت. کەمێك لەدوای کاتژمێر نۆ گەڕاینەوەو هیچ شتێکی تازەمان نەبینی کە شایانی باس بێت.

## 23ی تشرینی دووەم

روانگە(مرصد)یەکمان دروستکرد بەسەر کێڵگەکەدا دەڕوانێت و زەمینەی ئەوەمان بۆ دەرەخسێنێت چاودێری هەر میوان یاخود پشکنەرێکی نەویستراو بکەین. لەبەرئەوەی دوو کەسمان گەڕانی پشکنین ئەنجام دەدەن، هەربۆیە پاشماوەکەی تر کاری پاسەوانیی لەئەستۆ دەگرن و نۆبەی هەریەکەشیان ماوەی سێ کاتژمێر دەخایەنێت. پۆمبۆومارتۆس گەڕانێکیان بەمەبەستی پشکنین بەو ناوچەیەی دەوروبەری خێوەتەکەمان بەدرێژایی ئەو رووبارەی کە هێشتا بەهۆی ئاوی بارانەکەوە لافاو دەکات، ئەنجامدا.

## 24ی تشرینی دووەم

پاچۆورۆلاندۆ بەمەبەستی کۆڵینەوە لەناوچەی رووبارەکە دەرچوون و تاوەکو سبەینێ ناگەڕێنەوە.

لەکۆتایی‌دانیشتنەکەدا دووان لەپیاوەکانی ئارگاناراز بەسەردانێکی‌کتوپڕ هاتن و ئەوەی کە هاوردنیشی‌هەنگاوەکانیان بوو(لەکاتێکدا کە پیاسەیان دەکرد). هیچ شتێکی‌سەیرونامۆ لەگۆڕێدا نەبووچونکە ئانتۆنیۆوتۆما لەوێ نەبوون: ئانتۆنیۆ لەپرۆسەی گەڕان بوو بەمەبەستی پشکنین وتۆماش لەکوختەکەبوو. ئەو بەهانەیەی کە بۆ لەوێ نەبوونی‌ئەوان هێنامانەوە ئەوەبوو کە پێکەوە چوون بۆ شکار- جەژنی لەدایکبوونی‌یۆشا.

## 25ی تشرینی دووەم

روانگەی چاودێرییەکە هەواڵی‌ئەوەی پێڕاگەیاندین کە ئۆتۆمبیلێکی جیپ هات و دوو یاخود سێ کەسی تیادایە. دەرکەوت کە ئۆتۆمبیلەکە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی قەڵاچۆکردنی مەلاریایەو پاش ئەوەی نموونەیەك لەخوێنەکانمانیان وەرگرت بەخۆی‌وسەرنشینەکانییەوە رۆیشت و ناوچەکەی بەجێهێشت. پاچۆورۆلاندۆ لەکاتێکی درەنگی شەودا هاتنەوەو ئەو لقی رووبارەیان دۆزیبوویەوە کە لەنەخشەکەدا هێمای بۆ کراوە، لەدواییدا پشکنیویانەو بە رێرەوی سەرەکی رووبارەکەدا سەرکەوتوونەتە سەرەوەو لەوێندەر کێڵگەگەلێکی چۆڵیان دۆزیوەتەوە.

## 26ی تشرینی دووەم

لەخێوەتگەکە نەهاتینەدەرەوە چونکە ئەمرۆکە رۆژی شەممەیە. داوام لەجۆرج کرد بچێت رێرەوی رووبارەکەو ئەو ماوەیە بپشکنێت کە بەسواری ئەسپ دەیگاتێ. ئەسپەکە لەوێندەر نەبوو ئیدی بەپێ ماوەی20تا25 کیلۆمەتری بڕی تاوەکو داوای ئەسپێك لەدۆن ریمبرتۆ بکات. ئێوارە داهات و هێشتا ئەو نەگەڕاوەتەوە. هیچ دەنگوباسێك لەلاپازەوە نییە.

# 27ی تشرینی دووەم

جۆرج تائێستا نەگەڕاوەتەوە. فەرمانم دەرکرد بەدرێژایی شەو پاسەوانیی هەبێت بەڵام لەکاتژمێر نۆدا یەکەم ئۆتۆمبیلی جیپ گەیشت، جواکین وئۆربانۆ لەتەك کۆکۆدا هاتن بۆئەوەی پەیوەندیمان پێوەبکەن و گەنجێکی بۆلیڤییشیان لەتەکدایە ناوی ئارنیستۆیەوخوێندکاری پزیشکییە. کۆکۆ جارێکی دی رۆیشت و ریکاردۆ وبرۆلیۆ و میگیل و بۆلیڤییەکی دیکەی لەتەك خۆیدا هاورد ناوی ئانتییەو وتی بۆ ئەوە هاتووە کە لەتەکماندا بمێنێتەوە. ئەمێستا ژمارەمان بووە 12شۆڕشگێڕ، بێجگە لەجۆرج کە رۆڵی خاوەن کێڵگەکە دەبینێت. کۆکۆورۆدۆڵفۆ راسپێردران پەیوەندییەکان ئەنجام بدەن. ریکاردۆ هەواڵی ناخۆشی ئەوەی بۆ هاوردین کە چینۆ لەبۆلیڤیایەو دەیەوێت چاوی بە من بکەوێت و بیست پیاو بۆ شەڕکردن شانبەشانی ئێمە بنێرێتە لامان. ئەم کارە هەندێك وریایی دەوێت چونکە پێش ئەوەی پرس وراوێژ بەئایستانیسلاو(12) بکرێت شەڕەکە دەکاتە شەڕێك لەسەر ئاستێکی نێودەوڵەتیی.

دواجار لەسەر ئەوە رێککەوتین وادەیەکی لەسانتاکروز بۆ دابنێین و لەوێندەر کۆکۆ لەتەك خۆیدا دەیهێنێت بۆ خێوەتگەکە. کۆکۆ بەیانی زوو لەتەك ریکاردۆدا بەرێکەوت کە تاوەکو لاپاز بەئۆتۆمبیلە جیپەکەی تر دەڕوات. کۆکۆ راسپێردرا سەردانی ریمبرتۆ بکات بۆئەوەی بزانێت جۆرج چی بەسەر هات. ئانتی لەمیانی قسەگەلێکی تردا وتی کە ئەو بڕوای وایە ئایستانیسلاو پەیوەندی بەشۆڕشەوە ناکات و..وادیارە سورە لەسەر ئەوەی کە پەیوەندی خۆی پێوە بپچڕێنێت.

## 28ی تشرینی دووەم

جۆرج تا ئەم بەیانییە دیار نییەو هەروەها کۆکۆش نەگەڕاوەتەوە. لەدواییدا هەردوکیان هاتنەوەو هەموو ئەو شتەی کە روویدا ئەوە بوو کە لای ریمبرتۆ مابوونەوە ئەمەش جۆرێك لەلاوازییلەهەستکردنیاندا بەبەرپرسیارێتی دەردەخات، دوای نیوەرۆکەی بانگهێشتی گروپی بۆلیڤییەکانم کردو ئەو داوابەم پێشچاوخستن کە سەبارەت پەیوەندیکردنی20پیاو لەپیرۆ بەئێمەوە بەردەستم خراوە، ئەوانیش هەموویان بەداواکە قایلبون بەڵام بەمەرجی ئەوەی لەپاش دەستپێکردنی پرۆسەکان جێبەجێبکرێت.

## 29ی تشرینی دووەم

بەمەبەستی روپێوی تۆبۆگرافیی رووبارەکەو پشکنینی لقەکەی کە لەتەنیشتییەوە خێوەتگەکەی داهاتوومان هەڵدەدەین، دەرچووین. گروپەکە لەتۆمینیوئۆربانۆوئانتیومن پێکهاتبوو. رووبارەکە لەیەك کاتدا ئێجگار بێوەیوسامناكودڕدۆنگیشە. هەوڵدەدەین رووبارێکی دی لەماوەی کاتژمێرێك رێکردن لێرەوە بدۆزینەوە. تۆمینی لەکاتی رێکردندا کەوت بەئەرزاو قولەپێیدرزی تێبوو. دوای ئەوەی پرۆسەی پێوانی رووبارەکەمان جێبەجێکرد ئێوارە گەیشتینە خێوەتگەکە. لێرە هیچ شتێکی تازە نییە. کۆکۆ بەمەبەستی چاولەڕێکردنی چینۆ چوو بۆ سانتاکروز.

## 30ی تشرینی دووەم

مارکۆسوپاچۆمیگیلوپۆمبۆ بەئەرکی دۆزینەوەی رووبارێکی دوورتر، دەرچوون. بەو مەرجەی کە دوای دوو رۆژی دی بگەڕێنەوە. باران بەلێزمە باریو، لەکوختەکەش هیچی تازە لەئارادا نییە.

# لێکدانەوەی مانگانە

هەموو شتێك بەباشی ڕێدەکات: چونکە من و هەروەها نیوەی ئەو پیاوانەش کە لەتەکمدان بەبێ هیچ ڕووداوێك گەیشتین ئەگەرچی ئەوان کەمێکیش دواکەوتن. هەلومەرج و بارودۆخەکان هەرچۆنێك بێت، یارمەتیدەرە سەرەکییەکانی ریکاردۆ بەشداری لەجەنگی پارتیزانییدا دەکەن. پێدەچێت شتەکانیش لەم ناوچە دابڕاوەدا لەباشترین باردا بن کە بەڵگەکان هێما بۆ ئەوە دەکەن کە ئێمە دەتوانین لێرەدا هەموو ئەو ماوەیە، ئیدی چەندە زۆریش بخایەنێت، بمێنینەوە کە بەپێویستی دەزانین. هەرچی نەخشەکانیشمانە بەمجۆرەیە: چاوەڕوانیکردنی پاشماوەی پیاوەکانی دی، زیادکردنی ژمارەی بۆلیڤییەکان لایەنی کەم بۆ بیست پیاوو دەستپێکردن بەپرۆسەکان.

لەدواییدا دەبینین کاردانەوەی مۆنجە چی دەبێت و پیاوەکانی گیڤاراش هەڵوێستیان چۆن دەبێت.

## 1ی کانونی یەکەم 1966

ڕۆژ بەبێ هیچ شتێکی تازە تێپەڕیو، لەئێوارەدا مارکۆس و هاوڕێکانی، دوای ئەوەی بەدەم گەڕان بەگردەکانی ناوچەکەدا ماوەیەکی زۆر لەوە درێژتریان بڕی کە بۆیان دیاریکراوە، گەیشتن. لەکاتژمێر دووی بەیانیدا هەواڵی گەیشتنی کۆکۆ لەتەک یەکێك لەهاوڕێکاندام پێراگەیەنرا بەڵام داوام کرد چاوپێکەوتنیان لەتەك مندا تا سبەی بەیانی دوابخەن.

## 2ی کانونی یەکەم

چینۆ بەیانی زوو گەیشت...هەست وسۆزێکی پڕجۆش وخرۆش دەردەبڕێت. ڕۆژمان لەمشتومڕو قسەکردندا بەسەربرد. خاڵی سەرەکی ئەوەیە کە ئەو دەچێت بۆ کوبا بۆ ئەوەی بەدەستی خۆی ڕاپۆرتی دەربارەی ڕەوشەکە پێشچاوبخات. دەتوانین لە دوو مانگی داهاتوودا، واتە هەر لەگەڵ دەستپێکردنی پرۆسەکاندا، پێنج پیرۆڤیی لەگروپەکەماندا لەخۆبگرین، سەبارەت ئێستایش دووانیان پەیوەندی دەکەن: یەکێکیان شارەزایە لەرادیۆداو دووەمیشیان پزیشکەو ماوەیەك لامان دەمێننەوە. چینۆ داوای چەکی کرد منیش قایلبوم BZ یێكو هەندێك تفەنگی مۆزەری پێبدەم و هەروەها هەندێك M-1 یان بۆ بکرم. هەروەها بڕیارمدا بەهۆی ڕەوانەکردنی پێنج پیرۆڤییەوە بۆ ئەوەی پەیوەندیگەلی پێویست بۆ کارئاسانیکردن بۆ پەڕینەوەی چەك لە تیتیکاکاوە بەرەو ناوچەیەکی نزیك بەبیۆنۆ ئەنجام بدەن، پاڵپشتیی بکەم. هەروەها باسی ڕەنجەکانی خۆی لەپیرۆ بۆ کردم و دەربارەی پلانێکی بوێرانە بۆ ئازادکردنی کالیکستۆ قسەی کرد کە بەلای منەوە وەك جۆرێك لەخەیاڵ وابوو. ئەو بڕوای وایە هەندێك لەو کەسانەی کە

لەجەنگی پارتیزانیی رزگاریان بوو لەو ناوچەیەدا کاردەکەن، ئەگەرچی ئەو لەبوونیان تەواو دڵنیا نییە چونکە نەیانتوانی بەم شوێنە رابگەن.
پاشماوەی کاتەکەمان لەگێڕانەوەی نوکتەو بەسەرهاتی خۆشدا بەسەر برد..لەدواییدا بەهەمان پەرۆشیی یەکەمجارو بەمەبەستی چوون بۆ لاپاز ماڵئاوایی لێکردمو لەتەك خۆشیدا چەند وێنەیەکی ئێمەی برد. کۆکۆ فەرمانی ئەوەی پێدرا کە پەیوەندییەکان لەتەك سانشێ(کە دواتر چاوم پێی دەکەوێت)و، هەروەها پەیوەندی لەتەك سەرۆکی پرسگە لەسەرۆکایەتی رێکبخات کە پێشنیاری ئەوەی کردبوو بەزانیاری تەیارمان بکات چونکە ناسیاری ئانتییە. تۆڕی پەیوەندی هێشتا لەقۆناغەکانی سەرەتایدایە.

## 3ی کانونی یەکەم

هیچ شتێکی تازە نییە. ئەمرۆکە گەڕانی پشکنینمان نییە چونکە رۆژی شەممەیە. کرێکارانی کێڵگەکە هەرسێکیان چوون هەندێك ئەرکگەل لە لاگۆنیلاس جیبەجێ بکەن.

## 4ی کانونی یەکەم

هیچ شتێکی تازە نییە. هەمووان چوونەتە ئارامیوبێدەنگییەوە چونکە لەرۆژی یەکشەممەداین. لێدوانێکم دەربارەی هەڵوێستمان بەرامبەر ئەو بۆلیڤییانە کە پەیوەندیمان پێوە دەکەنو هەروەها سەبارەت هەڵوێستمان بەرامبەر شەڕ پێشکەش کرد.

## 5ی کانونی یەکەم

هیچ شتێکی تازە نییە. نیازی دەرچوونمان هەبوو بەڵام باران بەدرێژایی رۆژ خۆشی نەکردەوە. بەهۆی چەند گوللەیەکەوە کە لۆرۆ بەبێ

ئاگـاداركردنی پێشـوەختە تەقانـدی، كـەمێك ترس وسـام بـاڵی بەسـەردا كێشاین.

## 6ی كانونی یەكەم

بەمەبەسـتی كـاركردن لەئەشـكەوتی دووەمـدا لـەنزیك جۆگـەی یەكەمـەوە، دەرچـووین و، هەریەكـە لـەئابۆلینـار(13)و ئـانتی وئۆربـانۆومیگیـل و مـن بەشـداریمان لەهەڵكەندنـدا كـرد. میگیـل هـات بـۆ ئـەوەی شـوێنی تۆمـا بگرێتـەوە كە لـەژێر چارەسـەردایە بۆ چاكبوونەوە لەكەوتنەكەی. ئابۆلینـار نیـازی خـۆی بـۆ پەیوەنـدیكردن بەشۆڕشـگێڕانەوە دەربـڕی بـەڵام دەیـەوێت لەپێشـدا ئیشـوكارە كەسـییەكانی خـۆی لـەلاپـاز یـەكلایی بكاتـەوە. ڕێگـای سەفەركردنی پێدرا بەڵام با ماوەیەك چاوەڕوان بێت. نزیكەی كاتژمێر یـانزە گەیشـتینە جۆگەكـەو ڕەوتێكـی شـاراوەمان لێـداو شـوێنەكانی دەوروبەریشمان بەمەبەستی دۆزینـەوەی جێیەكی گونجاو بۆ ئەشكەوتەكە پشكنی بەڵام سەركەوتوو نەبووین چونكە ناوچەكە هەردەو جۆگەكەش. كە لەهەندێك شوێنەوە وشكبووە، بەنێو دوو ڕیزە بەرددا درێژە بەڕێڕەوی خۆی دەدات. پرۆسەی پشكنینەكەمان بۆ سبەینێ دواخستو ئانتی وئۆربانۆش بـۆ ڕاو دەرچـوون چـونكە ئـەو بـڕە خۆراكـەی كـە هەمانـە كـەمی كردووەو..دەبێت بەشی تا ڕۆژی هەینیمان بكات.

## 7ی کانوونی یەکەم

میگیل وئابۆلینار شوێنێکی گونجاویان دۆزییەوەو دەستیان بەهەڵکەندنی کونەکە کرد، ئەو ئامرازانەی کە ئێشیان پێدەکەین تەواو بێکەڵکن. ئانتی وئۆربانۆ بەدەستی خاڵیی گەڕانەوە بەڵام ئۆربانۆ لەئێوارەدا تاوسێکی کێوی راوکرد. لەبەرئەوەی خواردنی ئێوارە ئامادەبوو هەربۆیە تاوسەکەیان بۆ رۆژی دواتر هەڵگرت.

مانگێك بەسەر بوونمان لێرەدا تێپەڕی بەڵام نووسینی لێکدانەوەکە بۆ کۆتایی مانگ دوادەخەم چونکە ئەوە سادەترو ئاسانترە.

## 8ی کانوونی یەکەم

لەتەك ئانتی دا چووین بۆ ئەو گردە کە بەسەر جۆگەکەدا دەڕوانێت و، میگیل وئۆربانۆش لەسەر سازکردنی چاڵەکە بەردەوام بوون. لە دوای نیوەرۆشدا ئابۆلینار شوێنی میگیلی گرتەوە. .سەروەختێکیش شەو داهات مارتۆس وپۆمبۆ وپاچۆ هاتنەوەو، پاچۆ پێیەکانی بەدوای خۆیدا کێش دەکرد، پێدەچێت فرە شەکەت بێت. مارکۆس داوای لێکردم لەبارێکدا ئەگەر تەندروستیی باش نەبوو لەگرووپی پێشڕەو بیگوێزمەوە. نیگاری رێگای بەرەو ئەو ئەشکەوتەم بۆ کێشان کە لەنەخشەی ژمارە 2دا هەیەو، ئەو کارە گرنگانەشم بۆ دەستنیشانکردن کە پێویستە لەکاتی بوونیان لێرە جێبەجێی بکەن. میگیل لەتەکیاندا دەمێنێتەوەو ئێمەش سبەی دێینەوە.

## 9ی کانوونی یەکەم

لەبەیانیدا بەشێنەیی هاتینەوەو دەورووبەری نیوەرۆ گەیشتین. پاچۆ فەرمانی مانەوەی پێدرا بۆ چاوەڕوانیکردنی گەڕانەوەی گرووپەکە. ویستمان بەخێوەتگەی 2 رابگەین بەڵام نەمانتوانی. هیچ شتێکی تازە رووی نەدا.

## 10ی کانونی یەکەم

رۆژ بەبێ هیچ شتێکی تازە تێپەڕی، تەنها ئەوە نەبێت کە بۆ یەکەمین جار لەکوختەکەدا نان دروستکرا. لەتەك جۆرج وئانتیدا دەربارەی هەندێك ئەرکی بەپەلەودەستوبرد قسەم کرد. هیچ هەواڵێك لەلاپازەوە نییە.

## 11ی کانونی یەکەم

رۆژ بەبێ هیچ رووداوێکی تازە تێپەڕی بەڵام وەختێك ئێوارە داهات کۆکۆ لەتەك پابیدا هاتەوەو، ئالیخاندرۆوئارتۆرۆوهەروەها بۆلیڤییەکیشیان لەتەك خۆیاندا هێنا کە ناوی کارلۆسە. وەکی هەمووجارەکانی دی ئۆتۆمبیلی جیپەکە لەسەر رێگاکە بەجێهێڵرا. ئینجا لەدواییدا مۆرۆی پزیشك(14)و بینینۆودوو بۆلیڤیی خەڵکی ناوچەی خۆرهەڵاتی بۆلیڤیا(کامباس)یان لەتەك خۆیاندا هاورد کە لەکێڵگەی کارانافی کاردەکەن. دانیشتنی ئێوارە وەکی هەموو جارەکانی دیو بەدەم قسەکردن دەربارەی سەفەرەکەو لێدوان سەبارەت دیارنەبوونی ئانتۆنیۆ(15)وفیلیکس(16) کە دەبوو بگەنە لامان، کۆتایی هات. گفتوگۆ لەتەك بابیدا کراو بڕیاردرا کە ئەویش دوو سەفەر بکات بۆ هاوردنی رێنان(17)و تانیا. لەسەر لەناوبردنی خانووەکانو کۆگاکانو پێشکەشکردنی یارمەتییەکی دارایی بەبڕی 1000دۆلار بەسانشی رێککەوتین، هەروەها ناوبراو ئۆتۆمبیلە بارهەڵگرە بچوکەکە لای خۆی گلدەداتەوەو ئێمەش ئۆتۆمبیلێك لە دوو ئۆتۆمبیلە جیپەکە بەتانیا دەفرۆشینو ئەوەکەی تریشیان لای خۆمان دەهێڵینەوە. ماوەتەوە ئەوەی سەفەرێك بۆ هاوردنی چەك بکەینو، فەرمانیشم دەرکردووە کە هەموو شتێکی نێو ئۆتۆمبیلی جیپەکە دەربهێنرێت نەبادا گواستنەوەی چەکەکان

زۆر بخایەنێت و ببێتە هۆی ئاشکرابوونی. چینۆ چوو بۆ کوبا و بەرووالەت پەرۆشییەکی زۆری بۆ ئەم کارە پێوە دیارەو نیازی وایە هەر کە گەڕایەوە سەردانێکی دیکەمان بکات. کۆکۆ لێرە مایەوە بۆ ئەوەی لەکامیری سۆراخی خواردن وخۆراك بکات. پابی‌ش چوو بۆ لاپاز.

رووداوێکی‌خەتەرناك روویدا: راوچی ڤالیێ گراندی چەند شوێن پێیەکی ئاشکراکردووە، هەروەها دەستکێشێکیشی دۆزیوەتەوە کە پێشان پۆمبۆ لێی کەوتبوو و پێدەچێت ناوبراو ئەندامێك لەئەندامانی گروپەکەمانی بەدی کردبێت. ئەم رووداوە داوای گۆڕینی پلانەکانمان و ئەوپەڕی وریایی و ئاگاداربوونمان لێدەکات. سبەی راوچییەکە لەتەك ئانتۆنیۆدا دەڕوات بۆ ئەوەی ئەو شوێنانەی پیشان بدات کە تیایاندا تەپکەکانی‌خۆی بۆ شکاری تاپیر ناوەتەوە.

ئانتی باسی رەخنەو باری سەرنجەکانی خۆی بۆ کردم سەبارەت کارلۆس کە لەوەتەی هاتووە باس لەبەشداریی کوبایی دەکات و..پێشتریش وتبوی پەیوەندی بەشۆڕشەوە ناکات ئەگەر حیزب بەشداری لەهەڵگیرساندنیدا نەکات. پێدەچێت رۆدۆڵفۆ توندیی لەتەکدا نواندبێت و هاتنیشی زادەی بەدحاڵیبوونە.

## 12ی کانونی یەکەم

قسەم لەتەك سەرجەم ئەندامانی گروپەکەدا کرد و وانەیەکم دەربارەی هەقیقەت وراستییەکانی شۆڕش گوتەوە و..جەختم لەسەر پێداویستیی یەکبوونی سەرکردایەتی و پابەندبوون بەدیسپلین کرد بۆیان و بۆلیڤییەکانیشم لەو بەرپرسیارێتییە ورپاکردەوە کە بەهۆی پێشێلکردنی ئامۆژگاریی پارتەکەیان و وەبەرگرتنی ئاراستەیەکی دیکەوە دەکەوێتە ئەستۆیان. هەندێك دامەزراندنم ئەنجامدا: جواکین(18)سەرکردەی دووەمی

سەربازیی، رۆلاندۆوئانتی مفەوەز، ئالیخاندرۆ سەرۆکی پرۆسەکان، پۆمبۆ بۆ کاری باجگیریی، ئانتی بۆ کاری دارایی، ناتۆ بۆ کۆمەك و پرچەك کردن، مۆرۆ بۆ خزمەتگوزاریی پزیشکیی بەشێوەیەکی کاتیی. رۆلاندۆو برۆلیۆ بەمەبەستی هۆشدارکردنی گروپەکە کە بێدەنگ‌وئارام بن تاوەکو راوچی ڤالیێ گراندی لە نانەوەی تەپکەکانی لێدەبێتەوەو لەگەشتی پشکنینەکەی لەتەك ئانتۆنیۆدا دەگەڕێتەوە، دەرچوون. ئێوارە پاش ئەوەی تەپکەیان لەشوێنێکدا نایەوە کە دوور نییە، پێکەوە گەڕانەوە. راوچییەکە مەست بوو و، ئێمەش هەمان ئێوارەو بەهۆی ئەوەی کە گەدەی ناوبراو بە قاپێك لەخواردنەوەی سنگانی لێوانلێوبوو، گەڕاینەوە. کۆکۆ لەکاراناڤی کە لەوێندەر ئازوخەی پێویستی کڕی، گەڕایەوە، لەڕێگا هەندێك لەدانیشتوانی(لاگۆنیلاس) بینییان کە بەهۆی زۆریی بڕوئەندازەی شتگەلی کڕدراوەوە سەرسام بوون.

لەدواییدا مارکۆس لەتەك پۆمبۆدا گەیشت. بەهۆی زامداربوونی برۆیەوە کە لەکاتی داربڕیندا دوچاری بووە هەست بەئازار دەکات...دواتر شوێنی زامەکەیم بۆ دوورییەوە.

## 13ی کانونی یەکەم

جواکین وکارلۆس وپزیشکەکە بەمەبەستی گەیشتنەوە بە رۆلاندۆو برۆلیۆ، دەرچوون. پۆمبۆش لەتەکیاندا دەرچوو و فەرمانی ئەوەی پێیە کە هەمان رۆژ بگەڕێتەوە. کاری داپۆشینی رێرەوەکەم کرد و دەستم بەلێدانی رێرەوێکی دیکە کرد کە لەهەمان شوێنەوە دەست پێ‌دەکات و لای کەناری رێرەوەکە کۆتایی دێت. سەرکەوتنەکە هێندە گەورەبوو وای لەمیگیل و پاچۆ کرد لەکاتی گەڕانەوەیاندا بەرەو خێوەتگەکە رێگایان لێ تێکبچێت.

قسه لەتەك ئابۆلیناردا كرا كه بەمەبەستی بەسەربردنی چەند رۆژێك پشوو بەرەو كوختەكەی خۆی لەفیاشا بەرێ دەكەوێت و هەندێك پارەشی پێدرا بۆ ئەوەی بیدات بەخێزانەكەی و داوای ئەوەی لێكرا كه هیچ نەدركێنێت و قسه نەكات. كۆكۆ ئەم ئێوارەیه ماڵئاوایی لێكردین بەلاّم كاتژمێر سێ هێمای مەترسی هەڵكرا پاش ئەوەی هەندێك فیكوهورو ژاوەژاو بیستراو دەڵەكەش دەستیكرد بەوەڕین. دەركەوت سەرچاوەی ئەم دەنگانه كۆكۆبوو كه رێگای خۆی لەنێو دارستانەكاندا هەڵەكردبوو.

## 14ی كانونی یەكەم

رۆژێكی بێ هیچ رووداوێكی تازەیه. راوچی ڤالیێ گراندی، كه لەسەر رێگابوو بەرەو بەسەركردنەوەی ئەو تەپكەیەی كه دوێنێ نایەوە، هاته سەردانیمان بۆ كوختەكەو، ئەوەی پێچەوانه كردەوە كه لەسەرەتادا وتی. داوا لەئانتۆنیۆ كرا بەمەبەستی پیشاندانی ئەو رێرەوەی كه لەدارستانەكاندا لێدرا راوچییەكه لەتەك خۆیدا بەرێت و هیچ گومانێكی لا دروست نەكات.

## 15ی كانونی یەكەم

هیچ شتێكی تازه نییه. (هەشت پیاو)مان خۆمان ئامادەكرد بۆ ئەوەی بچین بەشێوەیەكی هەمیشەیی لەخێوەتگەی ژمارە/ 2/ دا نیشتەجێ بین.

## 16ی كانونی یەكەم

پۆمبۆوئۆربانۆوتۆماوئالیخاندرۆومۆرۆوئانتی ومن: هەموو ئەم بەیانییەمان باركراو به كۆڵ و بار بەسەربرد. مەوداكەمان لەماوەی سێ كاتژمێردا بڕی. رۆلاندۆ لەتەكماندا مایەوەو جواكین و برۆلیۆوكارلۆس وپزیشكەكه رۆیشتن. دەركەوت كه كارلۆس وێڕای ئەوەی بەرگەی ئەركی قورس وگرانی ئیشكردن

دەگرێت توانای رێکردن بۆ ماوەیەکی دوورودرێژیشی هەیە. مۆرۆو تۆما کەلێنێکی پڕ لەماسی گەورەیان لەنێو رووبارەکەدا دۆزییەوەو 17 ماسی گەورەیان لێ راوکردو بەو هۆیەشەوە ژەمە خواردنێکی بەتاممان خوارد. یەکێك لەماسییەکان دەستی مۆرۆی زامدارکرد. سۆراخی شوێنێك کرا کە بەکەڵکی ئەشکەوتێکی زیادە بێت لەدوای لێبوونەوە لەئەشکەوتی یەکەم و، کارەکان بۆ رۆژی دواتر دواخران. مۆرۆ بەتایبەتی و هەروەها ئانتی ش ویستیان ئاسکی تاپیر Tapir راو بکەن و شەویان بەدیار چاودێریکردنی نێچیرگەلەوە بەسەر برد.

## 17ی کانونی یەکەم

مۆرۆوئانتی هیچ نێچیرێکیان دەستگیر نەبوو تەنها راوکردنی تاوسێکی کێوی نەبێت. لەتەك تۆماورۆلاندۆدا لەسەر کاری هەڵکەندنی ئەشکەوتە زیادەکەو سازکردنی بۆ رۆژی دواتر بەردەوام بووین و ئارتۆرۆوپۆمبۆش سۆراخی شوێنێکیان کرد کە بەکەڵکی رادیۆ بێت ئەوجا لەدواییدا چوون بەلای هەموارکردنی رێگای بەرەو دەروازەکە کە دروست لەبارێکی خەراپدا بوو. لەئێوارەدا باران دەستیکرد بەبارین و تاوەکو بەرەبەیان خۆشی نەکردەوە.

## 18ی کانونی یەکەم

بەدرێژایی رۆژ باران باری بەڵام ئیشکردن بۆ ئامادەکردنی ئەشکەوتەکە بەردەوام بوو. تەنها کەمێکی ماوە بۆ ئەوەی بە دومەترونیو، واتە ئەو قولاییەی کە پێویستە، رابگات. گردەکەمان پشکنی و پێدەچوو شیاوبێت بۆ ئەوەی ئامێری رادیۆکەی تیادا دابنێین. بەڵام پێویستە بەکردەوە لەوە دڵنیابین و بزانین بەکەڵکە یان نا.

## 19ی کانونی یەکەم

ڕۆژێکــی دی بارانــاویی و تەڕوتوشــەو هــانی چــوونە دەرەوەو گــەڕان نــادات..بــەڵام لەدەوروبــەری کاتــژمێر یــانزەدا برۆلیــۆونــاتۆ گەیشــتن و دەنگوباســی ئــەوەیان پێیــە کــە رووبارەکــە، ئەگەرچــی ئاوەکــەی قوڵــە، دەتوانرێــت لێــی بــدرێت. لەســاتی دەرچوونمانــدا چــاومان بــەمــارکۆس و پێشڕەوەکانی کەوت کە هاتبوون تاوەکو لای ئێمە نیشتەجێبن. مارکۆس سەرکردایەتی لای خۆی دەهێڵێتەوەو منیش فەرمانگەلی ئەوەم پێدا کە، بەپێی توانا، سێ تا پێنج پیاو رەوانە بکات. مەوداکەمان لەماوەی سێ کاتژمێردا بڕی.

لەدەوروبەری نیوەشەویشدا ریکاردۆ وکۆکۆ گەیشتن و ئانتۆنیۆ ورۆبیۆیان لەتەکدا بوو(لەڕۆژی پێنج شەممەی رابوردودا نەیانتوانی کارتەکانیان دەستبخەن)، هەروەها ئابۆلیناریان لەتەکدا بوو کە بەتەواوی پەیوەندی کردو پابەندبوو. وێڕای ئەوە ئیڤان بۆ تەواوکردنی کەڵەکەیەك لە ئیشوکار هات.

لەراستیدا شەوێکی سپیمان بەسەر برد.

## 20ی کانونی یەکەم

گفتوگۆ دەربارەی هەندێك لە خاڵگەلی گرنگ کراو منیش هەموو فەرمانەکانم دەرکردبــوو ســەروەختێك گروپــی خێوەتگــەی ژمــارە/2/ کــە ئالیخانــدرۆ رێبەرایەتییان دەکات دەرکەوت و ئەوەی راگەیاند کە لەرێڕەوەکەو لەنزیك خێوەتگەکــەوە نێچــیرێکی بەگوللــە پێکراویــان دۆزیوەتــەوە کــە پــەتێك بەلاقییەوەیــەتی. جــواکێن نزیکــەی کاتــژمێرێك لەوەوبــەر لەهــەمان رێگــاوە تێپەڕیبوو بەڵام هیچی لەبارەی ئەو رووداوەوە باس نەکرد. هەموو لەسەر

ئەوە کۆك بووین کە ئەوە راوچی ڤالیێ گراندی‌یە نێچیرەکەی تاوەکو ئەو جێیە کێشکردووەو لەدواییدا جێیهێشتووەو لەبەر هۆیەکی نادیار هەڵهاتووە. پاسەوانمان لەپشتەوە داناو دوو پیاویشمان رەوانەکرد بۆ سۆراخی راوچییەکەو هاوردنی لەتەك خۆیاندا ئەگەر دۆزییانەوە. لەپاش تێپەڕبوونی ساتێك دەرکەوت کە نێچیرەکە ماوەیەکی کەمە مرداربووەتەوەو کرم تێیداوەو دواترجواکین هات و وتی پێشتر لەو جێیەدا بینیومە. کۆکۆولۆرۆ راوچییەکەیان هاورد بۆ ئەوەی چاوی بەنێچیرەکە بکەوێت و ئەویش وتی‌چەند رۆژێکە بەهۆی گوللەیەکەوە پێکاومە، بەمجۆرە رووداوەکە لەم شوێنەدا کۆتایی پێ هات.

بڕیاردرا پەلەبکرێت لەپەیوەندیگرتن لەتەك پیاوی پرسگەکەدا کە کۆکۆ فەرامۆشی کردبوو و قسە لەتەك میجیاشدا بکرێت کە ببێتە رایەڵی پەیوەندی نێوان ئەوو ئیڤان. پەیوەندییەکانی ئیڤان بە میجیاوسانشێ‌وتانیاو ئەو کەسەوە دەبێت کە حیزب هەڵیدەبژێرێت. رەنگە لەفیلامۆنتەوە بێت بەڵام دەبێت لەوە دڵنیابین. بروسکەیەك لەمانێلاوە هاتووە هێما بۆ ئەوە دەکات کە مۆنجە لەباشورەوە بەرەو لای ئێمە بەرێوەیە.

تۆڕێك بۆ پەیوەندییەکان دامەزرێنرا ـ بەڵام جێی رەزامەندی من نییە چونکە بەئاشکرا هێما بۆ ترس‌وگومانی خودی هاوڕێیانی مۆنجە دەکات لەسەرۆکەکەیان.

لەکاتژمێر یەکی بەیانیدا لەلاپازەوە پێمان دەڵێن کە مۆنجە سەفەرەکەی دەستپێکردووە یان نا. ئیڤان توانای جێبەجێکردنی ئیشوکارەکانی هەیە بەڵام پاسپۆرتەکەی کە باش ساز نەکراوە دەرفەتی ئەوەی بۆ نارەخسێنێت. دەبێت و پێویستە بۆجاری داهاتوو ئەو بەڵگەنامەیە چاکبکرێت و پێویستە

پەیام بۆ مانێلا رەوانەبکرێت تاوەکو هاوڕێیان پاسپۆرتێکی نوێ دابین بکەن.

تانیا جاری داهاتوو دێت بۆ ئەوەی رێنماییگەل وەربگرێت...دواتر دەینێرم بۆ بۆینس ئایرس.

دواجار بڕیاری ئەوە درا ریکاردۆو ئیڤان وکۆکۆ لەکامیری سواری فرۆکە بن و ئۆتۆمبیلی جیپەکە لەوێندەر جێبهێڵن. سەروەختێکیش لەسەفەرەکەیان دێنەوە لەرێگای تەلەفونەوە پەیوەندی بەلاگۆنیلاسەوە دەکەن بۆ ئەوەی لەگەیشتنیان ئاگاداریان بکەنەوە. لەئێوارەشدا جۆرج دەچێت پرسیاری دەنگوباس دەکات و لەتەك خۆیاندا دەیانهێنێت ئەگەر پێویستی بەوە کرد. لەکاتژمێر یەکدا هیچ شتێکمان لەلاپازەوە بەدەست رانەگەیشت. ئەوانیش هەرسێکیان بەیانی زوو لەگەڵ گزنگی خۆردا بەرەو کامیری بەرێکەوتن.

## 21ی کانونی یەکەم

لۆرۆ هێشتا ئەو نەخشانەی بۆ جێنەهێشتوم کە ئەو کەسە دروستی کردون کە گەڕانی پشکنینەکەی ئەنجامداوەو، تائێستاش لەسروشتی ئەو رێگایە بێئاگام کە دەچێتەوە سەر یاکی. لەبەیانیدا دەرچووین و رێگاکەمان بێ رووداني هیچ گیروگرفتێك بڕی. پێویستە هەموو شتێك بۆ بیست وچوار سازبکرێت...واتە بۆ رۆژی زەماوەندەکەمان. لەرێگا چاومان بەپاچۆومیگیل و بینینۆوکۆمبا کەوت کە ئەرکی گواستنەوەی ئامێری رادیۆکەیان لەئەستۆ گرتووە. لەکاتژمێر پێنجی پاش نیوەرۆدا پاچۆوکۆمبا بەبێ ئەو ئامێرە کە لەدارستانەکاندا شاردبوویانەوە گەڕانەوە، لەبەرئەوەی کە قورس بوو هەربۆیە نەیانتوانی هەڵیبگرن. سبەی پێنج پیاو بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە بەرێدەکەون. ئیشکردن لەنێو ئەو ئەشکەوتەدا کە

بۆ ئازوخە سازکراوە تەواوبوو و سبەینێ دەست دەکەین بەسازکردنی ئەشکەوتێك بۆ رادیۆکە.

## 22ی کانونی یەکەم

دەستمانکرد بەئیشکردن لەو ئەشکەوتەدا کە بۆ رادیۆکە تەرخانکراوە...لەسەرەتاداو لەبەرئەوەی خاکەکە گڵ بوو کارەکە ئاسان بوو بەڵام هێندەی نەبرد گەیشتینە چینێکی بەردینی فرە سەخت کە بووە رێگر لەبەردەم بەردەوامبوونمان لەسەر هەڵکەندن. پیاوەکان ئامێری رادیۆکەیان هاورد کە پێدەچێت قورس بێت بەڵام لەبەر نەبوونی سوتەمەنی تاقییان نەکردەوە. لۆرۆ وتی نەخشەکە رەوانە ناکەم چونکە راپۆرتەکە زارەکییەو سبەی خۆی بەدەستیی دەیهێنێت.

## 23ی کانونی یەکەم

منو پۆمبۆو ئالیخاندرۆ بەمەبەستی پشکنینی ناوچەی باکور دەرچووینو دەبوو رێیەکی تیادا لێبدەین بەڵام ئەوە هات بەخەیاڵماندا کە زۆر بەئاسانی دەتوانین پیایدا پێشڕەویی بکەین. جواکین لەتەك دوو هاورێدا هات تاوەکو ئەوەمان پێ رابگەیێنێت کە لۆرۆ، بەهۆی هەڵهاتنی یەکێك لەبەرازەکانو ناچاربوونی بەوەی کە بەشوێنیدا بگەڕێت، ناتوانێت بێت. هیچ هەواڵێك لەبارەی ئەو رێگایەوە نییە کە پیاوی لاگۆنیلاس وەبەری گرتووە.
لەپاش نیوەرۆدا بەرازەکەی هاوردو بەرازێکی گەورە بوو بەڵام ئێمە خواردنەوەمان لا نەبوو. لۆرۆ توانای کرینی ئەم جۆرە شتانەی نییەو کارەکەشی پێدەچێت ئێجگار بێسەروبەر بێت.

## 24ی کانونی یەکەم

رۆژێکی تەرخانکراوە بۆ دانیشتنی شەوی جەژنی لەدایکبوون. ژمارەیەك لەهاوڕێیانمان دوو گەشتیان ئەنجامداو بەو هۆیەشەوە لەکاتێکی درەنگدا گەیشتن بەڵام دواجار هەموو کۆبووینەوەو کاتێکی خۆشمان بەسەربرد تا ئەو دەمەی جامی هەندێکیان پڕ بوو، لۆرۆ وتی سەفەری پیاوی (لاگۆنیلاس) بیٚ بەرهەم بوو و تەنها نەخشەی(کرۆکی)دەستگیربوو کە ئەویش بەهیچ کلۆجێك وردودروست نییە.

## 25ی کانونی یەکەم

گەڕاینەوە سەر کارو هیچ گەشتێکمان بەرەو خێوەتگەی یەکەم ئەنجام نەدا کە لەسەر پێشنیاری پزیشکە بۆلیڤییەکە بە ڤ26 ناوزەدکرا. مارکۆس وبینینۆ وکۆمبا بەمەبەستی لێدانی ڕێگایەك لەدیوی لای راستی گردەکەوە بەرەو بەرزایی گردەکە دەرچوون و ئێوارە درەنگانێك هاتنەوەو دەیانگوت: لەدووریی دوو کاتژمێر ڕێکردن لەڕێگاکەوە شتێکیان بینیوە کە لەمێرگێکی وشکبوو چووەو سبەی بۆ بینینی بەرێدەکەون. کۆمبا هاتەوەو تای لێهاتبوو. میگیل وپاچۆ بەمەبەستی شوێنەگومیٚ وچەواشەکردن و لەبەشی لای چەپەوە چەند ڕێگایەکیان لێداو هەروەها دەروازە ڕێگایەکیشیان بەرەو ئەشکەوتی رادیۆکە لێدا. لەتەك ئانتی وئانتۆنیۆ وتۆمادا لەسەر ئیشکردن لەئەشکەوتی رادیۆکەدا بەردەوام بووین و بەهۆی چینی بەردینی خاکەکەوە زۆر ماندوبووین. پاسەوانەکان لە بەری دواوە سەرگەرمی هەڵدانی خێوەتەکەیان و گەڕان بوون بەدووی شوێنێکدا بۆ روانین وچاودێریکردن کە بەسەر هەردوو بەری دەروازەی رووبارەکەدا بڕوانێت.

## 26ی كانونی یەكەم

ئانتی وكارلۆس چوون بۆ دۆزینەوەی ئەو شوێنە كە لەسەر نەخشەكە ناوی یاكی یە...راگەیشتن بەو جێیە سەفەرێكی گەرەكە كە دوو رۆژی دەوێت. رۆلاندۆوئالیخاندرۆوپۆمبۆ لەسەر كاری تاقەتپڕوكێنی هەڵكەندنی ئەو ئەشكەوتەی كە خاكەكەی زۆر سەخت و رەقەنە بەردەوام بوون. لەتەك پاچۆدا بەمەبەستی دۆزینەوەی ئەو رێگایانە كە میگیل لێیداون دەرچووین و، هیچ كەڵكێكم لەتەواوكردنی ئەو رەوتەدا كە دەچێتەوە سەر ناوچەی گردەكە، بەدی نەكرد. ئەو رێرەوە كە دەچێتەوە سەر ئەشكەوتەكە خراپ نییەو ئاشكراكردنیشی دژوارە. ئەمڕۆكە دوو مارمان كوشت، ئەمە وێڕای ئەو مارەی كە دوێنێ كوشتمان. پێدەچێت مارگەل لەناوچەكەدا زۆر بێت. تۆما وئارتۆرۆورۆبیۆوئانتۆنیۆ چوون بۆ شكارو برۆلیۆوناتۆ بۆ پاسەوانیكردنی خێوەتگەكەی دیكە مانەوە. وتیان كە ئۆتۆمبیلەكەی لۆرۆ وەرچەرخاوەو ئەو یاداشتە راقەئامێزەیان بۆ هاوردم كە گەیشتنی مۆنجە رادەگەیێنێت. ماركۆس ومیگیل وبینینۆ بەنیازی فراوانكردنی رێگای بەرەو تەپۆلكەكە دەرچوون بەڵام ئێوارە نەگەڕانەوە.

## 27ی كانونی یەكەم

لەتەك تۆمادا دەرچووین بەشوێن ماركۆس دا گەڕاین. دوو كاتژمێرونیو رێمانكرد تا گەیشتینە جۆگەیەكی بچوك كە لە لایەنی چەپەوە بەئاراستەی خۆرهەڵاتدا دەرژێتە خوارێ و بەسەر بەرزاییگەلێكی سەختدا شوێنپێمان هەڵگرت. پێشبینیم كرد كە لەم رێیەوە بەخێوەتگەكە رابگەین بەڵام چەند كاتژمێرێكی دوورودرێژ رێمانكردو بەشوێنی مەبەست رانەگەیشتین. لەدوای كاتژمێر پێنجی دوای نیوەرۆ گەیشتینە نانكاهوازو لەدووریی پێنج كیلۆمەتر لەلای خوارووی خێوەتگەی ژمارە/1/ودواجار لەكاتژمێر حەوتدا

بەخێوەتگەکە راگەیشتین. لەوێندەر زانیمان کە مارکۆس شەوی رابوردوی تیادا کردووەتەوە. کەسم لەگەیشتنم ئاگادارنەکردەوە چونکە وامدەزانی مارکۆس ئەو رێگایەی پێ گوتون کە وەبەری دەگرم. ئۆتۆمبیلە جیپەکەمان بینی کە وەرچەرخابوو و نیمچە تێکشکانێك تێکشکابوو. لۆرۆ بەمەبەستی پەیداکردنی پارچەی یەدەگ چوو بۆ(کامیری). وەکی ناتۆش گێڕایەوە پێدەچێت لەکاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبیلەکەدا خەوی لێکەوتبێت.

## 28ی کانونی یەکەم

لەکاتێکدا کە خەریکی دەرچوون بووین بۆ ئەوەی بەرەو خێوەتگەکە بەرێ بکەوین، ئۆربانۆو ئانتۆنیۆ هاتن کە تەقەللای دۆزینەوەی منیان دەکرد. مارکۆس لەتەك میگیلدا لەسەر لێدانی رێیەك بەرەو خێوەتگەکە لەرێگای بەرزایی تەپۆلکەکەوە بەردەوام بوون و نەگەڕانەوە. بینینۆو پۆمبۆش بۆ سۆراخی من دەرچوون و هەمان ئەو رێیەیان وەبەرگرت کە ئێمە لەسەری رێمانکردو سەروەختێك کە گەیشتمە خێوەتگەکە چاوم بەمارکۆس ومیگیل کەوت کە شەویان لەبەرزاییەکەدا کردەوە بێئەوەی بتوانن بەرەو خێوەتگەکە بگەڕێنەوەو میگیل سەبارەت ئەو رەفتارەی کە لەتەکیدا کراوە سکالاّی لای من کرد. پێدەچێت سکالاّی لەجواکین وئالیخاندرۆ وپزیشکەکە هەبێت. ئانتی وکارلۆس بەبێ ئەوەی هیچ شوێنەوارێکی کوختی ئاوەدان بدۆزنەوە..بێجگە لەکوختێکی چۆڵ کە لایەنی زۆر لەتەك خاڵی سەر نەخشەکە کە ناوی یاکییە ناگونجێت، گەڕانەوە.

## 29ی کانونی یەکەم

لەتەك مارکۆس ومیگیل وئالیخاندرۆدا بەرەو مێرگە وشکبووەکەو بەمەبەستی بەسەرکردنەوەی بەرێکەوتین. پێدەچێت کە ئەمە

سەرەتای(پامبا دیل تیگر)بێت کە زنجیرە چیایەکی رووتەنی دەوروبەری 1500مەتر بەرزە. پێویستە رێگای بەرزایی لای چەپی وەبەرنەگرین چونکە رووەو نانکاهوازو دەچێتە خوارەوە. دەستمان بەدابەزین کردو لەماوەی کاتژمێرێكو بیست دەقیقەدا گەیشتینە خێوەتگەکە. هەشت پیاومان بۆ هاوردنی پێویستیی رەوانەکرد بەلاّم نەیانتوانی هەمووی بهێنن. رۆبیۆوپزیشکەکە شوێنی برۆلیۆوناتۆیان گرتەوە. ناتۆ بەر لەهاتنەوەی رێرەوێکی نوێی لێدا..لەبەردی ناو رووبارەکەوە دەست پێدەکاتو ئەوجا لەلایەنەکەی دییەوە دەچێتە نێو قولاّیی دارستانەکانەوە..رێرەوێکە سەرتاپا بەردینوهەردەو شوێن پێی لەسەر بەجێنامێنێت. لەئەشکەوتەدا ئیشمان نەکرد. لۆرۆش چووە بۆ کامیری.

## 30ی کانونی یەکەم

وێرای ئەو بارانانە کە رێژەی ئاوی رووبارەکەیان زۆر کرد، چوار پیاو بەمەبەستی لەناوبردنی پاشماوەی خێوەتگەی ژمارە/1/ بەرێ کەوتن..ئەمێستا هەموو شتێك بەرۆشنی دەردەکەوێت. هیچ دەنگوباسێکمان لەدەرەوە پێرانەگەیشت. شەش پیاو لەدوو سەفەردا بەرەو ئەشکەوتەکە کەوتنە رێو ئەوەی کە پێویست بوو بیشارنەوە شاردیانەوە. ئیشکردن لە فرەنەکەدا تەواو نەبوو چونکە قورەکە تەڕ بوو.

## 31ی کانونی یەکەم

پزیشکەکە لەکاتژمێر حەوتونیودا هاتو هاتنی مۆنجەی راگەیاند. لەتەك ئانتیوتۆماو ئۆربانۆوئارتۆرۆدا چووم بۆ چاوپێکەوتنی. دیدارەکە دۆستانەبوو بەلاّم گرژیی بالّی بەسەردا کێشابوو و..ئەم پرسیارە دەهاتودەچوو: "چیت دەوێت؟"، بان دیڤینۆ(19) کە ئەندامێکی نوێیە،

لەتەك مۆنجەدا بوو، هەروەها تانیا وریکاردۆش هاوڕێی بوون و، تانیا بۆ وەرگرتنی ڕێنمایی هاتبووو ریکاردۆش بۆ ئەوەی کە لەتەکماندا بمێنێتەوە. سەرەتای قسەکردن لەتەك مۆنجەدا بەشتگەلێکی گشتی دەستپێکرد ئینجا بەخێرایی چووە سەر ئەو گیروگرفتە سەرەکییانەی کە دەکرێت ودەشێت لەم سێ مەرجە بنەڕەتییەدا کورت بکرێنەوە:

1ـ دەستبەرداری سەرکردایەتی حیزب دەبێت و قایلی دەکات بەوەی کە لایەنی کەم بێلایەن بێت و، هەندێك لەئەندامەکانیشی پەیوەندی بەشۆڕشەوە دەکەن.

2ـ مادامەکی شۆڕشەکە لەسەر خاکی بۆلیڤیایە، سەرکردایەتی سیاسی وسەربازیی بەدەست ئەو دەبێت.

3ـ لەهەوڵێکدا بۆ قایلکردنی پارتەکانی ئەمەریکای باشور بەپشتگیریکردنی بزوتنەوە ئازادیخوازییەکان، پەیوەندی لەتەك ئەو پارتانەدا دادەمەزرێنێت(بۆ ئەمەش ئەم نموونەیەی هاوردەوە: دۆگلاس براڤۆ).

منیش بەوە وەڵامم دایەوە کە خاڵی یەکەم بەتایبەت پەیوەندی بەخۆیەوە هەیە بەو پێیەی کە سکرتێری حیزبە، ئەگەرچی من ئەم هەڵوێستەشی بەگوناهێکی گەورە دەزانم. ئەم هەڵوێستە هەڵوێستێکی ناجێگیرەو، لەچارەسەرە نیوە ناتەواوەکانەوە سەرچاوە دەگرێت و بەهیوای نەمرکردنی ڕۆڵی ئەو کەسانەیە کە لەبەر هەڵوێستی لەنگیان پێویستە پرۆتیستۆ بکرێن. ڕۆژگاریش راستیی ئەم قسانەی من دەسەلمێنێت. سەبارەت خاڵی سێیەم دەربارەی تەقەللای دروستکردنی ئەو پەیوەندییانە، هیچ ڕەخنەیەکم نەبوو ئەگەرچی بڕواشم وایە کە شکست دەهێنێت. چونکە داواکردن لەکۆدۆفیلا کە یارمەتی دۆگلاس براڤۆ بدات، وەکی ئەوە وایە کە دوای لێبکرێت پشتگیری یاخیبوونێك بکات کە لەنێو خودی حیزبەکەیدا دەکرێت. لێرەشدا دیسان ڕۆژگار دروستیی ئەم بۆچوونانە دەردەخات.

هەرچی خاڵی دووەمیشە بەهیچ کلۆجێك نەمدەتوانی پێی قایلبم. سەرکردەی سەربازیی لەخۆم بەولاوە کەسی تر نابێت و ئەوە مەسەلەیەکە مشتومڕ هەڵناگرێت. لێرەدا گفتوگۆ راوەستاو لەبازنەیەکی بۆشدا خولایەوە.

لەسەر ئەوە رێککەوتین کە مۆنجە بەهەڵوێستی خۆیدا بچێتەوەو لەتەك هاوڕێ بۆلیڤییەکاندا بکەوێتەوە وتوێژوگفتوگۆ. بەرەو خێوەتگە نوێیەکە گواستمانەوەو لەوێندەر قسەم لەتەك سەرجەم هاوڕێیاندا کردو ئەم هەڵبژاردنە دژوارەم پێشچاوخستن: مانەوە یان پشتگیریکردنی حیزب. هەمووان مانەوەیان هەڵبژارد...وادیارە ئەمەش ئەوی خەمبارکرد. لەکاتی نیوەڕۆدا پێك تێکراوخورایەوەو ئەو دەمە ئەویش هێمای بۆ بایەخی ئەم دیدارە مێژووییە کردو منیش ئەو قسانەی ئەوم قۆستەوە تاوەکو بەو جۆرە ئاماژە بۆ ئەم ساتە بکەم کە سەرەتای شۆڕشە لەکیشوەرەکەدا..لەتەك هێماکردن بۆ ئەوەدا کە رۆح و گیانمان بەرامبەر سەرکەوتنی شۆڕش هیچ نرخێکی نییە.

فیدڵ ئەو پەیامانەی بۆ رەوانەکردم کە لێرەدا هاوپێچ کراون.

## لێکدانەوەی مانگانە

گروپە کوباییەکە سەرکەوتووانە پێکهات ودروست بوو: ورەگەلی پیاوەکان باشەو ئەو گیروگرفتانەی کە لەبەردەمدان بچوك وکەمن و بۆلیڤییەکانیش ئەگەرچی ژمارەیان کەمە بەڵام باشن. هەڵوێستی مۆنجە رەنگە لەلایەکەوە تەگەرە بخاتە سەر رێگای گەشەکردنی جەنگی پارتیزانیی بەڵام لەلایەکی دیکەوەو پاش ئازادبوونی لەنیمچە چارەسەرە سیاسییەکان، بەشداری تیادا دەکات. رێوشوێنەکانی داهاتوو، شانبەشانی چاوەڕوانیکردنی هەندێك لەبۆلیڤییەکانی دی، گرەنتی قسەکردن لەتەك گیڤاراو ئەم جوتە ئەرجەنتینییەدا دەدات: مۆریسیۆ(20)و جۆزامی(ماسیتی و پارتیکەرتبوو).

## 1ی کانونی دووەم1967

مۆنجـە ئـەم بەیانییـە بـێ هـیچ گفتوگۆیـەکی پێشـوەختە سـوربوونی خـۆی لەسەر ڕۆیشتن و دەستکێشانەوە لەسـەرکردایەتی حیـزب لەبـەرواری 1/8ەوە پێراگەیانـدم چـونکە بـڕوای وایـە کـە ئـەرك و کـاری ئـەو تـەواوبووە. هێنـدە بەناوچـەوانێکی گـرژەوە لای ئێمـەی جێهێشـت دەتگـوت بـۆ بـەردەم پـەتی سێدارە پـەلکێش دەکرێت. هەست دەکـەم لـەرێگای کۆکۆوە دەرکـی ئـەوەی کردووە کە من تەواو سورم لەسەر ئەوەی مەسەلەگەلە ستراتیژییەکان بەکـەم وەرنـەگرم و بـەفیڕۆ نـەدەم و ئـەویش، پـاش ئـەوەی دەرکـی بـەوە کـرد کـە بەهانـەکانی لاوازن، ئـەم هەلـەی کـردە بیـانو بـۆ ئـەوەی پەیوەندییـەکانی نێوانمان بپچڕێنێت.

دوای نیوەڕۆ کۆبوونەوەیەکم بۆ سەرجەم جەنگاوەران سازکرد و هەڵوێستی مۆنجەم بۆ شیکردنەوەو ئەوەم پێراگەیانـدن کـە پێکـەوە لەپێناو یـەکبوونی هـەموو ئەوانـەدا کـە باوەڕیـان بەشۆڕشـی چـەکدارییە کاردەکـەین، هاوکـات بـۆ بۆلیڤییـــەکانیش پێشـــبینی ســـاتگەلێکی ســـەخت و ڕۆژانێکـــی پـــڕ لەئێش وئازاری دەروونییم کرد...هەوڵدەدەین لـەرێگای گفتوگـۆی بەکۆمـەڵ و بەهاوبەشـــی تێکـــڕای رابـــەرە سیاســـییەکانیش چارەســـەرێك بـــۆ ئـــەو گیروگرفتانەی کە دروستبوون بدۆزینەوە.

هەندێك زانیاریم دەربارەی سەفەرەکەی تانیا بۆ ئەرجـەنتین بـۆ چـاوپێکەوتن لەتـــەك مۆریســـیۆو جـــۆزامی و بانگهێشـــتکردنیان بـــۆ خێوەتگەکـــەمان، پێشچاوخســـت. بەدوردورێـــژیش ئـــەو ئەرکانـــەمان دەستنیشـــانکرد کـــە خراونـەتە ئەستۆی سانشـێ و هـەموو لـەو بارەیـەوە کـۆك بـووین کـە لـەکاتی ئەمێسـتادا ئـەم هاوڕێیانـە لـەلاپـاز بمێننـەوە: ڕۆدۆلفـۆ ولۆیـۆلا وهیمبرتـۆ. هەرچی لەکامیریشە خوشکەکەی لۆیـۆلامـان هێشـتەوەی، لـەسـانتاکروزیش

کالفیمۆنت. میتمۆ بۆ سۆراخی شوێنێك كه تیایدا نیشتەجێ بێت گەشتێك بـۆ ناوچـەی (سـوکر)دەکـاتو، ئـەرکی سەرپەرشـتی کاروبـاری دارایـیش بـەلۆیـۆلا دەسـپێردرێتو..بـەم زوانـەش بـڕی80000 پیـزۆسی بەدەسـت رادەگـات کـە20000 پیـزۆسی بـۆ کالیفمۆنـت تـەرخانکراوە بـۆ کڕینـی ئۆتـۆمبیلێکی بارهـەڵگر. سانشێ بـۆ دیـاریکردنی وادەیـەك بۆ چاوپێکەوتن لەتەك گیڤارادا پەیوەندی بەگیڤاراوە دەکات، هەرچی کۆکۆشە دەچێت بۆ سانتاکروز بۆ ئەوەی وتوێژ لەتەك براکەی کارلۆسدا بکات تاوەکو ئەرکی پێشوازیکردنی ئەو سـی پیاوەی کـە لـەهاڤانـاوە دێـن پێرابسـپێرێت. ئـەو نامەیـەم بـۆ فیـدڵ نووسـی کـە لـەنێو بەڵگەنامەکانـدا ئـەم ژمارەیـەی لەسـەر دانراوە: 102/س ز و.

## 2ی کانونی دووەم

هــەموو بــەیانیمان لەنووســینی نامەگــەل بــەهۆی کــۆدەوە، بەســەربرد. لــەئێوارەداو راســتەوخۆ لــەدوای تــەواوبوونی وتارەکــەی کاســترۆ، سانشێ وکۆکـۆوتانیـا سـەفەریان کـرد. فیـدڵ لـەنێو وتارەکەیـدا بـەهۆی دەســتەواژەگەلێکەوە باســی ئێمــەی کــرد کــە هەســتێکی زیــاتر بەبەرپرسیارێتی و پێداگرتن لەسەر کارکردنی تیاماندا دروست کرد...ئەگەر ئەوە لەتوانادا هەبوو.

هەرچی لەخێوەتگەکەشە کارەکان بریتـی بوون لەهەڵکەندنی ئەشکەوتەکەو پاشماوەی پیاوەکانی دیکەش چوون بۆ هاوردنی پێویستیی لەخێوەتگەی یەکـەم. مـارتۆس ومیگیـل وبینینـۆ گەشـتێکی پشـکنینیان بـەرەو بـاکور ئەنجامداو، ئانتی وکارلۆسیش رووباری(نانکاهوازو)یان پشکنی تا ئەو دەمـەی خـەڵکانێکیان لـەنزیك یـاکی دۆزییـەوە. کـاری پشـکنینی(یـاکی) تـا سەرچــاوەکەی یــاخود تــا بەناوچــەیەکی ئــاوەدان رادەگــەن،

بەجواکین وپزیشکەکە سپێردراو، هەموو تەنها ماوەی پێنج رۆژیان بۆ جێبەجێکردنی کارەکانیان بۆ دەستنیشان کرا.
پیاوانی خێوەتگەکە هاتنەوەو دەیانگوت لۆرۆ لەدوای ماڵئاوایی مۆنجە نەگەڕایەوە.

## 3ی کانونی دووەم

چووین بەلای سازکردنی سەقفێك بۆ ئەشکەوتەکەوە بەڵام نەمانتوانی و پێویستە سبەینێ ئەو کارە تەواوبکەین. تەنها دوو پیاو بۆ گواستنەوەی پێویستییەکان دەرچوون و دواتر هاتنەوەو وتیان هاوڕێیان هەموو دوێنێ ئێوارە سەفەریان کردووە. پاشماوەی پیاوەکان سەرگەرمی سەقفی چێشتخانەکە بوون و سازیانکرد.

## 6ی کانونی دووەم

سەرلەبەیانی من ومارکۆس وجواکین وئالیخاندرۆ وئانتی بەمەبەستی بەسەرکردنەوەی تەپۆلکە رووتەنەکە بەرێکەوتین و...لەوێندەر ئەم بڕیارەمدا: مارکۆس وکامبا وپاچا تەقەللای ئەوە دەدەن کە لەلای راستەوەو بۆ ئەوەی خۆیان لەروبەروبوونەوەی خەڵکی بەدووربگرن بەنانکاهوازو رابگەن...هەرچی میگیل وبرۆلیۆ وئانیسیتۆشە لەسەر بەرزایی تەپۆلکەکە بەشوێن رێرەوێکدا دەگەڕێن و بەو هۆیەشەوە رێگای سەرەکی دەگرنەبەر. جواکین وبینینیۆ وئانتی کاری گەڕان بەشوێن رێرەوێك بەرەو(فریاس)ئەنجام دەدەن کە ئاراستەکەی لەسەر نەخشەکە پێدەچێت هاوتەریبی ئاقاری نانکاهوازو بێت لە بەری ئەوبەری ئەو تەپۆلکەیەوە کە وا بڕوا دەکرێت (پامبا دیل تیگر)بێت.

له دوای نیوەڕۆدا لۆرۆ هات و دوو هێستری بەدوای خۆیدا کێشدەکرد کە بە بڕی2000 پیزۆس کڕیبوونی..هەڵبەت نرخێکی باشە چونکە ئاژەڵگەلێکی جوان و بەهێزن. ناردم بەشوێن برۆلیۆو پاچۆداو داوای هاتن بۆ ئێرەیان لێدەکەم بۆ ئەوەی پاچۆ بتوانێت سبەی بەیانی زوو سەفەر بکات و، هەریەکە لەکارلۆس وپزیشکەکە شوێنیان گرتنەوە.

پاش ئەوەی لەو وانەیەم کە بەهاوڕێیانم گوتەوە لێبوومەوە، کەمێك باسی تایبەتمەندییەکانی جەنگی پارتیزانیی و پێداویستیی دیسپلینێکی باشترم کردو..ئەوەم بۆ ئامادەبووان شیکردەوە کە ئەرکی ئێمە پێش هەر شتێك پێویستیی بە گروپێکی نموونەیی و، گروپێکی پۆلایینە..ئینجا لەدواییدا بایەخ وگرنگی کۆڵینەوەم شرۆڤەکرد کە بۆ ئێمە زۆر پێویستە. بەبڕوای من بۆ کاری داهاتوومان گرنگە. دواتریش کۆبوونەوەیەکم بۆ سەرکردەی گروپەکان گرێدا: *جواکین و مارکۆس و ئالیخاندرۆو ئانتی و رۆلاندۆو پۆمبۆو پزیشکەکەوناتۆوریکاردۆو*، ئەو هۆکارانەم بۆ روونکردنەوە کە وایان لێکردم لەجیاتی مارکۆس کە چەند جارێك هەمان هەڵەگەلی دووبارە کردەوە، جواکین لەپۆستی سەرۆکی سەربازیی دووەمدا دابنێم. لەو رووداوەشدا کە سەرەتای ساڵی نوێ لەنێوان جواکین ومیگیلدا روویدا رەخنەم لەهەڵوێستی جواکین گرت و، پاشان هەندێك لەو ئەرکانەم روونکردەوە کە پێویستە بۆ باشترکردنی رێکخراوەکەمان جێبەجێ بکرێن.

دواجار ریکاردۆ رووداوێکی بۆ گێڕامەوە کە لەتەك ئیڤان و، بەئامادەیی تانیا بەسەریدا هاتبوو..پێدەچێت جنێویان بەیەکدی دابێت و، ریکاردۆش داوای لەئیڤان کردووە لەئۆتۆمبیلی جیپەکە دابەزێت. ئەم دەمەقاڵێیانە کە لەنێوان هاوڕێیاندا روودەدەن کاریگەریی خراپ دەکەنە سەر ئیش وکارەکانمان.

## 7ی کانونی دووەم

ئەوانەی گەڕانی پشکنینیان هەبوو هەموو دەرچوون و، "گوندۆلا"کە تەنها لەئالیخاندرۆوناتۆ پێکهات و ئەوانی دی کۆششی خۆیان بۆ ئەنجامدانی ئیش وکاری ناوخۆیی تەرخانکرد. ئامێری رادیۆکەو هەموو پێویستییەکانی ئارتۆرۆمان هاوردو سەقفێکی تازەمان بۆ ئەشکەوتەکە سازکردو بیرگەلی ئاوەکانیشمان چاککردەوەو پردێکی بچوکمان لەسەر جۆگەکە دروستکرد.

# 10ی كانونی دووەم

پاسەوانی جێگیری خێوەتگە كۆنەكە ئاڵوگۆڕكراو رۆبیۆوئابۆلینار شوێنی كارلۆس‌و پزیشكەكەیان گرتەوە. رووبارەكە، ئەگەرچی ئاستی ئاوەكەشی دابەزیوە، بەڵام هێشتا هەر ئاوی زۆربوو. لۆرۆ چوو بۆ(سانتاكروز)و هێشتا نەگەڕاوەتەوە.

من‌و(مۆرۆ)ی پزیشك‌و تۆماو، ئانتۆنیۆ كە پاسەوانیكردنی خێوەتگەكەی پێ سپێردرا، بەسەر چیای(پامبا دیل تیگر)دا سەركەوتین. لەوێندەر ئەركەكانی سبەی بەیانی ئانتۆنیۆم بۆ ناوبراو روونكردەوە كە ئەویش بریتییە لەدۆزینەوەی جۆگەیەك كە بە بڕوای ئەو لەلای خۆرئاوای خێوەتگەكەمانەوەیە. لەوێندەرەوە بۆ ئەوە هەوڵماندا كە بە رێگا كۆنەكەی ماركۆس رابگەین‌و بەئاسانییش پێیراگەیشتین. سەروەختێكیش كە شەو داهات شەش لەپشكنەرەكان هاتنەوە: میگیل لەتەك برۆلیۆوئاینسیتۆو، ئەوجا جواكین لەتەك بینینیۆوئانتی‌دا. میگیل‌و برۆلیۆ توانییان دەروازەیەك بەرەو ئەو رووبارە كە بەسەر تەپۆلكەكەدا تێدەپەڕێت بدۆزنەوەو دواتر لقێكی دیكەمان دۆزییەوە كە پێدەچێت(نانكاهوازو)بێت. جواكین توانی لەتەك رووبارەكەدا رێ بكات كە لایەنی زۆر رووباری(فریاس)ەو، رەنگە هەر هەمان ئەو رووبارە بێت كە گروپی یەكەم دۆزییانەوەو...ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە كە نەخشەكانمان ئێجگار خراپن.. لەنێو نەخشەكاندا ئەوە هاتووە كە دوو رووبارەكە داروەدەوەنێكی چڕ لەیەكدییان جوێ دەكاتەوەو دواتر هەریەكەیان بەجیا دەڕژێتە نێو ریۆگراندی‌ەوە.

لەهاڤاناوە پەیامێكمان بەدەست راگەیشتووە دەڵێت چینۆ رۆژی دوانزەی مانگ بەیاوەریی پزیشكەكەو شارەزای رادیۆكە هاڤانا

جێیدەهێڵێتو..هەروەها(ریا)ش لەچواردەی مانگدا سەفەر دەکات..نامەکە باسی لەهاوڕێکانی دیکەمان نەکردووە.

## 11ی کانونی دووەم

ئانتۆنیۆ بەهاوڕێیەتی کارلۆسو ئارتۆرۆ بەمەبەستی دۆزینەوەی جۆگەکەی تەنیشتمان دەرچوونو، ئێوارە هاتنەوەو هەموو ئەو هەواڵەی کە لەتەك خۆیاندا هاوردیانەوە ئەوەبوو کە جۆگەکە دەرژێتە نێو(نانکاهوازو)ەوە لەبەرامبەر ئەو مێرگانەدا کە ئێمە شکاری تیادا دەکەین.

ئالیخاندرۆو پۆمبۆ سەرقاڵی نیگارکردنی نەخشەکان بوون لەئەشکەوتەکەی ئارتۆرۆداو، دواتر هاتن ئەوەیان پێراگەیاندم کە کتێبەکانم باران تەڕی کردونو هەندێکیان شۆراونەتەوەو کەڵکیان نەماوە، هەروەها ئامێرگەلی پەیوەندی رادیۆکەش تەڕبووەو ژەنگ لێیداوە. ئەگەر ئەوە دەرکەوت کە هەردوو ئامێری رادیۆکە لەکارکەوتوون...ئەو دەمە بەهرە بێهاوتاکانی ئارتۆرۆمان بۆ دەردەکەوێت.

لەئێوارەدا مارکۆس هات...(نانکاهوازو)ی لەرێگای ماوەگەلێکی دوورەوە دۆزیوەتەوەو نەیتوانیوە بەخاڵی یەکگرتنی ئەم رووبارە لەتەك فریاسدا رابگات. تەواو لەدروستیی نەخشەکانو لەراستیی شوناسی رێڕەوی فریاس دڵنیانیم.

بەسەرۆکایەتی ئانیسیتۆوپیدرۆ دەستمانکردە لێکۆڵینەوەی(کیشوا).

رۆژی(بۆرۆ)یە(21). لەنێوجلوبەرگەکانی مارکۆسو پۆمبۆو ئانتۆنیۆو مۆرۆوجواکیندا کرمۆکەگەلی مێشمان دەرهاورد.

## 12ی کانونی دووەم

(گوندۆلا)مان بۆ هاوردنی ئەو پێویستییانەی کە مابوون، رەوانەکرد. لۆرۆ تائێستا نەگەڕاوەتەوە ..مەشقمان لەسەر سەرکەوتن بەسەر تەپۆلکەکانی

دەوروبەری جۆگەکەماندا کردو دوو کاتژمێرمان بەسەربرد تاوەکو لە هەردوو گوێیەکەوە بەسەریدا سەرکەوتین، ئەمە لەکاتێکدا کە سەرکەوتن بەسەر تەپۆلکەکاندا لەلای ناوەراستەوە لەحەوت دەقیقە زیاتری نەبرد...پێویستە بەتایبەت لەم جێیەدا هێڵێکی بەرگری دروست بکەین.
جواکین ئەوەی پێراگەیاندم کە مارکۆس بەهۆی ئەو سەرنجەوە کە سەبارەت هەڵەوچەوتییەکانی ئەو لەکۆبوونەوەی پێشوودا خستمەڕوو زویر بووە.
پێویستە دەربارەی ئەو بابەتە قسەی لەتەکدا بکەم.

## 13ی کانونی دووەم

قسەم لەتەك ماركۆسدا كردو گلەیی ئەوەی کرد کە بەبەرچاوی بۆلیڤییەکانەوە سەرزەنشت کراوە..ئەو بەهانەیەی کە هاوردییەوە سست بوو و هیچ شتێکی تایبەت نەبوو جێی سەرنج بێت تەنها بارە سۆزدارییەکەی نەبێت کە شیاوی رەچاوکردنە.
مارکۆس هێمای بۆ هەندێك لەو واژەگەلە سوکانە کرد کە ئالیخاندرۆ دەرهەق بەو کردونی و منیش لەتەك ئالیخاندرۆدا لەراستیی مەسەلەکەم کۆڵییەوەو دەرکەوت کە ئەو قسانە بێ بناغەن و هەموو ئەو شتەی کە روویداوە لەهەندێك گاڵتەوگەپ تێناپەڕێت. ئیدی مارکۆس کەمێك هێمن بووەوە.
ئانتی ومۆرۆ بۆ راو دەرچوون بەڵام بەدەستی خاڵیی هاتنەوە.
هەندێکیان دەرچوون بۆ هەڵکەندنی ئەشکەوتێك لەو جێیەدا کە هێستر بتوانێت بیگاتێ...بەڵام پرۆژەکە سەرنەکەوت و لەجیاتی ئەوە کوختێکی بچوکمان لەقوڕ دروستکرد.

ئالیخاندرۆوپۆمبۆ لێکۆڵینەوەیەکیان دەربارەی هۆکارەکانی بەرگری لەو دەروازەیەی کە دەچێتەوە سەر خێوەتگەکە کردو هێماگەلیان دانا بۆ هەڵکەندنی خەنەکگەڵو سبەی درێژە بە کارەکەیان دەدەن.
رۆبیۆوئابۆلینار هاتنەوەو، برۆلیۆوپاچۆ بەرەو خێوەتگە کۆنەکە رۆیشتن.
لۆرۆ هیچ دەنگوباسێکی نییە.

## 14ی کانونی دووەم

مارکۆس لەتەك گروپەکەیدا تەنها بینینیوۆی لێبترازێت، بەمەبەستی دروستکردنی کوختە قوڕینەکە لە رووبارەکە پەڕییەوە..دەبوو ئێوارە بگەڕێتەوە بەڵام لەتاو باران کارەکەی تەواو نەکردو لەنیوەرۆدا گەڕایەوە.
سەرکردایەتی ئەو گروپە کە هەڵکەندنی خەنەکەکەی خرابووە ئەستۆ بەجواکین سپێردرا. منو مۆرۆوئانتیوئۆربانۆ بۆ لێدانی رێیەك دەرچووین کە لەقەدپاڵی لای راستی جۆگەکەوە دەوری بنکەکەمانی داوە بەڵام ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە ئاراستەکەمان چەوتوچەوێڵ بووە ئیدی ناچاربووین رێی سەرەولێژییگەلێکی سەخت وەبەربگرین. لەنیوەرۆشدا باران باریو بەو هۆیەشەوە هەموو کارەکانمان دواخرا.
لۆرۆ هیچ هەواڵێکی نییە.

## 15ی کانونی دووەم

بەنیازی نووسینی هەندێك رێنمایی بۆ ئەندامەکانمان لەنێو شاردا، لەخێوەتگەکەدا مامەوە. لەبەرئەوەی رۆژی یەکشەممەش بوو هەربۆیە دوای نیوەرۆ ئیشوکارەکان راوەستان: بەیانییەکەی مارکۆس لەتەك گروپەکەیدا سەرگەرمی سازکردنی کوختەکە بوونو پاسەوانانیش لە بەری دواوەو ناوەراست خەریکی هەڵکەندنی خەنەکگەل بوونو،

ریکـاردۆوئۆربـانۆوئـانتۆنیۆ ئـەرکی چـاککردنی ڕێگاکـەی دوێنێیـان لەئەستۆگرت بەڵام لەهەڵکەندنەکەیاندا گەیشتنە لێژاییەکی سەختی بەردین لەنێوان ئەو تەپۆلکەیەی کە دەچێتەوە سەر رووبارەکەو قەدپاڵی تەپۆلکەکە ئیـدی لەتەقەللایانـدا سـەرکەوتونەبوون. سـەردانی خێوەتگـە کۆنەکـەمان نەکرد.

ئیشـکردن لەهەڵکەنـدنی خەنەکەکـەدا بـەردەوام بـوو، لەولاشـەوە مـارکۆس خـــەریکبوو لــــە دروســـتکردنی کـــوختێکی دڵــــڕفێن تــــەواو دەبــــوو. پزیشکەکەوکارلۆس شوێنی برۆلیۆوپیدرۆیان گرتەوەو دواتر برۆلیۆوپیدرۆ هـــاتن ئـــەوەیان پێراگەیانـــدین کـــە لـــۆرۆ لەســـەفەرەکەی گەڕاوەتـــەوەو هێسترەکانیشی لەتەکدایە بـەڵام، ئەگەرچی ئانیسیتۆش چووە بەپیرییـەوە، هێشتا دیارنییە.

هەندێك لەنیشانەکانی مەلاریا لەئالیخاندرۆدا دەرکەوت.

## 17ی کانونی دووەم

ڕۆژێکـی تارادەیـەك هـێمنو ئارامـە...ئیشـکردن لـەنێو خەنەکـەکانی هێڵـی یەکەمو هەروەها لە کوختە قوڕینەکەشدا لێبووەوە.

لـۆرۆ هـات بـۆ ئـەوەی ڕاپۆرتێـك دەربـارەی گەشـتەکەی پێشـکەش بکـات. سـەروەختێك سـەبارەت ئـەو هۆیانـە کـە وایـان لێکـرد سـەفەر بکـات پرسـیارم لێکرد بەوە وەڵامـی دامـەوە کـە ئـەو ئـەم گەشـتەی بـە کرۆکـی نەخشـەکانمان تەماشـاکردووەو، دواتـر دانـی نـا بـەوەدا کـە بەمەبەسـتی چـاوپێکەوتنی ئافرەتێـك لەوێنـدەر کـە دەیناسـێت ئـەو گەشـتەی کـردووە. لەتـەك خۆیـدا جڵەوی بۆ هێسترەکان هاوردووە بەڵام نەیتوانی بەنێو رووبارەکەدا ڕێیان پێ بکات.

کۆکۆ هیچ هەواڵێکی نییە...ئەمەش مایەی نیگەرانییە.

# 18ی کانونی دووەم

ئاسمان هەورەو هەر ئەمەش هانیدام پشکنینی خەنەکەکان، کە خۆم ئەنجامی دەدەم، دوابخەم. ئۆربانۆوناتۆو(مۆرۆ)ی پزیشك وئانتی وئانیسیتۆوبرۆلیۆ سواری(گوندۆلا)کە بوونو، ئالیخاندرۆش بەهۆی نەخۆشییەوە داوای کرد لەئیشکردن بیبورن.

باران بەلێزمە دەستی بەبارین کردو لۆرۆ بەو بارانە بەخوڕە هات بۆ ئەوەی ئەوەمان پێرابگەیێنێت کە ئارگاناراز قسەی لەتەك ئانتۆنیۆدا کردووەو وا دەردەکەوت کە ئاگاداری مەبەستگەلی زۆر کاروبارە... پێشنیاری ئەوەی کرد کە لەبازرگانیکردن بەکۆکایین یان هەر کارێکی دیکەدا هاوکاریمان بکاتو، بەو هۆیەشەوە هێمای بۆ ئەوە دەکرد کە هەست دەکات شتێکی نائاسایی لەمەسەلەکەدا هەیە. فەرمانم دا بەلۆرۆ کە پەیمانی لەتەکدا ببەستێت بێئەوەی گفتی هیچ شتێکی پێبدات تەنها پێدانی بریتی ئەو پێویستییانە نەبێت کە بەهۆی ئۆتۆمبیلە جیپەکەیەوە بۆمانی دەهێنێت، هەروەها هەڕەشەی ئەوەشی لێبکات کە ئەگەر هەر جۆرە ناپاکییەکی لێبوەشێتەوە دەیکوژین. دواتر لۆرۆ دەسبەجێ و لەژێر لێزمەی باراندا و لەترسی بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی رووبارەکە لای ئێمەی جێهێشتو دەرچووە دەرەوە.

لەکاتژمێر هەشتدا(گوندۆلا)کە نەگەڕایەوەو، ئەو خواردنەی کە بۆ نەفەرەکانی تەرخانکرابوو بەسەر ئامادەبوواندا دابەش کراو ئەوانیش هەرخێرا خواردیان. دوای ئەوە بەچەند دەقیقەیەك برۆلیۆوناتۆ هاتنو ئەوەیان پێگوتین کە گۆمی باراناو پەکی خستوونو ئانتیش کەوتووەتە نێو ئاوەوەو تەفەنگەکەی لێ کەوتووەو کەمێك گیانی کوتراوە. هەرچی ئەوانی دیکەشە بڕیاریاندا شەو لەوێندەر بکەنەوە.

# 19ی کانونی دووەم

وەکی هەموو رۆژەکانی دی، ئەمڕۆکەش بەئیشوکارەکانی پاڵپێوەنان و چاککردنی خێوەتگەکە دەستپێکرد. میگیل دوچاری تایەکی زۆر توندبوو، نیشانەکان هەموو ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە نیشانەگەلی نەخۆشیی مەلاریان. منیش لای خۆمەوە بەدرێژایی رۆژ هەستم بە لەرز کرد بەڵام نەخۆشیی داینەگرتم.

ئەوچوار پیاوەی کە دوێنێ دواکەوتن لەدەوروبەری کاتژمێر هەشتی بەیانیدا گەیشتن و برێکی زۆر لەگەنمەشامییان پێبوو...شەویان لەدەوری ئاگرێك بەسەربردبوو کە بۆ خۆ گەرمکردنەوە پەییان کردبوو. تاوەکو ئاستی ئاوی رووبارەکە دانەبەزێت تفەنگەکەمان بۆ نادۆزرێتەوە.

لەدەوروبەری کاتژمێر چواری دوای نیوەرۆداو سەروەختێك رۆبیۆوپیدرۆ بۆ ئەوە دەرچوون کە شوێنی دوو پاسەوانەکەی دی بگرنەوە لەپاسەوانیکردنی خێوەتگەکەی دیکەدا، پزیشکەکە هات و ئەوەی پێراگەیاندین کە پیاوانی پۆلیس گەیشتوونەتە خێوەتگەی ناوبراو. فێرناندیز کە مولازمی یەکە بەهاوڕێیەتی چوار لەپیاوانی پۆلیس لەبەرگی مەدەنی و بەسواری ئۆتۆمبیلێکی جیپ کە بۆ گەڕان بەشوێن کارگەی کۆکاییندا بەکرێیان گرتبوو گەیشتن و کوختەکەیان پشکنی و هەندێك شتی سەیروناموٚی نێو کوختەکە لەنموونەی پەپکەی سوتەمەنی وشك(یاخود باروت. و.ك)کە بۆ داگیرساندن و پەیکردنی چراکانمان بەکاریدەهێنین و ... لە نێوئەشکەوتەکەدا نەمانشاردبووەوە، سەرنجی راکێشان. دەمانچەکەشیان لەلۆرۆ سەند بەڵام تفەنگی مۆزەرەکە، عەیاری22، بۆیان بەجێهێشت و لەبەردەم لۆرۆشدا بەو جۆرە خۆیان پیشاندا کە تفەنگە عەیار22ەکەی ئارگانارازیش لەناوبراو دەسێنن بەڵام دواتر دوای ئەوەی کە هۆشداریی

ئەوەیانـدا کـە ئاگـاداری هـەموو شـتێکن و چـاودێری ئـەوە دەکـەن کـە لێـرە دەگوزەرێت، تفەنگەکەیان دابووەوە پێی. مولازمی یەك فێرنانـدیز بەلـۆرۆی وتبوو کە دەتوانێت لـەکامیری و"بـێ قـرە، بـەو مەرجـەی کـە قسـەی لەتەکدا بکـات" دەمانچـەکەی وەربگرێتـەوە، ئـەوجا هـەوالی(بـەرازیلی)ەکـەی پرسیبوو.

رێنمـایی ئـەوە درا بـەلـۆرۆ کـە هەرەشـە لەراوچـی ڤالیـێ گرانـدی و هـەروەها ئارگاناراز بکات کە گومان دەکرێت کاری سیخوڕییان کردبێت و خەبەریان دابێت. هاوکات داوای ئەوەی لێکرا بەبیانوی وەرگرتنەوەی دەمانچە دەست بەسـەرداگیراوەکەی بچـێت بـۆ کـامیری و لەوێنـدەر پەیوەنـدی بـەکۆکـۆوە بکات(دەترسم دەستگیر کرابێت و توندی بەندیخانە کرابێت).

دەبێت درێژترین ماوە کە لەتوانادابێت لەنێو دارستانەکاندا بمێنینەوە.

## 20ی کانونی دووەم

بنکـەکانم بەسـەرکردەوەو فەرمانگـەلم دەرکـرد بـۆ جێبـەجێکردنی ئـەو رێ وشـوێنی بەرگرییـە کـە شـەوی رابـوردو قسـەی لەسـەرکراو شـیکرایەوە. نەخشەکە بەو جۆرەیە کە بەرگری خێرا لەناوچەیەکی تەنیشت رووبارەکە بکرێـت بەمـەرجی ئـەوەی پیـاوانی پێشـڕەو کـە پێگـەو بنکەگـەلی خۆیـان لەرێگەلێك لەتەنیشت رووبارەکەوە کە بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە، وەرگرتووە، دژە هێرشێك ئەنجام بدەن.

نیازمان وا بوو چەندین مەشقگەل بکەین بەلام پاش ئەوەی پیاوێکی نامۆ بەناوچەکە دەرکەوت و چەند گوللەیەکی بەتفەنگەکەی لەجۆری م ـ 2 تەقاند، هەلومـەرج لەخێوەتگەکـە رووی لـەخراپی کـرد. دواتـر دەرکـەوت ئـەو پیـاوە(هـاورێی)ئارگانـارازەو بەمەبەسـتی ئـەوە هـاتووە کـە دە رۆژ لەکوختەکـەی نـاوبراودا بەسـەرببات. بڕیـاری ئەوەمانـدا پاڵپشـتیی

گرووپـەکانی پشـکنین بکـەین و خێوەتگەکـەش بـۆ تەنیشـت کوختەکـەی ئارگانـاراز بگوێزینـەوە بـۆ ئـەوەی ئەگـەر هـەر رووداوێکـی چاوەڕواننەکراو روویدا پێش ئەوەی ناوچەکە چۆڵ بکەین بتوانین حیسابی خۆمانی لەتەکدا یەکلایی بکەینەوە.

هێشتامیگیل گیرۆدەی تایەکی توندە.

## 21ی کانونی دووەم

مەشقمان لەسەر شـەڕێکی وەهمیـی کـرد، بەشـێوەیەکی گشـتی مەشـقێکی سـەرکەوتوبوو ئەگەرچـی لەهەنـدێك رووەوە شکستیشـی هـاورد، رەنگـە لاوازتـرین لایـەنی نەخشـەکەش پرۆسـەی کشـانەوەکە بووبێـت کـە پێویسـتە گرنگی زیاتری پێبدەین.

لەدواییـدا گرووپـەکان دەرچـوونە دەرەوە: گرووپـی یەکـەم بەسـەرۆکایەتی برۆلیـۆ بـوو کـە ئـەرکی پشـکنینی رێگایـەکی تەنیشـت رووبارەکـە بـەرەو خۆرئاوای پـێ سـپێردرابوو، گرووپـی دووەمـیش بـە رابـەریی رۆلانـدۆبوو کـە ئەمیش هەر هەمان ئـەرکی خرابووە ئەستۆ بـەڵام رووەوخۆرهـەڵات. هەرچـی پاچـۆیـە رووەو تەپۆلکـە رووتەنەکـە بەرێکـەوت بـۆ ئـەوەی ئـامێری پەیوەندییەکە تاقیبکاتەوە، مارکۆس‌یش لەتەك ئانیسیتۆدا بۆ دۆزینـەوەی رێرەوێـك بەرێکـەوت کـە بتوانرێـت لەرێگایـەوە بەباشـی چـاودێریی ئارگانـارازبکرێـت. بـۆ گەڕانـەوەی هـەمووان تـەنها مـارکۆس‌ی لێبترازێـت کاتژمێر دوو دەستنیشـانکرا...دواجار ئەرکە داواکراوەکـان جێبەجێکران و تاقیکردنەوەگەلی پەخشەکەش جێی رەزامەندی بوو. مارکۆس زوو گەڕایەوە چونکە باران دەرفەتی بینینی نەدا.

پیدرۆ بەو لێزمەی بارانە هاتەوەو کۆکـۆو سـێ ئەنـدامی نـوێی لەتـەك خۆیـدا هاورد کە ئەوانیش بریتی بوون لە: بینجامین وئۆسیبیۆ ووالتەر. یەکەمینیان

كه كوباییه پەیوەندی بەپێشڕەوی گروپەكەوە دەكات چونكه دەربارەی بەكارهێنانی چەك شارەزایه، هەرچی دووانەكەی تریشیانە بۆ پاسەوانیی بەشی دواوە جیادەكرێنەوە. مۆنجه قسەی لەتەك سێ پیاو كه لەكوباوە هاتوون كردو ویستی بەوە قایلیان بكات كه پەیوەندیمان پێوە نەكەن. ناوبراو هەر بە وازنەهێنان لەسەركردایەتی حیزب بەسی نەكرد بەڵكو بەڵگەنامەی د/4 ی هاوپێچیشی رەوانەی فیدڵ كرد. لەرێی تانیاوە یاداشتێكم سەبارەت سەفەرەكەی خۆیو نەخۆشییەكەی ئیڤان بەدەست راگەیشتووە، هەروەها یاداشتێكی دیكەش د/5 م لەئیڤانەوە بەدەست راگەیشتووە كه بەڵگەنامەی هاوپێچە.

شەوێ هەموو هاورێیانم كۆكردەوەو بەڵگەنامەكەم بۆ خوێندنەوەو هێمام بۆ ئەو چەوتییانە كرد كه لەخاڵەكانی اوب دا هەنو، هەروەها هەندێك رەخنەی بچوكیشم گرت. پێدەچێت هەڵوێستەكەی منیان بەباشی وەرگرتبێت. دووان لەخۆبەخشان لە سێ خۆبەخشە تازەكە پێدەچێت خۆراگرو هۆشیاربن..بچوكەكەشیان جوتیارێكی ناوچەی ئیمارایەو كەسێكی خاوەن لەشولارێكی تەندروستو تۆكمەیە.

## 22ی كانونی دووەم

(گوندۆلا)كه دەرچوو و، وێڕای برۆلیۆووالتەر كه شوێنی پیدرۆورۆبیۆ دەگرنەوە، 13پیاوی لەسەربوو. هەموویان دوای نیوەرۆ هاتنەوە بێئەوەی بتوانن سەرجەم پێویستییەكان بهێنن. لەوێندەر هەموو شتێك ئارامە. رۆبیۆ لەرێگای گەڕانەوەیدا بەتوندی كەوتبوو و پێكرابوو بەڵام پێكانەكەی مەترسیدار نییە.

بەڵگەنامەی ژمارە3م بۆ فیدڵ نووسی بۆ ئەوەی راستیی بارودۆخەكەی بۆ شیبكەمەوەو بەو هۆیەشەوە سندوقی نامەكان تاقیدەكەمەوە. دەبێت

لــەرێگای گیڤــاراوە کــە یەکێکــە لەخۆبەخشــە بۆلیڤییــەکان، ئەگــەر لــە بیست وپێنجی مانگ و لەو وادەیەدا کە دانراوە هات بۆ کامیری، یاداشتەکە رەوانەی لاپاز بکەم.

ئەمێســـــتا مـــــن رێنماییـــــە نووســـــراوەکان بـــــۆ ئەندامـــــەکانمان لەشاردا(بەڵگەنامەی د/3)ئامادە دەکەم. بەهۆی دەرچوونی(گوندۆلا)کەوە جموجوڵ و چالاکیی لەخێوەتگەکەدا کەم و ئاستەم بوو. میگیل خەریکە چاکدەبێتەوە بەڵام کارلۆس یش تایەکی زۆر گەرمی لێهاتووە. ئەمڕۆکە تاقیکردنەوەگەلی سیلمان ئەنجامداو دوو تاوسی کێویشمان راوکردو، ئاژەڵێکی بچوکیش بوو بە تەپکەکەوە بەڵام لاقی قرتابوو و بەو هۆیەشەوە دەربازی بوو بوو.

## 23ی کانونی دووەم

ئیشوکارەکانی نێو خێوەتگەکەو هەروەها هەندێك پشکنینیشمان دابەشکرد کە پێویستە ئەنجامبدرێن. ئانتی ورۆلاندۆ وئارتۆرۆ بۆ سۆراخی جێیەك دەرچوون کە بەکەڵکی ئەوە بێت بکرێتە حەشارگە بۆ پزیشکەکەو زامدارێك. من ومارکۆس وئۆربانۆ بۆ پشکنینی تەپۆلکەکەی بەرامبەرمان و هەڵبژاردنی شوێنێك لەوێندەر کە بشێت لەرێگایەوە چاودێریی کوختەکەی ئارگاناراز بکرێت دەرچووین و...ئەو شوێنەی کە ویستمان دەستگیرمان بوو و بەتەواوی بەسەر جێی مەبەستدا دەڕوانێت.

کارلۆس هێشتا گیانی گەرمە: نەخۆشیی مەلاریایەتی.

## 24ی کانونی دووەم

(گوندۆلا)کە بەحەوت پیاوەوە دەرچوو و، دوای ماوەیەکی کەم بە باری پێویستیی و گەنمەشامییەوە گەڕایەوە...ئەمجارە جواکین کەوتە نێو

ئاوەوەو تەفەنگەکەی لەجۆری (گاران) کەوتە ئاوەکەوە بەلام دەسبەجێ دەریهێنایەوە. لۆرۆ هاتەوەو ئەمێستا ئەوەتا لەحەشارگەکە. کۆکۆوئانتۆنیۆ تائێستا لەدەرەوەن و دەبێت سبەینێ یاخود دوو سبەی بگەڕێنەوەو گیڤاراشیان لەتەکدا بێت.

ڕێگایەکمان چاککرد بۆ بەکارهێنانی لەگەماڕۆدانی سەربازانی دوژمندا ئەگەر بارودۆخ ناچاری کردین بەرگری لە پێگەکەمان بکەین. لەئێوارەدا ئەو مەشقە شێکرایەوە کە ئەو ڕۆژە کردمان شانبەشانی ئەوە هەڵەو چەوتییەکانیشمان ڕاستکردەوە.

## 25ی کانونی دووەم

لەتەك مارتۆس‌دا بۆ پشکنینی ڕێگایەك کە بەرەو دواوەی هێرشبەران دەچێت دەرچووین و.. گەیشتنمان بۆ ئەوێندەر نزیکەی کاتژمێرێکی خایاند بەلام شوێنێکی نایاب بوو.

ئانیسیتۆوبینجامین بۆ تاقیکردنەوەی ئامێری پەخشەکە لەبەرزترین شوێنی ئەو تەپۆلکەیەدا کە بەسەر کوختەکەی ئارگاناراز‌دا دەڕوانێت دەرچوون بەلام ڕێیەکەیان لێ هەڵەبوو و نەیانتوانی تاقیکردنەوەکان ئەنجام بدەن هەربۆیە دەبێت جارێکی دی هەوڵبدرێتەوە. دەستمانکرد بەهەڵکەندنی ئەشکەوتێکی دیکە بۆ پاراستنی پێویستییە کەسییەکان. لۆرۆ هات پەیوەندی بەپێشرەوەوە کردو قسەی لەتەك ئارگاناراز‌دا کردو ئەو شتانەی پێراگەیاند کە پێشان هێمام بۆ کرد. ئارگانارازیش پێی لەوە نابوو کە پیاوی ڤالیێ گراندی ڕەوانەکردووە بۆ ئەوەی سیخوڕیی بەسەر ئێمەوە بکات بەلام وتی من لای پۆلیس خەبەرم نەداوە. کۆکۆ ڕاوچییەکەی لەکوختەکەی دەرکرد چونکە ئارگاناراز ناردویەتی بۆ سیخوڕیی. لەمانێلاوە نامەیەکمان بەدەست ڕاگەیشتووە لەدوتوێیدا ئەوە هاتووە کە زۆر بەباشی

هـەموو شـتـەکانیان بەدەسـت گەیشـتووەو کـۆڵیـش لەرێگادایـە بـەرەو لای سـیمۆن ریـس تـاوەکو چـاوپێکەوتنی لەتەکـدا بکـات. فیـدڵ ئـەوەی پێراگەیانـدین کـە گـوێ بـۆ قسـەکانیان شـل دەکـات و لەتەکیشـیاندا تونـد دەبێت.

## 26ی کانونی دووەم

هێشتا دەستمان بەکارکردن لەئەشکەوتی دووەمدا نەکردبوو هـەواڵی هـاتنی گیڤاراولۆیـۆلامـان پێراگەیشـت، ئیـدی بـەرەو کوختـە بچوکەکە کـە تایبەتـە بەخێوەتگەکـەی ناوەراسـت بەرێکـەوتین و لەوێنـدەر لەوەتـەی نیـوەرۆوە چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد.

ئەم مەرجانـەی خـۆم پێشچاوی گیڤاراخست: هەڵوەشـاندنەوەی گروپـەکـە، پۆست وپایە بەکـەس نادرێت، لەمـەودوا هـیچ رێکخراوێکـی سیاسـی نابێت بمێنێت، پێداویسـتیی خـۆلادان لەمشـتومڕی تونـد سـەبارەت کێشمەکێشـە دەوڵەتی ونیشتمانییەکان. ئەویش بەوپـەڕی سـادەییەوە هـەموو مەرجـەکانی پەسـەندکردو بـەمجۆرە پەیوەنـدی لەتـەك بۆلیڤییەکانـدا کـە لەسـەرەتادا ساردوسڕبوو بووە پەیوەندییەکی گەرم ودۆستانە.

لۆیۆلا سەرنجمی زۆر راکێشا..کیژێکی گەنج و ناسکەو دەکرێت چاوەڕوانی تواناییەکی بەهێزی لێ بکەین. خەریکە لەیەکێتی لاوان دەردەکرێت ئەگەرچی لەتەقـەللای ئـەوەدابوون ناچـاری بکـەن دەسـت لـەکار بکێشـێتەوە. ئـەو رێنماییانەم پێدا کە وابەستەی ئەندامەکانەو بەڵگەنامەیـەکی دیکەشـم پێدا، هەروەها ئەو پارەیەشم دایـەوە پێـی کـە خـەرجی کردبوو و بڕەکـەی70000 پیـزۆس بوو، چونکە ئـەو پارەیـە ئەمێسـتا هەمانـە ئەوەنـدە نییـە کـە بەشـی خۆمان بکات. دکتۆر باریجا دەکرێتە سەرۆکی تۆڕی پەیوەندیو رۆدۆڵفۆش لـەماوەی15 رۆژدا پەیوەنـدیمان پێـوە دەکـات. نامەیـەکم رەوانـەی ئیڤـان

کرد(د/6) لەدوتوێیدا ڕێنماییەکانم هەیە. فەرمانم دا بەکۆکۆ ئۆتۆمبیلی جیپەکە بفرۆشێت بەو مەرجەی کە پەیوەندی بەکێڵگەکەوە مسۆگەر بکات.
لەدەوروبەری کاتژمێر حەوتدا...واتە هەر لەگەڵ شەو داهات، ماڵئاواییمان لێکردن. سبەی ئێوارە سەفەر دەکەن و گیڤاراش لەتەك یەکەمین گروپی چوار کەسییدا لەچواردەی شوباتدا دەگەڕێتەوە...دواتر وتی بەهۆی ڕێگاوبانەوە ناتوانم پێش ئەو بەروارە بگەڕێمەوەو لەکاتی ئێستاشدا بەهۆی جەڕنەکانەوە ناتوانم هیچ شتێك لەپیاوەکان هەڵبهێنجم.
بەم زووانە ئامێرگەلی پەخشی زۆر بەهێزتر لەو ئامێرانەمان بەدەست رادەگات کە خۆمان هەمانە.

## 27ی کانونی دووەم

(گوندۆلا)یەکی بەهێزمان ڕەوانەکرد بۆ ئەوەی هەموو شتێك لەتەك خۆیدا بهێنێتەوە...بەڵام هێشتا هەندێك لەپێویستییەکان هەر لەوێندەر ماون. کۆکی و پەیامبەران ناچاربوون لەشەودا جێمانبهێڵن...ئەوان لەکامیری دەمێننەوەو کۆکۆش دەچێت بۆ سانتاکروز بۆ ئەوەی لەدوای پانزەی مانگی شوباتەوە خەریکی کاری فرۆشتنی جیپەکە بێت.
دەستمان بەهەڵکەندنەوەی ئەشکەوتەکە کردو ئاژەڵی تاتۆکەش بوو بوو بەتەپکەکەوە..خەریکین لەسازکردنی ئازوخەی سەفەرەکە لێدەبینەوەو بڕیارە ئەم گەشتە لەدوای هاتنەوەی کۆکۆ دەست پێبکات.

## 28ی کانونی دووەم

هێشتا(گوندۆلا)کە خەریکی پاککردنەوەی خێوەتگە کۆنەکەیە. هاوڕێیان وتیان راوچی ڤالیێ گراندی بینراوە بەنێو کێڵگەی گەنمەشامییەکەدا

گەڕاوە بەڵام هەر کە ئێمەی بینیوە دەسبەجێ هەڵهاتووە...شتەکان هەموو هێما بۆ ئەوە دەکەن کە کاتی ئەوە هاتووە بڕیار دەربارەی کێڵگەکە بدرێت. ئەمێستا هەموو پێویستییەکانمان سەبارەت ئازوخە دابین کردو..توێشوی دە رۆژ رێکردنمان پێیەو بەرواری سەفەرەکەش خراوەتە رۆژێك یان دوو رۆژ دوای گەڕانەوەی کۆکۆ یاخود رۆژی دووی مانگی شوبات.

## 29ی کانونی دووەم

ئەمرۆکە رۆژێك بوو پیاوان هەموو،جگە لەچێشتلێنەران و راوچییان و پاسەوانان کە چوون بەلای کاری خۆیانەوە، لەسەیرانکردندا بەسەریانبرد. کۆکۆ لەدوای نیوەرۆدا گەڕایەوە...لەجیاتی سانتاکروز چوو بوو بۆ کامیری ولۆیۆلای رەوانەکردبوو بەسواری فرۆکە بەرەو لاپاز بەرێ بکەوێت و موازیس یش بەسواری پاس بەرەو(سوکر) بەرێکەوتبوو و، رۆژی یەکشەممە بۆ پەیوەندیگرتن دیاریکرا. بڕیاردرا لەیەکی مانگی شوباتدا سەفەربکرێت.

## 30ی کانونی دووەم

(گوندۆلا)کە 12پیاوی هەڵگرت و ئەمجارە زۆرترین بڕ لەئازوخەی گواستەوە...هێشتا بەشی پێنج پیاو بار لەوێندەر ماوە. راوچییەکان بەدەستی خاڵیی هاتنەوە.
هەڵکەندنی ئەو ئەشکەوتە کە بۆ شتگەلی کەسیی سازکراوە تەواوبوو...بەڵام باش و بەکەڵك نەبوو.

## 31ی کانونی دووەم

دوایین رۆژە لەخێوەتگەکەدا.(گوندۆلا)کە هەموو شتەکانی نێو خێوەتگە کۆنەکەی گواستەوەو پاسەوانەکانی ئەو ناوچەیە بانگکرانەوە.

ئانتۆنیۆوناتۆوکامبا وئارتۆرۆ بۆ جێبەجێکردنی ئەم ڕێنماییانەم مانەوە: لایەنی کەم هەموو سێ ڕۆژ جارێك پەیوەندیمان پێوەبگرن، مادامەکی چوار کەسیشن دوو کەسیان بەوپەڕی وریاییەوە کاری پاسەوانیی بکەن، هەرچی خۆبەخشە تازەکانیشە بەگوێرەی ئەو ڕێسا گشتییانەی کە کاریان پێدەکرێت مەشقیان پێبکرێت. بەمەرجێك ئەوەی کە زۆر پێویست نەبێت نەیزانن. هەروەها پێویستە خێوەتگەکە لەسەرجەم شتگەلە تایبەت وکەسییەکان پاکبکرێتەوەو چەکەکانیش، لەدوای پێچانەوەیان بەمەبەستی پاراستنیان لەشێ، لەجەنگەڵەکاندا بشاردرێنەوەو، یەکێکیشیان لەهەڵگرتنی هەمیشەی پارەوپول لەخێوەتگەکەدا بەرپرسیاربێت و، بەبەردەوامییش گەڕان بەمەبەستی پشکنینی ڕێگاو جۆگەکانیدەوروبەر ئەنجام بدرێت. .پێویستە دوو کەسیشیان، لەحاڵەتی کشانەوەی کتوپڕدا، ڕووبکەنە ئەشکەوتەکەی ئارتۆرۆ: ئانتۆنیۆوخودی ئارتۆرۆخۆی ئەو کارە بکەن، هەرچی ناتۆو کامباشە لەرێگای ڕووبارەکەوە دەکشێنەوەو یەکێکیان خێرا خۆی دەگەیێنێتە شوێنێك کە بۆ گەیاندنی هەواڵەکە دەستنیشان دەکرێت. بەڵام ئەگەر پیاوەکان ژمارەیان لەچوار زیاتربوو ئەو دەمە پێویستە یەکێك لەگروپەکان ئەرکی پاسەوانیکردنی ئەشکەوتی شتومەك و ئازوخەکان لەئەستۆبگرێت.

قسەم لەتەك هاوڕێیاندا کردو دوایین ڕێنماییەکانی خۆمم دەربارەی ڕێکردنە پێشچاوخستن و کۆکۆشم بەدوایین ڕێنماییەکانی خۆم(د/7) تەیارکرد.

# لێکدانەوەی مانگانە

وەك پێشبینیم کرد هەڵوێستی مۆنجە لەپێشدا لەنگ بوو دواتر بەرەو خیانەت و ناپاکیی ئاشکرا وەرچەرخا.

حیزب جاری شەرمان لەدژ دەدات و نازانم ئەمانە رووەو کوێ هەنگاوهەڵدەگرن و بە چ ئاقارێکدا دەڕۆن بەڵام نەك هەر نابنە رێگری سەر رێگامان بەڵکو رەنگە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژیش خزمەتمان بکەن و(لەم قسانەش دڵنیام کە دەیانکەم).

پیاوانی ئابڕومەندو جەنگاوەران پاڵپشتیمان دەکەن ئەگەرچی گیرۆدەی پەشیمانییەکی کەم و زۆریش دەبن.

گیڤارا تانیێستا بەباشی رەفتاری کردووەو لەداهاتووشدا بۆمان دەردەکەوێت هەڵسوکەوتی لەتەك پیاوەکانیدا چۆن دەبێت.

تانیا رۆیشت و هیچ دەنگوباسێکمان لەو و، لەئەرجەنتینەوە بەدەست رانەگەیشت. ئەمێستا قۆناغی جەنگی پارتیزانیی راستەقینە دەستپێدەکات و ئێمەش هێزگەلی خۆمان تاقیدەکەینەوەو تەنها سەردەم و رۆژگاریش زامنی دەرخستنی ئاکام و ئایندەی شۆڕشی بۆلیڤیا دەکات.

سازکردنی جەنگاوەرە بۆلیڤییەکان کاتێکی ئەوەندەی خایاند کە هەموو ئەرکەکانی دیکە ئەو کاتەی نەبرد.

## 1ی شوبات1967

قۆنـاغی یەکـەم کۆتاییهـاتو پیاوەکـان کـە کـەمێك مانـدوێتی شـەکەتی کردبـوون گەیشـتن بـەڵام کاروبـار بەشـێوەیەکی گشـتی بەباشـترین شـێوە ڕێیکـرد. ئـانتۆنیۆونـاتۆ بـۆ ڕێککـەوتن لەسـەر وشـەی نهێنـی دەرچـوونو کەلوپەلـەکانی منو کەلوپەلـەکانی مۆرۆ کـە خەریکـە لەنەخۆشـیی مـەلاریا چاکدەبێتەوە، داگرت.

ئـامێرێکی هۆشـداردکردنەوە(انـذار)مـان سـازکردو، خسـتمانە نێـو شوشەیەکەوەو لەژێر درەختێك لەگوێ ڕێگاکەوە دامانا.

هەرچی لە بەشی دواوەشە جواکێن دادوبێدادی ئەوەی بوو کە کەلوپەلەکانی قورسەو لەو بارەیەوە هەموو گرووپەکەی تێگەیاند.

## 2ی شوبات

ڕۆژێکـی پڕلەماندوێتیوخلیچـکە...پزیشـکەکە بـووە هـۆی دواکـەوتنی ڕێکردنەکـەو ڕێکردنەکـەش بەسروشـتی خـۆی خـاوبوو. لەکاتـژمێر چواردا گەیشتینە دواین شوێن ئاو و خێوەتگەکەمان لەو جێیـەدا هەڵدا. فەرمانمدا بەپێشڕەو ئەو ڕێگایە بپشکنن کە دەچێتەوە سەر ڕووبارەکە(ڕەنگە ڕووبـاری فریاس بێت)، بەڵام ئەوانیش دیسان هەر خاوەخاویـان کـرد. بەدرێژاییشـەو باران باری.

## 3ی شوبات

لەوەتـەی بـەیانی زووەوە بـاران بـاری ئیـدی بەناچـاری کـاتی دەرچـوونمان تـاوەکو کاتـژمێر هەشـت دواخسـت. سـەرەوەختێکیش دەسـتمان بـە ڕێکـردن کـرد ئانیسـیتۆ هـات گوریسـی لەتـەك خۆیـدا هـاوردبوو بەمەبەسـتی

پارمەتیـدانمان لـە ڕێـرەوە دژوارەکانـداو، ماوەیـەکی کـەم پـاش ئـەوە سەرلەنوێ باران بەلێزمە دەستیکردەوە بەبارین. لەکاتژمێر دەدا گەیشتینە رووبارەکەو جلوبەرگەکانمان هەمووی تەڕ بوو بوو ئیدی بڕیاری ئەوەماندا کە دەسبەجێ ڕابووەستین. بەدڵنیاییەوە ئەم رووبارە رووباری فریاس نییەو...لەنەخشەکەشدا نەهاتووە.

سبەی لەگەڵ یەکەم پرشنگی خۆردا پێشڕەوەکە لەتەك پاچۆدا دەڕوات و هەموو کاتژمێرێك پەیوەندییەك بەیەکدییەوە دەگرین.

## 4ی شوبات

لەبەیانییەوە تاوەکو کاتژمێر چواری دوای نیوەڕۆ ڕێمانکردو تەنها دوو کاتژمێر ڕاوەستاین بۆ خواردنی شۆربای نیوەڕۆ. ڕێگاکە بەرامبەر رووباری نانکاهوازووەو...تارادەیەکیش بەکەڵکە بەڵام پێڵاو دادەرزێنێت..هەنوکە هەندێك لەهاوڕێیانمان بەپێ خاوسی ڕێدەکەن.

مانـدوێتی بـاڵی بەسـەر گروپەکـەدا کێشـا بـەڵام هـەمووان ئامـادەگیی بەرگـەگرتنی شـەکەتییان دەربـڕی...نزیکـەی15 لیـبرە لەکێشـی لەشـم کـەمکردووەو ئەگەرچـی پشـت ئێشـەش هەنـدێکجار ئەوەنـدە بـەئازارە کـە تەحەممول ناکرێت بەڵام بەوپەڕی سوکەڵیی دەتوانم ڕێبکەم.

بەدرێژایی رووبارەکە هیچ شوێنەوارێکی نوێمان بەدی نەکرد کە هێمابێت بۆ ئەوەی پێش ئێمە خەڵکی دی لێرەوە گوزەریان کردووە...بەڵام، ئەگەر نەخشەکە ڕاستبێت، هەڵبەت ئەم تاو نا تاوێکی تر ڕێمان لەناوچەگەلی ئاوەدان دەکەوێت.

## 5ی شوبات

پێشـڕەوەکە بـەیانی ئـەمڕۆو لـەدوای پێـنج کاتـژمێر لـەڕێکردن (12ــ14کیلۆمـەتر) پێبڕاگەیانـدین کـە هەنـدێك ولاخیـان بینیـوە(دواتـر

دەرکەوت ئەو وڵاخانە مایینێك و جوانووەکەی بوو) ئەمەش بەلای ئێمەوە وەك رووداوێکی کتوپڕ وا بوو. ئەو دەمە ئێمەش راوەستاین و فەرمانم دەرکرد ناوچەکە بپشکنرێت. بۆ خۆلادان لە هەر شوێنێکی ئاوەدان. ئیدی لەبارەی زانینی ئەوەوە کە داخۆ ئەمێستا ئێمە لەناوچەی(تریبیتی)ین یاخود لەخاڵی بەیەکگەیشتنی چەم و زێیەکانی سالادیۆ بەو جۆرەی لەنەخشەکەدا هاتووە، مشتومڕێك لەنێوانماندا دروست بوو. پاچۆ هاتەوەو وتی رووبارێکی گەورەی زۆر لەرووباری نانکاهوازو گەورەترم دۆزیوەتەوەو ناتوانین خۆمانی لێبدەین و بپەڕینەوە. دەسبەجێ بەرەو ئەو شوێنە بەرێکەوتین و خۆمان لەبەردەم(ریۆ گراندی)ەکی راستەقینەدا بینییەوە..کە وێڕای ئەوە لێوانلێوبوو لەئاو. هەندێك لەو بەڵگانە هەن ئاماژە بۆ بوونی ژیان لەم ناوچەیەدا دەکەن بەلام شوێنەوارگەلی کۆن و دێرینن...سەرباری ئەوە رێگا وەبەرگیراوەکان لەنێو گژوگیا و رووەکەکاندا وندەبێت و لەوێندەر رادەوەستێت.

خێوەتگەیەکمان لەجێیەکی خراپ لەنزیك نانکاهوازووەوە بەمەبەستی کەڵك وەرگرتن لەئاوەکەی هەڵداو، بڕیاری ئەوەماندا سبەینێ بەیانی هەردوو بەری(خۆرهەلات وخۆرئاوای)رووبارەکە بپشکنین بۆ ئاشنابوون بەناوچەکانی دەوروبەری و، ئەرکی لێدان و پەڕینەوەشی بەگروپێکی دیکە سپێردرا.

## 6ی شوبات

رۆژێکی ئارامەو بۆ پشوودانمان تەرخانکرد. جواکین لەتەك واڵتەروپزیشکەکەدا بۆ پشکنینی ریۆ گراندی دەرچوون و شانبەشانی رێرەوەکەی رێیانکردو ماوەی هەشت کیلۆمەتریان بڕی و تاکە شوێنێکیان نەدۆزییەوە بەکەڵکی پەڕینەوە بێت...هەموو ئەو شتەی کە دۆزییانەوە جۆگەیەکی بچکۆلەبوو کە ئاوەکەی سوێربوو. مارکۆس کە هەریەکە

لــەئانیســیتۆولــۆرۆ هــاوڕێیبوون، بەناڕەحــەتی رووەو تــەوژمی ئاوەكــە پێشــڕەوییكردو نــەیتوانی بگاتــە فریــاس. ئالیخانــدرۆوئــانتیو پاچــۆ ویستیان بەمەلە لەرووبارەكە بپەڕنەوە بەڵام نەیانتوانی. ئێمەش ماوەی كیلۆمــەترێكو بەمەبەســتی دۆزینــەوەی شــوێنێكی باشــتر بــۆ هەڵــدانی خێوەتگەكــەمان گەڕاینــەوە دواوە. نیشــانەگەلی نەخۆشــیی لــەپۆمبــۆدا دەركەوت.

سبەی كەڵەكێك دروست دەكەین تاوەكو هەوڵبدەین بەهۆیەوە لەرووبارەكە بپەڕینەوە.

## 7ی شوبات

لەژێر سەرپەرشتی ماركۆسدا كەڵەكێكمان دروستكردو دەركەوت كە زۆر گەورەیەو ئاراستەكردنی لەنێو رووبارەكەدا دژوارە. لەكاتژمێر یەكونیودا بۆ شوێنی دیاریكراو بۆ پەڕینەوە گواستمانەوەو لەكاتژمێر دوونیودا پرۆسەی پەڕینەوە دەستپێیكرد. پێشڕەوەكە بەدوو سەفەر گواستییەوە بۆ بەری ئەوبەری رووبارەكەو لەسەفەری سێیەمدا نیوەی گروپە سەرەكییەكە گواسترایەوە، هەروەها جلوبەرگەكانیشم تەنها كەلوپەلەكانمی لێبترازێت هەموویان برانە ئەوبەر. كاتێك كەڵەكەكە بۆ گواستنەوەی پاشماوەی گروپە سەرەكییەكە گەڕایەوە...هاوسەنگیی رۆیبۆ تێكچوو. ئیدی رووبارەكە كەڵەكەكەی بەئاراستەی خواروودا بردو گەڕاندنەوەی بووە ئەستەمو هێندەی نەبرد تێكشكاو جواكین ناچاربوو كەڵەكێكی دی دروست بكاتو تەنها لەكاتژمێر نۆی شەودا لەدروستكردنی تەواوبوو. لەبەر خۆشكردنەوەی بارانو نزمبوونەوەی ئاستی ئاوی رووبارەكە پرۆسەی پەڕینەوەمان بۆ سبەینێ دواخست...لەگروپە سەرەكییەكە تەنها تۆماو ئۆربانۆوئانتیوئالیخاندرۆومن ماوینەتەوە. منوتۆما لەسەر ئەرزەكە لێیخەوتین.

## 10ی شوبات

بەمەبەستی قسەکردن لەتەك جوتیارەکاندا دەرچووم و خۆم وەکی یاریدەدەری ئانتی بەجوتیارەکان ناساند...بڕواناکەم توانیبێتمان رۆڵەکە بنوێنین بەتایبەت دوای ئەوەی کە دەرکەوت ئانتی زۆر شەرمنە. لەتەك جوتیارێکی رەسەندا قسەم ئاڵوگۆڕکرد کە توانای یارمەتیدانمانیهەیە بەڵام لەبەرئەوەی ناتوانێت دەرکی ئەو مەترسییانە بکات کە بەهۆی ئەو یارمەتییەوە دوچاری دەبێت، مایەی مەترسییە بۆ سەرمان. بڕێك زانیاری وابەستە بەژیانی جوتیارانمان دەستکەوت و بەهۆی ترسیشی لەئێمە لەدەستگیربوونی زانیاریگەلی وردودروستدا سەرکەوتوونەبووین.

پزیشکەکە منداڵە نەخۆشەکانی چارەسەرکرد، یەکێك لەمنداڵەکان کرمی هەبوو و یەکێکی دیکەش مایین لەقەی لێدابوو. دواتر لێماندا و رۆیشتین.

دوای نیوەرۆ و ئێوارەمان لەسازکردنی نانی گەنمەشامیدا بەسەربرد(بەڵام من بەدڵم نەبوو). ئێوارە بەئامادەبوونی سەرجەم هاوڕێیان چەند سەرنجێکم دەربارەی دە رۆژی داهاتوو خستەروو. نیازم وایە ماوەی دە رۆژی دی بەئاراستەی مازیکۆری و بەجۆرێك رێبکەین کە هاوڕێیان بتوانن لەنزیکەوە سەربازەکان ببینن و دواتر هەوڵدەدەین لەرێگای فریاسەوە بۆ دۆزینەوەی رێگایەکی دی بگەڕێینەوە.

(جوتیارەکە ناوی رۆیاس)ە.

## 11ی شوبات

جەژنی 67ی لەدایکبوونی پیرەمێردەکە.

رێگایەکی دیارمان لەتەنیشتی رووبارەکەوە وەبەرگرت و پاش ماوەیەك رێکردن رێگاکە داخراو ناوبەناویش ون دەبوو ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە

لەمێژە رێبواران پیایدا گوزەریان نەکردووە. لەنیوەرۆدا گەیشتینە جێیەکی تەواو بنبەست و نزیك لەرووبارێکی گەورەو دەسبەجێ پرسیاری ئەوەمان لەخۆمان کرد کە داخۆ ئەمە رووباری مازیکۆری‌یە یان نا. لەنزیك جۆگەیەکەوە لاماندا و هەریەك لەمارکۆس و میگیل بۆ پشکنینی رووبارەکەو ئانتی و کارلۆس‌یش بۆ لای خوارووەکەی و پشکنینی رێژگەکەی دەرچوون. بەمجۆرە بۆمان دەرکەوت کە ئەمە رووباری مازیکۆری‌یەو پێدەچێت یەکەمین خاڵی پەڕینەوەشی لەجێیەکی دورتردابێت، لەوێندەر هەندێك لەجوتیاران بەسواری ئەسپەکانیانەوە بینران. لایەنی زۆر شوێنەوارەکانی ئێمەیان بینیوەو ئەمەش داوای ئەوپەڕی وریابوونمان لێدەکات.

ئەگەر جوتیارەکە راست بکات، ماوەی کاتژمێرێك یاخود دوو کاتژمێر رێکردن لەئارینالەوە دوورین.

بەرزایی: 760.

## 12ی شوبات

بەخێرایی ئەو دوو کیلۆمەترەمان بڕی کە دوێنێ پێشڕەوەکە بڕینی و... ئەو دەمە پەیتاپەیتا شوێنەواری رێگاکە رۆشن بووەوەو... لەکاتژمێر چواری دوای نیوەرۆداو بەرێگایەکی راستەقینە راگەیشتین پێدەچێت ئەو رێگایەبێت کە هەوڵی دۆزینەوەی دەدەین. لەبەری ئەوبەری رووبارەکەو کتومت لەبەرامبەرماندا کوختێکمان بینی بەڵام گوێمان پێنەداو بەشوێن کوختێکی تر لەمبەری رووبارەکەوە گەڕاین کە جوتیارێك خاوەنێتی ناوی مۆنتانۆیەو پێشان رۆیاس ناونیشانی بۆ هەڵدابووین. ئانتی و لۆرۆ بەرەو ئەوێندەر بەرێکەوتن بەڵام کەسیان تیادا بەدی نەکرد ئەگەرچی بەڵگەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ئەو خانووەیە کە ئێمە سۆراخی دەکەین.

لەکاتــژمێر حــەوت‌ونیودا بەمەبەســتی ئەنجامــدانی گــەڕانێکی شــەوانە دەرچووین‌و لەماوەی گەشتەکەدا بەسەرجەم ئەو زانیارییانە تەیاربووین کە پێشان لەبارەیانەوە هەژاربووین. ئانتی‌و لۆرۆ لەدەوروبەری کاتژمێر دەدا هاتنەوەو دەنگوباسی ناخۆشیان پێ‌بوو! پیاوەکە سەرخۆش بوو و ئەو پێشوازییەش کە کردبونی دۆستانە نەبوو و...هیچی تریشیان لەلای دەستگیرنەبوو تەنها گەنمەشامی نەبێت. لای کابالیرۆ کە لەبەری ئەوبەری رووبارەکە نیشتەجێیە خواردبوویەوەو مەست بوو بوو، بەمجۆرە خاڵی پەڕینەوەکە دوورنەبوو، بڕیارماندا شەو لەدارستانێکی بچکۆلە کە لەو ناوچەیەوە نزیکە بەسەربەرین...من ئێجگار ماندوبووم چونکە پێشتر نانی گەنمەشامییەکەم نەخواردو بەدرێژایی رۆژگار تامی زام نەکرد.

## 13ی شوبات

لەبەرەبەیانــەوە بــاران بەلێزمــە دەســتیکردە بــارین‌و چــەند کاتــژمێرێکی دوورودرێــژی خایانــدو ئەمــەش ئاســتی ئــاوی رووبارەکــەی زیــادکرد. ئــەم دەنگوباســـە دڵخۆشـــکەرانەمان پێراگەیشـــت:مۆنتـــانۆ کـــوڕی خـــاوەن خانووەکەیــەو تەمــەنی16ســاڵەو بــاوکی رۆیشــتووەو لایــەنی کــەم دوای هەفتەیـــەکی‌دی دەگەڕێتـــەوە. نـــاوبراو زانیارییگـــەلێکی وردودروســـتی دەربــارەی ناوچــەی نزمــایی نزیــك گوندەکــە کــە مــاوەی کاتــژمێرێك رێکــردن لێــرەوە دوورە پێــداین. وتــی رێچــکەیەکی بچــکۆلە هەیــە بــەرەو لای چــەپ دەڕوات بــەڵام تەنگەبــەرەو لــەو گۆشــەیەدا براکــەی پیرێــز نیشــتەجێیە کــە جوتیارێکی بچکۆلانەیەو کچەکەی خۆی لەسەربازێکی سوپا مارەکردووە.

بـــەرەو خێوەتگـــە تازەکـــە لەتەنیشـــت جۆگـــەو کێڵگەیـــەکی گەنمەشـــامی گواستمانەوە. مارکۆس‌و میگیل رێڕەوێکیان بەرەو رێگا سەرەکییەکە لێدا. بەرزایی:650(کەشوهەوا، بای هەیە).

# 14ی شوبات

رۆژێکــی هێمنــەو لەخێوەتگەکــەدا بەســەرمانبرد. مۆنتــانۆی لاو ســێ جار ســەردانی کــردین و لەجارێکیانــدا ئــەوەی پێراگەیانــدین کــە هەنــدێك کــەس بەمەبەســتی گــەڕان بەشــوێن هەنــدێك بــەرازدا لەبەرەکــەی تــری رووبارەکــە پەڕیونەتەوە...ناوبراو لەمە زیاتری نەگوت.

قەرەبوی ئەو زیانانەشمان کردەوە کە دوچاری کێڵگەی گەنمەشامییەکەی بوو بوو. پشکنەران بەدرێژایی رۆژ هەموو رێگاکانیان تاقیکردەوە بێئەوەی تــەنها کوختێــك بدۆزنــەوەو، ئەگــەر خەملاندنەکانیشــیان دروســتبێت بێشــك رێگایەکی شەش کیلۆمەترییان بڕیوە، ئەمــەش دەکاتــە نیوەی ئــەو رێگایــەی کە سبەی ئێمە دەیبڕین.

نامەیەکی دورودرێــژمان لــەهاڤانــاوە پێراگەیشــت و دەستمانکردە کردنــەوەی کۆدەکانی و گرنگترین باس کە لەنامەکەدا هــاتووە هــەواڵی ئــەو قسەوباســەیە کــە لەتــەك کــۆلدا کــراوە. کــۆلی لــەهاڤانــا وتویــەتی کــە ئێمــە بەرەهەنــدەکانی ئەرکی گەورەی کیشوەرەکە ئاشنامان نــەکردووەو ئــەویش لــەم بــارەدا لەتــەك هاوڕێکانیــدا ئامادەیــە دەربــارەی نەخشــەیەك هاوکاریمــان بکــات کــە لەتــەك خۆمــدا ســەبارەت وردەکاریــیەکانی قســەدەکات. هــەروەها لــەنێو پەیامەکــەدا ئــەوەش هــاتووە کــە کــۆلی خــۆی و هــەروەها ســیمۆن رۆدریگــزورامیریــز بــەرێگاوەن بــۆ لای ئێمــەو...ســیمۆنیــش بەشــێوەیەکی ســەربەخۆ لــەحیزب خواســتی خــۆی بــۆ یارمەتیــدانمان دەربڕیــوە. هــەروەها لەنامەکــەدا هــاتووە: کابرای فەرەنسی کە بەهۆی پاسپۆرتێکی ئاسایی سەفەری دەستپێکردووە، لەبــەرواری بیســت و ســێی مانگــدا دەگاتــە لاپــازو لەوێنــدەر دەبێتــە میــوانی باریگائۆگیــا. بەشــێکی کــەم لەنامەکــە نــەمانتوانی دەســبەجێ کۆدەکــەی بکەینەوە.

دواتــر دەزانــین چــۆن روبــەروی ئــەم هەڵمــەتی پــەلامارە ببینــەوە، لــەنێو هەواڵــەکانی دیکەشــدا ئــەوە هــاتووە کــە مێرســی بەدەســتی خــاڵیی و بــێ پــارەوپول هــاتووەو وتویــەتی لێمــدزراوە...هەســت دەکــەین جۆرێــك لــە گەمــەپێکردن هەیــە، ئەمــە ئەگــەر شــتێکی مەترســیدارتریش لەئارادانــەبێت. لیشین دواتر داوای هەندێك پارەو مەشقی زیاتر دەکات.

## 15ی شوبات

جەژنی(11ساڵە)ی لەدایکبوونی هیلدیتا.

رۆژێك لـەرێکردنی هێمن‌وئـارام بـوو. لەکاتـژمێر دەدا بـەو شـوێنە راگەیشتین کــە تیایــدا پشــکنەران راوەســتان‌و پاشمــاوەی دی رێگاکــەمان بــەخاویی‌و وریــایی بــڕی. لەکاتــژمێر پێنجــی دوای نیــوەڕۆدا هــەواڵی ئــەوەمان لەپێشڕەوەکەوە بەدەست راگەیشت کە توشی کێڵگەگەلی بە بەروبوم چێنراو بـوون‌و دواتـر لەدەوروبـەری کاتـژمێر شەشـدا لەراسـتیی ئـەو زانیارییانـە دڵنیابووین. ئانتی‌ولۆرۆو ئانیسیتۆمان بەمەبەستی قسەکردن لەتەك یەکێك لەجوتیارەکانـدا رەوانـەکردو دەرکـەوت ئـەو جوتیـارە میشـێل پیرێـزی بـرای نیکـۆلایـە، ئـەو جوتیـارە دەوڵەمەنـدەی کـە براکـەی خـۆی بـۆ مـەرامی کـاری خـۆی بـەکاردەبات. میشـێل دادوبێـدادی بـوو لەدەسـت رەفتـاری براکـەی‌و ئامادەیی خۆی بۆ هاوکاریکردنمان دەربڕی...لەبەرئـەوەی کـات درەنـگ بـوو نانی ئێوارەمان نەخوارد.

## 16ی شوبات

هـەروەها چـەند مـەترێکی ترمـان بـڕی بـۆ ئـەوەی خۆمـان لەچـاوی براکـەی دووربخەینــەوەو خێوەتێکمــان لەســەر ســەنگەرێگ کــە بەســەر رووبارەکــەدا

دەڕوانێـتو ئاسـتی50مـەتر لـەو بـەرزترە، لێـدا. لـەم جێیـەدا لـەڕووداوە کتوپڕەکـان دوردەبین بەڵام بـۆ پشـودان شـوێنێکی خـۆش نییـە. هاوڕێیـان دەسـتیانکردە عـەمبارکردنی بڕێکـی زۆر لـەخۆراك بـۆ پرۆسـەی پەڕینـەوە لـەسـییێرا تـا رۆزیتـا. دوای نیـوەڕۆش بـاران بەلێزمـە دەسـتیکردە بـارینو بەدرێژایی شەو خۆشی نەکردەوەو ئەمەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی ئاسـتی ئـاوی رووبارەکـەو تێکـدانی نەخشـەوپلانەکانمان. جـارێکی دیکـەش گۆشـەگیربووین...هـەمووان لەسـەر ئـەوە رێککـەوتین کـە بـڕی1000دۆلار بەمەبەسـتی کڕینـی هەنـدێك بـەرازو بـەخێوکردنیان بـدەین بەجوتیارەکە...ناوبراو خواستگەلێکی سەرمایەدارانەی هەیە.

## 17ی شوبات

بەدرێژایی بەیانی باران باریو تائێستا ماوەی 18 کاتژمێری بەردەوام باران باریوە...لەم ماوەیەشدا هـەموو شـتێك تـەڕبوو و ئاسـتی ئـاوی رووبارەکـە ئێجگار بەرزبووەتـەوە. مـارکۆسو میگێـلو برۆلیـۆم نـارد بۆئەوەی بەشـوێن رێیەکدا بگـەڕێن کـە بـەرەو رۆزیتـا دەچێت. مـارکۆس دوای نیـوەڕۆو پـاش ئەوەی چوار کیلۆمـەتری بـڕی گەڕایـەوەو پێیگـوتین تەپۆلکەیـەکی رووتـەنی وەکی ئەو تـەپۆلکەیەم دۆزیوەتەوە کە پێیدەڵێین:(پامبا دیل تیگر).
ئـانتی تەندروسـتی خەراپـەو پێدەچـێت زۆری خواردبێـت.
بەرزایی:720(مەرجەکانی کەشوهەوا ناسروشتییە).

## 18ی شوبات

جەژنی(33)ساڵەی لەدایکبوونی جۆزیفینا.
سـەرنەکەوتنێکی نیوەناتـەواو، بەهێواشـی رێمـانکردو شـوێن پێـی ئـەو پیاوانـەمان هـەڵگرت کـە ئـەرکی لێـدانی رێگاکـەو پاککردنـەوەی لەگـژوگیاو

رووەکیان پێ سپێردرابوو. بەڵام ئەوان لەکاتژمێر دوودا بەخاکێکی تەختەن راگەیشتن و...ئێمەش کەمێك لێیان بەجێماین و لەکاتژمێر پێنجدا خێوەتەکەمان لەنزیك سەرچاوەی ئاوێکەوە هەڵدا...بەئومێدی ئەوەی سبەینێ بەسەر تەپۆلکەکەدا سەرکەوین. لەبەیانی رۆژی دواتردا مارتۆس وتۆما ئەم هەواڵە خراپانەیان لەتەك خۆیاندا بۆ هاوردین: تەپۆلکەکە پرە لەبەرزایی ئەوەندە ئێجگار لێژ کە سەرکەوتن بەسەریاندا کارێکی ئەستەمە. هیچ چارێکی دیکەمان نەماوە تەنها گەڕانەوە نەبێت.
بەرزایی: 980مەتر.

## 19ی شوبات

رۆژێکی لەکیسچووە. بەرەو رووبارەکە لەتەپۆلکەکە دابەزین و ویستمان لەوێندەرەوە سەربکەوین بەڵام بەتەواوی توشی شکستبووین. لەتەقەللایەکدا بۆ سەرکەوتن بەسەر تەپۆلکەکانی بەرامبەرماندا میگیل وئانیسیتۆم نارد بۆئەوەی لەلایەنەکەی ترەوە هەوڵی سەرکەوتن بدەین بەڵام کەڵکی نەبوو. رۆژمان لەچاوەڕوانیی هاتنەوەی ئەواندا بەسەربرد و کاتێکیش کە هاتنەوە بستێك پێشڕەوییمان نەکرد چونکە ئەم تەپۆلکانە لەو چەشنانە کە سەرکەوتن بەسەریاندا دژوارە.
سبەی هەوڵدەدەین بەسەر ئەو دوایین بەرزاییەدا سەربکەوین کە کەوتووەتە پشت رووبارەکە بەئاراستەی خۆرئاوادا(بەرزاییەکانی دی کەوتونەتە لای باشورەوە).
بەرزایی: 760مەتر.

## 20ی شوبات

رۆژێك لەرێکردنی خاوی پڕ لەڕووداوگەلە: میگیل وبرۆلیۆ رێگای کۆنی بەشوێن جۆگە بچکۆلەکەی نزیك کێڵگەی گەنمەشامییەکەیان گرتەپێش و

لەوێندەر ڕێگایان ونکردو لەگەڵ تاریك داهات گەیشتنە ڕووبارەکە. هێشتا نەگەیشتبووینە لقەکەی دی ڕووبارەکە ڕۆلاندۆو پۆمبۆم بۆ گەشتێك بۆ پشکنینی بەرزاییەکە ڕەوانەکرد بەڵام تا کاتژمێر سێ نەگەڕانەوە ئیدی ڕێکردنمان لەسەر ئەو ڕێگایە کە مارتۆس وەبەری گرتبوو درێژەپێداو لەکاتژمێر چوارونیودا گەیشتینە جۆگەکەو خێوەتەکەمان لەوێندەر هەڵدا. هێشتا پشکنەران نەگەڕاونەتەوە.

بەرزایی: 720 مەتر.

## 21ی شوبات

لەڕێگاماندا بەرەو سەرچاوەی ڕووبارەکە بەشێنەیی پێشڕەویمانکرد. پۆمبۆوڕۆلاندۆ هاتنەوەو لەهەگبەکەیاندا هەواڵێکی نوێ هەیەو ئەویش ئەوەیە کە لقەکەی تری ڕووبارەکە دەتوانرێت لێی بدرێت و پیایدا بپەڕینەوە، هەروەها مارکۆس یش پشکنیبوی و هەر بەهەمان دەرەنجام راگەیشتبوو. لەکاتژمێر یانزەدا دەرچووین و لەدەوروبەری کاتژمێر یەك ونیودا توشی سەرچاوەگەلی ئاوی ئێجگار ساردبووین کە پەڕینەوە بەنێویاندا ئەستەمە. لۆڕۆمان بۆ پشکنین ڕەوانەکرد و ماوەیەکی زۆری پێچوو ئیدی بەناچاری برۆلیۆوجواکینم بەشوێنیدا نارد. لۆرۆ هاتەوەو هەواڵی ئەوەی پێراگەیاندین کە پانایی ڕووبارەکە لەشوێنێکی نزیك لەخۆمانەوە پەیتا پەیتا زیاددەبێت و ئەو شوێنانە بەکەڵکی ئەوە دێن کە لێیانەوە بپەڕینەوە. هەموو لەسەر ئەوە ڕێککەوتین لەسەر ڕێکردنەکە بەردەوامبین و چاوەڕوانی هەواڵی جواکین نەکەین. لەکاتژمێر شەشداو کاتێك کە سەرگەرمی هەڵدانی خێوەتەکەمان بووین جواکین هاتەوەو وتی دەکرێت و دەتوانرێت بەسەر بەرزاییە ڕووتەنەکەدا سەربکەوین و...چەندین ڕێرەوی هاتوچۆ لەوێندەر هەن.

ئانتی بۆ جاری دووەم لەهەفتەیەکدا دوچاری نەخۆشیی باوبڕ بوو.
بەرزایی:860.

## 22ی شوبات

هەموو رۆژمان لەسەرکەوتن بەسەر تەپۆلکەگەلی سەختی گژوگیاچڕدا بەسەربرد. ئێوارەش ئەوەندە زوو داهات هێشتا لەئەرکەکانمان تەواو نەبووبوین، ئیدی ئەو دەمە جواکین و پیدرۆم بەمەبەستی ئەوەی هەرخۆیان بەتەنیا بەئامانجەکە رابگەن رەوانەکرد بەڵام لەکاتژمێر حەوتدا گەڕانەوەو هەواڵی ئەوەیان پێراگەیاندین کە پاککردنەوەی رێگاکە لەدڕکودالّ و گژوگیا لایەنی کەم پێویستیی بەسێ کاتژمێر هەیە.
بەرزایی:1180. گەیشتینە سەرچاوەکانی ئەو جۆگەیە کە دەڕژێتە نێو رووباری مازیکۆریەوە بەڵام بەئاراستەی بەرەو باشوردا.

## 23ی شوبات

رۆژێکی رەشم بەسەربرد. ئەوەبوو پێشان لەهەوڵێکدا بۆ بەرگەگرتنی ئازاری توند بەدرێژایی رۆژ خۆم بە ددانەکانمەوە خەریك دەکرد. لەبەیانیدا مارکۆس وبرۆلیۆ وتۆما بۆ خۆشکردنی رێگاکە دەرچوون و لەخێوەتگەکە لەچاوەڕوانیی هاتنەوەیاندا دانیشتین و لەو ماوەیەشدا کۆدەکانی نامەیەکی نوێمان کردەوە کە دەڵێت نامەکەی منیان لەرێگای سندوقی پۆستی کابرای فەرەنسییەوە پێراگەیشتووە. لەنیوەرۆداو لەژێر تیشکی خۆرێکدا کە لەبەر گەرمییەکەی بەردی ناوچەکە خەریکبوو شەقیان دەبرد کەژاوەکەمان دەستیکرد بەرێکردن و سەروەختێك کە بەبەرزترین لوتکە لەتەپۆلکەکەدا راگەیشتین خەریکبوو لەگەرمادا لەهۆش خۆم بچم..لەو ساتە بەدواوە تەنها بەهۆی هێزی ئیرادەوە پێیەکانم بەدوای خۆمدا کێشدەکرد و هەنگاوم

هەڵدەگرت. بەرزترین بەرزایی تەپۆلکەکە دەگاتە نزیکەی1420مەترو مرۆڤ لەرێگایەوە بەسەر ناوچەیەکی بەرفراواندا دەڕوانێت کە ریۆگراندیو رێڕگەی نانکاهوازوو بەشێك لەرۆزیتا دادەپۆشێت. تۆپۆگرافیای ناوچەکە جیاوازە لەدیمەنی لەنەخشەکەدا...چونکە لەپاش هێڵێکی جیاکەرەوەی رۆشن دەشتاییەکی بەداروردەخت داپۆشراو دەبینرێت کە روبەرەکەی لەنێوان هەشت بۆ دە کیلۆمەتر دەبێت و لەکۆتاییەکەشیدا رووباری رۆزیتا رێدەکات و پاشان زنجیرە چیایەك بەرزبووەتەوە کە بەرزاییەکەی ئەوەندەی بەرزایی ئەو شاخانەیە کە ئێمە لەسەری راوەستاوین و...لەدورەوەڕاش دەشتاییەکە دیارە. بڕیاردرا لەرێچکەیەکەوە، ئەگەرچی سەختیشە، بەرەو خوارەوە دابەزین و شوێن ئەو جۆگەیە بکەوین کە بەرەو ریۆگراندیو لەوێندەریشەوە رووەو رۆزیتا دەچێت. بەپێچەوانەی ئەوەی کە لەنەخشەکەدا هاتووە هیچ شوێنەوارێکی خانوو لەنزیك رووبارەکەوە نییە...خێوەتەکەمان لەبەرزایی900مەترو لەپاش رێکردنێکی پڕ لەماندوێتی لەتاریکیدا کە تیایدا مەتارەکانمان ئاوی خواردنەوەی تیادا نەما، هەڵدا. ئاگام لێبوو دوێنێ بەیانی مارکۆس قسەی ناخۆشی دەرهەق بەیەکێك لەهاوڕێکان دەکردو جنێوی پێدەدا...ئەم رەفتارەی لەتەك هاوڕێیەکی دیکەشدا دووبارەبووەوە. پێویستە لەو بارەیەوە قسەی لەتەکدا بکەم.

## 24ی شوبات

جەژنی(2)ساڵەی لەدایکبوونی ئایرنیستیکۆ.

رۆژێکی سەخت و پڕ لەماندوێتیمان بەسەربرد. پێشڕەویکردنەکەمان بەهۆی بڕانی ئاوی خواردنەوەوە پێشڕەویکردنێکی خلیچك بوو چونکە دەرکەوت ئەو جۆگەیەی کە بەتەنیشتیدا رێدەکەین ئاوەکەی وشکی کردووە.

لەنیوەڕۆداو پاش ئەوەی گروپی ئەو هاوڕێیانەی کە ئەرکی لێدانی ڕێگاکەیان پێسپێردرابوو ماندوبوون، گۆڕیمان بەگروپێکی دی. لەکاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆوە باران دەستیکرد بەبارین و دەرفەتی ئەوەمان بۆ نەڕەخسا(مەتارەکان)مان پڕ لەئاو بکەین و. لەدوای بڕینی ماوەیەکی کەم سەرچاوەی ئاوێکی زۆرمان دۆزییەوەو لەدەوروبەری کاتژمێر پێنجدا خێوەتەکەمان لەبناری بانێکی نزیك لەئاوەکەوە هەڵدا. مارکۆس و ئۆربانۆ لەسەر کاری پشکنینی ناوچەکە بەردەوام بوون. مارکۆس هاتەوەو هەواڵی ئەوەی هاوردبوو کە ڕووبارەکە ئەمێستا تەنها ماوەی دوو کیلۆمەتری ماوەو ڕێگای تەنیشت جۆگەکەش ڕێگایەکی ئێجگار خراپە چونکە بەم زووانە دەبێتە زەلکاوێك لەقوڕولیتە.

بەرزایی:680مەتر.

## 25ی شوبات

ڕۆژێکی ڕەشە..بەخاویی پێشڕەویمانکردو ئەوەش کە زیاتر دوایخستین ئەوەبوو مارکۆس ڕێگای لێتێکچوو و، بەو هۆیەوە ماوەی بەیانیمان بەخۆرایی لەکیسچوو. پێشان میگیل و لۆرۆ دەرچوبون و لەنیوەڕۆشدا ڕاستیی مەسەلەکەی پێراگەیاندین و داوای لێکردین کەسێك بنێرین بێتە شوێنی و بەهۆی بێتەلەوە پەیوەندی پێوەبگرێت. برۆلیۆ و تۆماو پاچۆ چوون بەشوێنیداو لەکاتژمێر دوودا پاچۆ هاتەوەو ئەوەی پێراگەیاندین کە مارکۆس، دوای ئەوەی پەیوەندی بێتەل هێندە لاوازبووە کە دەنگی نابیسترێت، ناردویەتی بەشوێن ئێمەدا. لەکاتژمێر چوارونیودا بینینیۆم نارد بەشوێن مارکۆس‌داو فەرمانی ئەوەی پێیە لەتەك خۆیدا بیهێنێتەوە بۆ خێوەتگەکە ئەگەر تا کاتژمێر شەش نەیتوانی ڕووبارەکە بدۆزێتەوە. پاچۆ لەدوای ڕۆیشتنی بینینیۆ باسی ئەو دەمەقاڵێ توندەی بۆ کردم کە لەنێوان

خـۆی مـارکۆس‌دا روویـداوەو وتـی مـارکۆس فەرمانگـەلی سـتەمگەرانەی بەسـەریداداوە. هـەروەها بـەهۆی داسەکەشـییەوە هەڕەشـەی لێکـردووەو مستەکۆڵەیەکیشی کێشاوە بەدەمیداو، سەروەختێکیش کە پاچۆ جارێکی دی وتویەتی واز لە ناردن(ارسال)دەهێنێت مارکۆس سەرلەنوێ هەڕەشەی لێکـردووەو دەسـتی داوەتـە ئێخـەی‌و پەلکێشـی کـردووەو بـەو هۆیەشـەوە جلەکەی دڕاوە.

دەسـبەجێ ئـانتی‌ورۆلانـدۆم بـانگکرد بـۆ ئـەوەی لەراسـتیی ئـەم رووداوە مەترسـیدارە بکۆڵمـەوە، ئـەوانیش ئـەوەیان پێراگەیانـدم کـە بـەهۆی هەڵسـوکەوت‌و رەفتـاری مـارکۆس‌ەوە کەشـێکی تاسـێنەر لـەنێو ریـزی پێشڕەودا بالادەستە، بەلام هەندێك لەتۆمەتەکانی پاچۆیان بەدرۆخستەوە.

## 26ی شوبات

بەیانییەکـەی لێپێچینەوەیەکم لەتـەك مـارکۆس‌وپاچـۆدا کـردو بـەم ئاکامـە راگەیشـتم: هەڵبـەت مـارکۆس جنێـوی بـەپاچـۆ داوەو بـەخراپی رەفتـاری لەتەکـدا کـردووەو رەنگـە هەڕەشەشـی لێکردبێـت بـەلام لێینـەداوە..هەرچـی پاچۆیـە ئـەویش بـەجنێو وەلامـی داوەتـەوەو تـوڕەی کـردووە. ئەمـە یەکـەمین دەمـەقاڵێ نییـە کـە لـەنێوان هاوڕێیانـدا روودەدات. دەرفـەتی کۆبوونـەوەی هەموویانم قۆستەوەو لەبارەی ئەو تەقەللایانەوە قسـەم بـۆ کـردن کـە لـەپێناو راگەیشـتن بـەرۆژیتـا دەیدەین‌و پێموتن ئەمجۆرە لەقوربانیدان چیدی نییـە جگـە لەسـەرەتایەك بـۆ ئـەو کـارەی کـە دەبێـت شـانی بدەنـە بـەرو بەرگـەی بگـرن...هـەروەها باسـی هەنـدێك لـەو رووداوە شـەرمەزارانەم بـۆ کـردن کـە بەهۆی پابەندنەبوون بەدیسپلینەوە لەخێوەتگەکـەدا روودەدەن‌و، بـۆ نموونـە باسـی ئـەو رووداوەم بـۆ کـردن کـە لـەنێوان دوو هـاوڕێی کوبـایی‌دا روویـداو رەخنـەم لەهەڵوێسـتی مـارکۆس گـرت‌و پاچـۆم لـەوە ئاگـادارکردەوە هـەر

رووداوێكی تری لەم چەشنە دووبارەبێتەوە دەبێتە مایەی دەركردنی یەكجارەكی لەگروپەكە. چونكە نەهات هەر خێرا باسی راستیی رووداوەكەم بۆ بكات، هەروەها بەردەوامبوون لەسەر ناردنیشی رەتكردبووەوەو بڕوام وایە لایەنی زۆریش دەربارەی ئەو جنێوانەی كە گوایە ماركۆس پێیداوە درۆدەكات.

داوام لەبۆلیڤییە دودڵەكان كرد هەر كاتێك نیازی كشانەوەیان هەبوو لەبری ئەوەی پەنا بۆ هۆگەلی لەنگ‌وخێچ ببەن ئاگادارم بكەنەوەو پێمگوتن دەسبەجێ و بەبێ هیچ هەرایەك كار بۆ جێبەجێكردنی داواكەتان دەكەم.

لەهەوڵێكدا بۆ راگەیشتن بەریۆگراندی و شوێنكەوتنی رێرەوەكەی لەسەر رێكردنەكە بەردەوام بووین و ئەو كارەمان ئەنجامداو توانیمان پتر لەكیلۆمەترێك هاورێی رووبارەكە بڕۆین بەلام دواتر ناچاربووین بەسەر بەرزاییەكەدا سەربكەوین چونكە لەم شوێنەوە رێگای دی بۆ پەرینەوە لەرووبارەكە نییە لەبەرئەوەی جێیەكی ئێجگار سەرەولێژە. بینجامین پاش ئەوەی لەهەڵگرتنی كەلوپەلەكانیدا روبەروی هەندێك دژواریی بووەوەو لەرووی جەستەییەوە شەكەتبوو، لەدواوە مایەوەو كاتێكیش پێمانگەیشتەوە فەرمانی ئەوەم پێدا لەسەر رێكردنەكە بەردەوام بێت، ئەویش وای كردو ماوەی50مەترێك رێیكرد بەلام شوێنپێیەكانی ئێمەی ونكردو بۆ سۆراخكردنمان چووە سەر تاوێرە بەردێكی تەخت. هێشتا فەرمانم بەئۆربانۆ بەمەبەستی رێنماییكردنی نەدابوو، ناوبراو پێیەكانی هەڵكەوت و كەوتە نێو ئاوەكەوە. مەلەی نەدەزانی و تەوژمی ئاوەكەش ئێجگار بەهێزبوو و لەتەك خۆیدا كێشیكرد. دەسبەجێ ئێمەش چووین بەهانایەوەو هێشتا جلوبەرگەكانمان دانەكەندبوو ئەو لەگێژاوێكی ئاوەكەدا بێسەروشوێن بوو. رۆلاندۆ بەمەلە خۆی گەیاندێ تاگەیشتە لای و ویستی بچێتە ژێر ئاوەكەوە بەلام تەوژمەكە لەتەك خۆیدا راپێچی كرد بەرەو دورو

لەدوای پێنج دەقیقە ئومێدی دۆزینەوەیمان نەما. لاوێکی بەجەستە لاوازی لەبارەی لێهاتووییەوە هەژاربوو بەڵام خاوەنی ئیرادەیەکی سەرسوڕهێن بوو و، متمانەی تەواوی بەسەرکەوتن هەبوو. ئەزمون لەو بەهێزتربوو و، لەش ولارە لاوازەکەشی یارمەتیدەری نەبوو و ناپاکیی لەتەکداکرد...بەمجۆرە لەکەناری ریۆگراندی و بەچەشنێکی پوچ وبێمانا گروپەکەمان مەرگی بەخۆیەوە بینی. لەکاتژمێر پێنجی پاش نیوەرۆداو بێئەوەی بەرۆزیتا رابگەین خێوەتمان هەڵداو دوایین ژەم لەخواردنی فاسۆلیا کە پێمان بوو خواردمان.

## 27ی شوبات

دوای رۆژێکی پڕ لەماندوێتی لەشوێنکەوتنی رووبارو سەرکەوتن بەسەر تاشە بەرددا گەیشتینە رۆزیتا. ئەم رووبارە لەرووباری نانکاهوازو گەورەترە بەڵام لەرووی بایەخەوە لەمازیکۆری کەم بایەخترەو ئاوەکەشی رەنگێکی مەیلەوسوری هەیە. پاشماوەی ئەو خۆراکەی کە وەکی یەدەگ هەڵمانگرتبوو خواردمان. وێڕای ناوچە ئاوەدانەکان و رێگاکان...شتێکمان بەدی نەکرد بەڵگەبێت بۆ بوونی شوێنەواری ئاو لەدەوروبەرمان.
بەرزایی:600.

## 28ی شوبات

رۆژێك بوو لەکەمێك لەپشودا بەسەرمانبردو لەدوای نانی بەیانی(چامان خوارد)، باسی مەرگی بینجامینم کردو هەروەها هەندێك سەرگورشتەم دەربارەی سیێرامایسترا گێڕایەوە. ئینجا لەدواییدا کارەکانی گەڕان و پشکنین دەستپێکرد:میگیل وئانتی ولۆرۆ بۆ پشکنینی سەرچاوەی رۆزیتا دەرچوون و، فەرمانم پێدان ماوەی سێ کاتژمێرونیو رێبکەن چونکە بڕوام وا

بوو ئەم ماوەیە بەسە بۆ راگەیشتن بەرووباری ئابابۆزیتۆ بەلام بەهۆی نەبوونی رێگاوە ئومێد براوبووم. هەموو شتێك چۆل دێتەپێشچاو و، هیچ شوێنەوارێکی ژیان لەناوچەکەدا نییە. جواکین‌وپیدرۆ بەسەر شاخەکانی بەرامبەرماندا سەرکەوتن بەلام هیچیان نەدۆزییەوەو هیچ رێرەو و تەنانەت تاکە شوێنەوارێکی رێرەوێکی کۆنیشیان نەدۆزییەوە. ئالیخاندرۆورۆبیۆ لەرووبارەکە پەڕینەوەو بەختیان لەبەختی هاوڕێکانی دیکەیان باشتر نەبوو و، پێدەچێت ناوچەکەیان بەباشی نەپشکنیبێت. مارکۆس سەرپەرشتی دروستکردنی کەلەکێکی کرد هەر کە لەدروستکردنی تەواوبوو پرۆسەی پەڕینەوەمان لەناوچەیەك کە دەکەوێتە لای چەمانەوەی رووبارەکەوە دەستپێکرد. سەرەتا کەلوپەلی پێنج پیاومان گواستەوە، لەنێویاندا کەلوپەلەکانی میگیل، هەرچی میگیل‌یشە خۆی لەوبەر مایەوەو بینینیۆش بەبێ کەلوپەلەکانی پەڕییەوە. ئەوەی کە کارەکەی تێکدا ئەوەبوو بینینیۆ پێلاوەکانی ئاو بردی.

کەلەکەکەی یەکەمجارمان لەکیسچوو و نەمانتوانی فریای بکەوین‌و لەئاوەکە دەریبهێنینەوە، کاری دروستکردنی کەلەکی دووەمیش زوو تەواونەبوو هەربۆیە پرۆسەی پەڕینەوەکەمان بۆ سبەینێ دواخست.

## لێکدانەوەی مانگانە

ئەگەرچی لەوردەکاریی ئەو رووداوانەی لەخێوەتگەکەدا روودەدەن ئاگادارنیم بەلام هەموو شتێك بەباشی رێدەکات...هەڵبەت هەندێك لەو رووداوە ریزپەڕانە هەن کە هەر دەبێت هەبن بەلام لەنێویشیاندا رووداوی کوشندە هەیە.

هـیچ دەنگوباسـێکم لـەدەرەوەو سـەبارەت ئـەو دوو پیـاوە کـە پەیوەنـدی بەگروپەکەوە دەکەن پێرانەگەیشت و پێدەچێت ئەمێستا کابرای فەرەنسـی لـەلاپاز بێت و رەنگـە چەند رۆژێکی دی بگاتـە خێوەتگەکە. هیچ هـەواڵێکم لەئەرجەنتین یاخود چینۆوە پێرانەگەیشت. پەیوەندییەکانی پۆست باشن و هەڵوێستی حیـزبیش تائێسـتا دودڵ و دووفاقـە...ئەمـە کـەمترین شـتە کـە دەتوانرێـت بگوترێـت، ئەگەرچـی خاڵێـك هەیـە پێویسـتە روونبکرێتـەوە سـەروەختێك قسـە لەتـەك نوێنـەرە تازەکـەدا دەکـەم و رەنگـە ئەنجامگـەلی یەکلاکەرەوەشی هەبێت.

رێکردنەکـە سـەرکەوتوبوو ئەگـەر ئـەو رووداوە دڵتەزێنـە نەبووایـە کـە بـووە مایەی گیانلەدەستدانی بینجامین. هێشتا پیاوەکان لاوازن و بۆلیڤییەکانیش هەموویان ناتوانن لەبەردەم ئەم ئەزمونەدا دان بەخۆیاندا بگرن. ئەم دوایین رۆژانەش کە تیایاندا لەنێو هاوڕێیاندا برسێتی زاڵبوو بەتایبەت کە هێشتا دابەشبوونەکان هەر هەن، ساردبوونەوە لەپەرۆشیی یەکەمجاریان سەلماند.

هەرچـی کوباییەکانیشـە دووانیـان کـەم ئـەزمونن و بـەپێی پێویسـت بـەپیر داخوازییەکانەوە نەچوون، ئەو دوو کەسەش پاچۆو رۆبیۆن..بەپێچەوانەی ئالیخاندرۆوە کە هاوسـۆزییەکی تـەواوی دەربڕی. سـەبارەت دێرینـەکانیش مـارکۆس هێشـتا سەرچاوەی سـەرقاڵییەکی بەردەوامـە، هـەروەها ریکـاردۆ بەپێی پێویست ئەرکەکانی جێبەجێ ناکات.

قۆناغی داهاتوو قۆناغی جەنگ و بەم پێیە قۆناغێکی یەکلاکەرەوە دەبێت.

## 1ی ئادار1967

لەشەشی بەیانیدا باران دەستیكرد بەبارین ئیدی ناچاربووین پرۆسەی پەرینەوەكە تا كاتی خۆشكردنەوەی بارانەكە رابگرین بەڵام بارانەكە بەتاوتربوو و، تا كاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ بەردەوام بوو ئەمەش ئاستی ئاوی رووبارەكەی زیادكردو داوای پەلەنەكردنو چاوەڕوانیی لێكردین. رووبارەكە زۆر گەورەبووەو پێناچێت ئاستەكەی بەم زووانە دابەزێت. پەنام بۆ كوختێكی چۆڵ برد بۆ ئەوەی خۆم لەبارانەكە بپارێزمو لەوێندەر خێوەتێكی نوێم هەڵدا. جواكین لەشوێنی خۆی مایەوەو...سەروەختێكیش ئێوارە داهات دەنگوباسی ئەوەم پێراگەیشت كە پۆلۆ بەشی خۆی لەشیرەكە بردووەو ئۆسیبیۆ بەشی خۆی لەشیرو سەردینەكە(22) پێكەوە بردووە بێئەوەی پرس بكاتو مۆڵەت وەربگرێت. بەوە سزایانمدا لەخواردن بێبەشیان بكەم ئەگەر شیروسەردین لەلیستی خواردنەكەیاندابێت. ئەو كارەی كە كردیان دەستپێشخەرییەكی خراپونابەجێیە.

## 2ی ئادار

لەوەتەی بەرەبەیانەوە باران باریو پیاوەكانیش، سەرەتا لەخودی خۆمەوە، بەهۆی شەكەتیی لەرادەبەدەرەوە توانای بەرگەگرتنوخۆراگرتنیان نەما. هێشتا ئاوی رووبارەكە زۆرەو هەموو لەسەر ئەوە رێككەوتین كە هەر لەگەڵ خۆشكردنەوەی باراندا خێوەتگەكە چۆڵ بكەینو بەگوێ رووبارەكەدا لەسەر هەمان ئەو رێیە كە لێوەی هاتین درێژە بەرێكردنەكەمان بدەین. نیوەڕۆ دوای ئەوەی ئازوخەیەكی باشمان لەبەروبومی كۆرۆجۆس خركردەوە رێكردنمان دەستپێكرد بەڵام لەكاتژمێر چوارونیودا پاش ئەوەی رێگاكەمان بەمەبەستی

تاقیکردنەوەی رەوتێکی کۆن کە کۆتاییەکەیمان نەزانی بەجێهێشت، راوەستاینو لاماندا.
لەپێشڕەوەکەوە هەواڵمان پێرانەگەیشت.

## 3ی ئادار

رێکردنەکەمان بەپەرۆشییەکیزۆرو هەنگاوی گەورە دەستپێکرد بەڵام لەتەك تێپەڕبوونی کاتدا لەو پەرۆشییەمان گۆڕیو ناچاربووین لەترسی ئەوەی نەبادا رووداوەکەی بینجامین لەوجێیەدا کە تیایدا کەوتە نێو رووبارەکەوە دووبارەبێتەوە، رێگای بەرەو قەدپاڵەکە بگۆڕین. ماوەکەمان لەچوار کاتژمێردا بڕی، ئەمەش هەمان ئەو ماوەیە کە لەکەمتر لەنیو کاتژمێردا بڕیمانو لەکاتژمێر شەشدا گەیشتینە کۆتایی جۆگەکەو خێوەتەکەمان لەوێندەر هەڵدا...تەنها دوو گوێزی هندیمان پێماوەو میگیلوئۆربانۆوبرۆلیۆ بۆ هاوردنی لەدوورڕا دەرچوبوونو لەکاتژمێر نۆی شەودا هاتنەوە. خواردنەکەمان لەدەوروبەری نیوەی شەودا خواردو برسێتییەکەمان بەبەروبومی گوێزی هندیو کۆرۆجۆس(کە لەبۆلیڤیا تۆتای پێدەڵێن)دامرکاندەوە.

## 4ی ئادار

بەیانییەکەی میگیلوئۆربانۆ چوونە دەرەوەو بەدرێژایی رۆژ لەدەرەوە سەرگەرمی پشکنینی ناوچەکە بوونو تەنها لەکاتژمێر شەشی ئێوارەدا گەڕانەوە. ماوەی پێنج کیلۆمەتریان بڕیو پێدەشتێکیان دۆزییەوە کە دەکرێت پێشڕەویی تیادابکرێت بەڵام بەکەڵکی ئەوە نایەت خێوەتی تیادا هەڵبدرێت، بەمجۆرە بڕیارماندا تا کاتی هەموارکردنی ماوەیەکی درێژتر

لەرێگاكـــــــە، لەشــــــوێنی خۆماندا بمێنینـــــــەوە. راوچـــــییەكان دوو مەیمون وتوتییـــەك وكۆترێكیان راوكـــردو لەگـــەڵ گـــوێزی هنـــدی كـــە لـــەم ناوچەیەدا زۆرە، كردمانە خواردن وخواردمان.
ورە نـزم ولاوازەو شـەكەتییش جەسـتەمانی كـول كـردو هەسـت بەسـەرەتای ئارەقكردنەوەی لاقم دەكەم.

## 5ی ئادار

جواكین وبرۆلیۆ لەژێر تاوی باراندا بۆ هەمواركردنی رێگاكە دەرچوون بـەڵام لەبـەر لاوازییـان هـیچ پێشـكەوتنێكیان بەدینـەهێنا كـە شـایانی بـاس بێـت. 12گوێزمـــــان كـــــردەوەو هەنـــــدێك چـــــۆلەكەمان راوكـــــردو كردمانـــــە ژەمەخواردنێك وخواردمان بۆ ئەوەی خواردنی نێو قوتووەكـە بـۆ رۆژێكـی دی هەڵبگرین، هەروەها هەندێك لە دەنكە گوێزە هندییەكانیشمان هەڵگرت.

## 6ی ئادار

رۆژێكـــە لـــەرێكردنی ناوبـــەناو تـــا كاتـــژمێر پێنجـــی پـــاش نیـــوەرۆ. میگیـل وئۆربـانۆ وتۆمـا رێگاكـەیان خۆشـكردو كـەمێك پێشـڕەوییان كـردو لـــەدورەوەڕا هەنـــدێك لـــەو تەپۆلكـــەو بەرزاییانـــەمان بینـــی كـــە وەكـــی بەرزاییـەكانی نانكـاهوازو وان. تـەنها توتییـەكی بچـكۆلەمان راوكـردو دامـان بەپاسـەوانان لـەدواوە. خواردنەكـەی ئـەمڕۆمان بریتـی بـوو لـەگوێزی هندیو هەندێك گۆشـت. تائێسـتاش یـەدەگێك لـەخواردنمان پێیـە بەشـی سـێ ژەمـی سادە دەكات.

## 7ی ئادار

چوار مانگ تێپەڕی و بەهۆی نەمانی ئازوخەو رانەگەیشتن بەکۆتایی رێگاکەوە نائومێدی دزەی کردە نێو دڵ ودەروونی پیاوەکانەوە. ئەمڕۆکە ماوەی چوار تا پێنج کیلۆمەترمان بەگوێ رووبارەکەدا بڕی و دواجار بەرێیەك راگەیشتین ئومێدی ئەوەی لێدەکرێت بمانگەیێنێتەجێ. خواردنەکەمان بریتیبوو لەسێ چۆلەکەی بچکۆلەو پاشماوەکەی تری گوێزی هندی بوو. بۆ سبەینێ تەنها خواردنی نێو قوتوومان بەدەستەوە ماوە، هەر قوتوویەك بۆ سێ هاوڕێ بە دوو رۆژ دەیخۆن و دواتر سەرە دێتە سەر شیری قوتووەکان. هێشتا دوو یان سێ رۆژمان ماوە بۆ راگەیشتن بەنانکاهوازو.

## 8ی ئادار

لەم رۆژە بارگاوییە بەرووداوی کتوپڕو بارگرژیدا، ماوەیەکی کەموکورتمان بڕی.

لەکاتژمێر دووی بەیانیدا خێوەتگەکەمان جێهێشت بێئەوەی چاوەڕوانی هاتنەوەی رۆلاندۆ بکەین کە بۆ شکار دەرچوو. تەنها کاتژمێرونیوێك رێمانکرد تا بەو هاوڕێیانەمان راگەیشتینەوە کە بەهۆی ئەم هاوڕێیانەیانەوە کە بۆ راو دەرچوون رێگا هەموار دەکەن (ئۆربانۆ، میگیل، تۆما، پزیشکەکەوشنشۆ بەشوێن یەکدا)..توتیگەلێکی زۆریان راوکردبوو و، سەرچاوەی ئاوێکیشیان دۆزیبووەوەو لەتەنیشتییەوە لایاندابوو. دوای ئەوەی رێنماییم سەبارەت هەڵدانی خێوەتدا، چووم ناوچەکە بپشکنم لەوێندەر وێستگەیەکی دەرهێنانی نەوتم بینی. ئانتی وریکاردۆخۆیان

تورهەڵدایــە نێــو ئاوەکــەوەو دەبــوو وا خۆیــان پیشــانبدەن کــە راوچــین. بەتــەواوی جلوبەرگەکانیانــەوە خۆیــان هەڵدایــە نێــو ئاوەکــەوە بــەڵام ئــانتی خــەریکبوو بخنکێــت و ریکــاردۆ فریــای کــەوت. دواجــار گەیشــتنە بــەری ئەوبەری رووبارەکەو سەرنجی هەموو خەڵکەکەیان بەلای خۆیاندا راکێشا. بەبێ هەڵکردنی ئەو هێمای مەترسییە کە لەسەری رێککەوتبووین ئەو ناوەیان جێهێشت و لەبەرچاو ونبوون. پێش نیوەرۆ لەرووبارەکە پەڕینەوەو بووە کاتژمێر سێ ونیو هەر نەگەڕانەوە. بەدرێژایی دوای نیوەرۆ چاوەڕوانم کردن... کەڵکی نەبوو و، دوایین گروپی پاسەوانیی لەکاتژمێر نۆدا کشانەوە بێئەوەی هیچ نیشانەیەك دەربکەوێت هێمابێت بۆ ئەوەی کە زیندون و لەژیاندا ماون.

نیگەرانیی دایگرتم و ئارامم لەبەر بڕا... چونکە دوو هاوڕێی ئازا دوچاری مەترسی بوون و، ئێمەش لێرە نازانین چییان بەسەرداهاتووە. بڕیارمدا سبەینێ ئالیخاندرۆ ورۆلاندۆ کە دوو مەلەوانی زۆر باشن بەمەبەستی سۆراخی دوو هاوڕێکە لەرووبارەکە بپەڕنەوە.

خواردنەکەمان لەخواردنی رۆژانی رابوردو باشترە ئەگەرچی گوێزی هندیمان نەماوە چونکە ئەو توتییانە لەتەك ئەو دوو مەیمونە کە ریکاردۆ راوی‌کردون، بەشی کردین و خواردنێکی تێرو تەسەل بوو.

## 9ی ئادار

لەوەتەی بەیانی‌زووەوە پەڕینەوەمان دەستپێکردو... دروستکردنی کەڵەکەکە ماوەیەکی زۆری بردین و پیاوانی پاسەوانیی وتیان لەبەری ئەوبەری رووبارەکە خەڵکانێکی نیمچە رووتی بێ جلوبەرگمان بینیوە... ئەو دەمە کاتژمێر نزیکەی هەشت ونیو بوو ئیدی هەوڵەکەمان هەڵپەسارد. بەشێك لەو رێگایەمان بڕی کە بەرەو بەرەکەی دی دەڕوات و گەیشتینە

شوێنێکی ئاشکرا کە دەرفەتی دوو هاورێکەمان دەدات چاویان پێمان بکەوێت و بمانبینن هەربۆیە دەبوو لەکاتێکی ئێجگار زووداو بەرلەوەی تەمی رووبارەکە برەوێتەوە پەرینەوە دەستپێبکەین.

لەدەوروبەری کاتژمێر چوارداو لەدوای چاوەروانییەکی درێژخایان و پر لەماندوێتی کە لەوەتەی کاتژمێر دەونیوەوە نۆرەی من هات تیایدا، هەردوو پیاوی ئازوخەخستن(ئانتی وشنشۆ)خۆیان هەڵدایە نێو ئاوەکەوەو گەیشتنە لای خواروی رووبارەکەو بەرازێك‌ونان وبرنج وشەکروقاوەو هەندێك خواردنی قوتوو و گەنمەشامییان لەتەك خۆیاندا هاورد...خوانێکمان لەقاوەونان دروستکردو رێگا بەئامادەبووان درا ئەو قوتووە شیرە وشکە بخۆن کە وەکی یەدەگ هەڵمانگرتبوو.

هاورێیان شیکاری ئەوەیان بۆ کردین کە هەموو کاتژمێرێك دەرچوونیان کردووەتە نۆرە بۆ ئەوەی بتوانین بیانبینین، بەلام ئێمە لای خۆمانەوە کەسمان بەرچاونەکەوت. پێدەچێت مارکۆس و پیاوەکانی پێش سێ‌رۆژ لەمەوبەر لێرەوە گوزەریان کردبێت و مارکۆس‌یش کردەوەگەلێکی سەرشێتانەی ئەنجامداوە، لەنموونەی کردەوەی چەك ئاشکراکردن. ئەو ئەندازیارانەی کە لەکێڵگە نەوتییەکاندا کاردەکەن هیچ زانیارییەکیان دەربارەی ئەو ماوەیە نییە کە لەنانکاهوازویان جیادەکاتەوە بەلام بروایان وایە ماوەی پێنج رۆژ رێکردنی گەرەکە، مانای وایە بەشی ئەو گەشتە خواردن وخۆراکمان پێیە. هەرچی ئامێری نەوت دەرهێنانەکەشە خاوەندارییەکەی بۆ وێستگەیەکی دەرهێنان دەگەرێتەوە کە لەبواری جێبەجێکردندایە.

## 10ی ئادار

لەکاتژمێر شەش‌ونیودا دەرچووین و ماوەی45 دەقیقە رێمانکرد تا بەو هاورێیانەمان شادبووین کە خەریکی خۆشکردنی رێگاکەن. لەکاتژمێر

هەشتەوە باران دەستی بەبارین کردو تاوەکو کاتژمێر یانزە بەردەوام بوو. لەراستیدا ماوەی سێ کاتژمێر ڕێمانکردو لەدەوروبەری کاتژمێر پێنجدا خێوەتەکەمان هەڵدا. هەندێك بان و بەرزایی هەن بەچاو دەبینرێن و پێدەچێت بەرزاییەکانی نانکاهوازوبن. برۆلیۆ بۆ پشکنین دەرچوو دواتر هاتەوەو ئەوەی پێراگەیاندین کە ڕێگایەکی دۆزیوەتەوەو رووبارەکەش لەسەر راستەهێڵێك رووەو خۆرئاوا ڕێدەکات.

## 11ی ئادار

رۆژمان بەهەندێك ئامارەی دڵخۆشکەر دەستپێکرد چونکە پتر لەکاتژمێرێك لەسەر ڕێیەکی نموونەیی ڕێمانکردو کتوپڕ ڕێگاکەمان لێ بزربوو.
برۆلیۆ بۆ پشکنین و هەموارکردنی ڕێگاکە دەرچوو و، کارەکەی زۆر بەدژواریی دەستپێکردو دواجار گەیشتە کەنارو کاتێکی زیاترم پێدا بۆ ئەوەی بەیارمەتی ئۆربانۆ ڕێگاکە خۆش بکات. هەر لەگەڵ ڕێکردنمان دەستپێکرد ئاستی ئاوی رووبارەکە نزیکەی دوو مەتر بەرزبووەوەو نەخشەی ڕێکردنەکەی لێتێکداین.
پەیوەندیمان لەتەك هاوڕێیانی پێشڕەودا بچڕاو ناچاربووین رووەو دارستانەکان بڕۆین و، لەکاتژمێر یەك ونیودا راوەستاین و میگیل وتۆمام نارد تا شوێن پێشڕەوەکە بکەون و ئەوەیان پێرابگەیێنن کە پێویستە دەسبەجێ بگەڕێنەوە ئەگەر نانکاهوازو یاخود شوێنێکی دی لەباریان نەدۆزیوەتەوە. دواتر لەکاتژمێر شەشداو، پاش ئەوەی ماوەی سێ کیلۆمەتریان بڕی و توشی یەکێك لەبەرزاییە ئێجگار لێژەکان بوون، گەڕانەوە. پێدەچێت ئەوەندەی نەمابێت بەئامانجەکەمان رابگەین بەڵام ئەم چەند رۆژەی دوایی زۆر سەخت و دژوار دەبێت ئەگەر ئاستی ئاوی رووبارەکە دانەبەزێت و دابەزینیشی مەسەلەیەکە پێشبینی ناکەین. ماوەی45 کیلۆمەترمان بڕیوە.

پاسەوانانی دواوە شەکریان لێبڕاوەو هاوڕێیان پرسیاری ئەوە دەکەن داخۆ ئەوە بەهۆی دەستێخستن و فێڵی برۆلیۆوەیە یان ئەو بەشەی کە پێیاندەدرێت کەمە.
پێویستە لەو بارەیەوە قسەی لەتەکدا بکەم چونکە بەراستیی ئەمە رووداوێکە جێی داخە.

## 12ی ئادار

لەکاتژمێرێك و دە دەقیقەدا ئەو ماوەیەمان بڕی کە دوێنێ دۆزیمانەوەو سەروەختێکیش کە گەیشتینەجێ میگیل وتۆما لەتەقەللایەکدا بۆ خۆلادان لەتەپۆلکەیەکی ئێجگار سەرەولێژ پێشمان کەوتن. هەوڵەکەیان هەموو ماوەی رۆژەکەی خایاندو ئێمەش خەریکی راو بووین.. نێچیرەکانیشمان بریتیبوون لەچوار چۆلەکەی بچکۆلە بەبرنجەوە خواردمان. هێشتا یەدەگێك لەخۆراکمان پێیە بەشی تەنها دوو ژەم خواردن دەکات. میگیل لەبەری ئەوبەر مایەوەو پێدەچێت رێگایەکی بەرەو نانکاهوازو دۆزیبێتەوە. ئەمڕۆکە سێ تا چوار کیلۆمەترمان بڕی.

## 13ی ئادار

لەنێوان کاتژمێر شەش ونیو و نیوەرۆدا بەسەر چیاگەلێکی ترسناکدا سەرکەوتین و بەو هۆیەشەوە شوێن پێی ئەو رێیەمان هەڵگرت کە میگیل دۆزیبویەوەو..دروست ئەمەش کارێکی گەورەیە. بڕوامان وا بوو کە بەنانکاهوازو راگەیشتووین کاتێك توشی هەندێك رێچکەو رێرەوی سەخت بووین، هەربۆیە لەماوەی پێنج کاتژمێردا تەنها ئاستەمێکی زۆر کەم پێشڕەویمانکرد. لەدەوروبەری کاتژمێر پێنجدا خێوەتەکەمان لەژێر تاوی بارانێکی شێنەیی دا هەڵدا..ماندوێتی بەسەر هاوڕێیاندا زاڵ بوو بوو

هەروەها گیانی ورەشیان لاوازبوو. ئەوخواردنەی کە پێمان ماوە بەشی ژەمێك دەكات...نزیكەی شەش كیلۆمەترمان بێهیچ سودێك كە شایانی باس بێت بڕی.

## 15ی ئادار

هێزە سەرەكییەكە تەنها رۆبیۆوپزیشكەكەی لیێبترازێت كە بۆ یارمەتیدانمان مانەوە، لەرووبارەكە پەڕییەوە، ئومێدمان وا بوو بەسەرچاوەی نانكاهوازو رابگەین بەلاّم سێ پیاومان لەتەك خۆماندا برد مەلە نازانن و ئێمەش كەلوپەلی زۆر باری سەرشانمانی گران كردبوو. تەوژمی ئاوی رووبارەكە ماوەی كیلۆمەترێك دوریخستینەوەو كەلەكەكەش بەكەلكی ئەوە نەما بەسەریدا بپەڕینەوە هەربۆیە ئێمە(11پیاو)لەمبەری رووبارەكەماینەوەو سبەینێ جارێكیدی هەولی گواستنەوەی پزیشكەكەو رۆبیۆ دەدەین. چوار باڵندەی واشەمان راوكردو بەو هۆیەشەوە خواردنێكی لەوە خۆشترمان خوارد كە پێشبینیمان دەكرد. هەموو پێویستیی و كەلوپەلەكانمان تەڕبوو و هێشتا كەشەكەش تەڕو شێدارە. هەرچی ورەگەلی پیاوەكانیشە نزم ولاوازە. پێیەكانی میگیل هەوی كردووەو ژمارەیەكی دی لەپیاوەكانیش هەمان حاڵەت توش بوون.

## 16ی ئادار

دوای ئەوەی پێی هاوڕێیان هەویكرد بڕیارماندا ئەسپەكە سەربڕین و بیخۆین. میگیل وئانتی و ئۆربانۆوئالیخاندرۆ گیرۆدەی هەمان نیشانەگەلن، سەبارەت خودی خۆیشم زۆر كزولاواز بووم. مەزەندەكەمان هەڵە دەرچوو كاتێك كە بڕوامان وا بوو جەواكین دەتوانێت لەرووبارەكە بپەڕێتەوەو..رۆبیۆوپزیشكەكەش ویستیان بۆ یارمەتیدانی ئێمە

لەرووبارەکە بپەڕنەوە بەڵام تەوژمەکە بەرەو شوێنێکی دوور هەڵیگرتن و دوریخستنەوەو هێندەی نەبرد لەبەرچاو بزربوون. جواکین داوایکرد ڕێگای بدرێت لەرووبارەکە بپەڕێتەوە بەڵام ئەویش بزریکردن. پۆمبۆوتۆماشم نارد بەشوێنیاندا بەڵام نەیاندۆزینەوەو لەئێوارەدا گەڕانەوە. خوانێکمان لەگۆشتی ئەسپ ئامادەکردو، دواتر دەرەنجامەکانیمان بۆ دەردەکەوێت... پێموابێت ئەمڕۆکە ڕۆلاندۆ گەیشتووەتە خێوەتگەکە.
توانیمان بەتەواوی کۆدەکانی نامەی ژمارە33 بکەینەوە کە لەدەنگوباسی گەیشتنی بۆلیڤییەك کە هاتووە پەیوەندیمان پێوەبکات و، ناردنی بڕێك لەگلۆکانتینی دژی مشەخۆر(لیزیمانیا) ئاگادارمان دەکاتەوە، ئەمە یەکەمین جارە ئەو جۆرە شتانەمان بۆ دێت.

## 17ی ئادار

بەر لەدەستپێکردنی شەڕ ئەم تراژیدیایەش ڕوویدا:جواکین لەبەیانیدا گەیشتە لامان و پێشان میگیل وتۆما چوبوون بۆ سۆراخی و بڕێك لەئازوخەو گۆشتیان پێبوو...گەشتەکە ئێجگار سەخت بوو...نەیانتوانی جڵەوی کەڵەکەکە بکەن کە تەوژمی ئاوەکە لەگێژاوێکدا ڕاپێچیکردو بووە هۆی ئەوەی چەندجارێك وەربچەرخێت. ئەم ڕووداوەش بووە هۆی لەکیسچوونی کەلوپەلی شەش کەس وتارادەیەك زۆربەی ئازوخەکەو، هەروەها شەش پارچەچەك و پیاوێك کە ئەویش کارلۆسە. چونکە تەوژمی ئاوەکە کارلۆسی لەتەك برۆلیۆدا بەرەو گێژاوەکە ڕاپێچکرد بەڵام برۆلیۆ توانی بەمەلە خۆی بگەیێنێتە کەنارو لەوێندەرەوە چاوی لەکارلۆس بوو بەبێ هیچ بەرگرییەك خۆی دابوو بەدەست تەوژمی ئاوی ڕووبارەکەوە. پێشان کارلۆس لەتەك هەموو پیاوەکانیدا لەو ناوچەیەوە تێپەڕیبوو بەڵام کەسیانی نەبینیبوو..ناوبراو تائێستا یەکێك بوو لەباشترین پیاوە بۆلیڤییەکان

لەوانەی کە لەپاسەوانیی دواوە کاردەکەن، چونکە کەسێکی شێلگیرودیسپلینیی و پەرۆشی کارەکەی بوو. هەرچی چەکە ونبووەکانیشە بریتین لەمانە: برنەوێك(خاوەندارییەکەی بۆ برۆلیۆ دەگەڕێتەوە)، دوو تەفەنگی م ـ 1 خاوەندارییان بۆ کارلۆس وپیدرۆ دەگەڕێتەوە، سێ چەك لەجۆری مۆزەر کە خاوەندارییان بۆ ئابیل وئۆزبییۆ وپۆلۆن دەگەڕێتەوە.
جواکین وتی رۆبیۆ وپزیشکەکەم لەوبەری رووبارەکەوە بینیوەو پێموتن کەڵەکێکی بچوك دروست بکەن و بگەڕێنەوە بۆ خێوەتگەکە. دواتر لەدەوروبەری کاتژمێر دووداو لەپاش چەند سەرکێشییەك بە نیمچە رووتیی دەرکەوتوون..هەرچی رۆبیۆشە ئاوەکە پێڵاوەکانی برد. پێدەچێت کەڵەکەکە لەگەڵ یەکەمین گێژاوی ئاوەکەدا وەرچەرخابێت...ئیدی ئەوانیش مەلەیان کردووە تا گەیشتونەتە ئەو شوێنەی کە ئێمە لەنزیکییەوە هاتینەدەرەوە.
وادەی دەرچوون خرایە سبەینێ بەیانیزوو..جواکینیش دواتر لەنیوەرۆدا دەمانگرێتەوەو...بۆ رۆژی سبەینێش پێشبینی دەنگوباسی خۆش دەکەم. ورەگەلی پیاوەکانی جواکین پێدەچێت بەرزبێت.

## 18ی ئادار

بەیانیزوو دەرچووین و جواکینمان جێهێشت کە دوای ئەوەی بەشی خۆیی لەگۆشتی ئەسپەکە خوارد، نیوەرۆ خەوی دەکرد، ناوبراو فەرمانی ئەوەی پێیە کە هەر لەگەڵ بێداربووەوە دەسبەجێ شوێنمان بکەوێت و پەیوەندیمان پێوە بگرێتەوە. ئەوپەڕی تێکۆشام تاوەکو هەندێك گۆشت وەکی یەدەگ هەڵبگرم و..بەو هۆیەشەوە پێچەوانەی بۆچوونی ئەو کەسانەم کرد کە دەخوازن گۆشتی ئەسپەکە هەمووی بخۆن. ریکاردۆ وئانتی وئۆربانۆ لەوادەی گەڕانەوەی بەیانییان دواکەوتن و ناچاربووین، بەپێچەوانەی پێشنیارەکانی منەوە سەبارەت پشودان لەو خێوەتەدا کە لەکاتژمێر سفردا

هـەنگاومان لێـوە هـەڵگرت، چـاوەڕوانی هاتنـەوەیان بکـەین. بەهـەرحاڵ بـەخاویی پێشـڕەویی دەکـەین. ئۆربـانۆ لەکاتـژمێر دوونیـودا گەڕایـەوەو ئاسـکێکی بـەدوای خۆیـدا کێشـدەکرد کـە ریکـاردۆ راویکردبـوو. .ئەمـەش دەرفـەتی ئـەوەمان بـۆ دەڕەخسێنێت کـە خـواردنی زیـاتر بخـۆین و هەنـدێك لەگۆشتی ئەسپەکەش بۆ رۆژانی داهاتوو هەڵبگرین. لەکاتـژمێر چـوارونیودا گەیشـتینە جێیـەك بـۆ ئـەوەی تیایـدا پشـوو‌بدەین بـەڵام لەوێنـدەر خـەوتین. پێدەچـێت هەنـدێك لـەو کەسـە خلیچـك‌وخاوانە لەنێومانـدا هـەبن کـە سروشتیان خراپبووە، لەنموونەی شنشۆ‌وئۆربانۆ‌و ئالیخاندرۆ.

## 19ی ئادار

بـەیانی‌زوو دەرچـووین‌و ماوەیـەکی باشمـان بـڕی‌و، دواتـر لەکاتـژمێر یـانزەدا. . .بـەو چەشـنەی کـە لەسـەری رێککـەوتوین. . .راوەسـتاین‌ولاماندا. ریکـاردۆ‌وئۆربـانۆ جـارێکی دیکـەش دواکـەوتن. . هـەروەهائالیخانـدرۆش دواکـەوت. هـەموویان لەکاتـژمێر یـەکی‌دوای‌نیوەرۆ‌و، لـەدوای راوکردنـی ئاسـکێك هاتنـەوەو، جـواکین‌یشـیان لەتەکـدابوو. هەنـدێك قسـەی ناشـیرین‌و نابەجێ کە جواکین‌و رۆبیۆ بەیەکدییان وت بووە هۆی ئەوەی بەگژ یەکتریـدا بچن‌و منـیش دەسـبەجێ کەوتمـە نێوانیـان‌و پـێش ئـەوەی لـەوە دڵنیـابم کـە دروست رۆبیۆ تاوانبارە، سەرزەنشتی توندی رۆبیۆم کرد.
بڕیارمـدا بـارودۆخ هەرچـۆنێك بێـت رووەو جۆگەکـە لەسـەر رێکردنەکـە بـەردەوامبین بەڵام فڕۆکەیەك بەسـەر ناوچەکەدا هـات‌و ئەمـەش رووداوێکی دڵخۆشـکەر نییـە. . .هـەروەها بچـڕانی دەنگوباسـی بنکەکـە زیـاتر نیگـەران‌و نائـارامی کـردم. پێشـان بـڕوام وا بـوو رێگاکـە زۆر لـەوە دوورودرێـژترە کـە لەراسـتیدا هەیـە بـەڵام لەکاتـژمێر حـەوت‌ونیوداو وێـڕای خاوەخـاوکردن‌و تـەوەزەلیی، پیاوەکـان گەیشـتنەجێ. لەوێنـدەر نیگـرۆ کـە پزیشـکێکی

پیرۆڤییه پێشوازی لێکردین که پێشان لەتەك چینۆوشارەزای رادیۆکەدا هاتبوو...ناوبراو ئەوەی پێراگەیاندین کە بینینیۆ لەسەر خوان چاوەروانمانەو دوو پیاویش لەپیاوەکانی گیڤارا هەڵهاتون و پیاوانی پۆلیسیش هەڵیانکوتاوەتە سەر کێڵگەکە. بینینیۆ باسی ئەوەی بۆ کردین کە بەبرێك لەخواردنەوە بۆ دیداری ئێمە دەرچووەو پێش سێ رۆژ لەمەوبەر لەرێگا توشی رۆلاندۆ بووەو دوو رۆژە لێرە نیشتەجێیەو لەبەردەم ئەگەری پێشرەویکردنی سوپا لەبەری رووبارەکەوە نەیوێراوە درێژە بەرێکردنەکە بدات...بەتایبەت کە ئەو فرۆکە بچکۆلەیە سێ رۆژە بەئاسمانی ناوچەکەدا دەگەرێت، نیگرۆ بەچاوی خۆی رووداوی پەلاماری کێڵگەکەی بینیبوو کە شەش پیاو لەپیاوانی پۆلیس ئەنجامیانداو لەسەروەختی پەلامارەکەدا هیچ کام لەئانتۆنیۆوکۆکۆ لەوێندەر نەبوون چونکە کۆکۆ چووە بۆ کامیری بۆ ئەوەی دەستەیەکی دی لەپیاوەکانی گیڤارا لەتەك خۆیدا بهێنێت و، ئانتۆنیۆش چووە هەواڵی هەڵهاتنی هەندێك لەخۆبەخشەکان رابگەیێنێت. راپۆرتێکی دورودرێژ (د/8)م لەمارکۆسەوە پێراگەیشت لەدوتوێیدا بەشێوازی خۆی باس ووەسفی سەرکێشییەکانی خۆی هاتووە، چونکە ناوبراو سەرپێچی رێنماییەکانی منی کردووەو چووە بۆ کێڵگەکە، هەروەها دوو راپۆرتیشم لەئانتۆنیۆوە بەدەست راگەیشتووە کە تیایاندا شرۆڤەی هەڵوێست و هەلومەرجەکانی(د/9ود/10)دەکات.

کابرای فەرەنسی و هەروەها چینۆوهاورێکانی و، بیلادۆوتانیا وگیڤارا لەتەك یەکەمین دەستە لەپیاوەکانیدا گەیشتنە بنکەکە. میگیل دوای ئەوەی خواردنێکیچەوری خوارد کە لەبرنج و فاسۆلیای رەش پێکهاتبوو، چوو بەشوێن جواکینDا کە پێدەچێت نەیتوانیبێت چۆ بدۆزێتەوە کە جارێکی دی لەرێگادا دەستیکردەوە بەخاوەخاوکردن. دواتر لەتەك ریکاردۆدا هاتەوەو جواکینیش لەبەیانیدا گەرایەوەو...بەمجۆرە هەموو خڕبووینەوە.

## 20ی ئادار

لەکاتژمێر دەدا بەشێنەیی دەرچووین و بینینیۆونیگرۆ پێشمان کەوتن و پەیامێکیان بۆ مارکۆس پێیەو لەدوتوێیدا رێنماییەکانی من سەبارەت بەوە هاتووە کە خۆی کاروباری بەرگری لەئەستۆ بگرێت وکاروباری کارگێڕییش بۆ ئانتۆنیۆ جێبهێڵێت. جواکین بێئەوەی لەکارەکەیدا پەلەی بێت و، دوای ئەوەی شوێنەواری ئێمەی لەدەروازەی رێگای بەرەو جۆگەکە سڕییەوە رۆیشت و... سیان لەهاوڕێیانیش بەپێخاوسی لەتەکیدا رۆیشتن. لەکاتژمێر یەکی پاشنیوەرۆداو لەکاتێکدا نیوەرۆخەوێکی دوورودرێژمان دەکرد پاچۆ هات و پەیامێکی لای مارکۆسەوە هاوردبوو. راپۆرتەکەی کتومت وەکی راپۆرتەکەی بینینیۆ وا بوو. پێدەچێت شتەکان ئالۆزبووبن چونکە سەربازەکان لەسەر رێگای ڤالییَگراندی بنکەوپێگەی خۆیان داناوەو ژمارەیان شەست سەرباز بووەو یەکێك لەپەیامبەرانمان کە ناوی سالۆستیریۆیەو یەکێکە لەپیاوەکانی گیڤارا دەستگیریان کردووە، هەروەها دەستیان بەسەر یەکێك لەهێسترەکانمان و ئۆتۆمبیلی جیپەکەشدا گرتووە. هیچ هەواڵێکمان لەلۆرۆوە بەدەست رانەگەیشت کە ئەرکی پاسەوانیکردنی کوختەکەی پێ سپێردراوە...بڕیارماندا بارودۆخ هەرچۆنێك بێت بگەینە سەربازگەی ورچەکە، لەمەودوا بەمجۆرە بانگی سەربازگەکە دەکەین بەتایبەت دوای ئەوەی ئاژەڵێکی ورچی تیادا کوژرا. میگیل و ئۆربانۆمان نارد تاوەکو خواردنێك بۆ پیاوە برسییەکان ئامادەبکەن و لەگەڵ ئێوارە داهات گەیشتینەجێ. لەوێندەر لەخێوەتگەکە هەریەك لەدانتۆن وبیلاووچینۆ لەوێبوون، وێڕای تانیاو گروپێك لەو بۆلیڤییانەی کە لەگواستنەوەی ئازوخەو کەلوپەلی خێوەتدا کاردەکەن. پێشان رۆلاندۆ نێردرابوو بۆ

رێکخستنی پرۆسەی کشانەوەو گواستنەوەی شتگەلە پێداویستەکان هەربۆیە خێوەتگەکە لەدۆخێك لەپاشاگەردانیی تەواودابوو.
دوای ئەوە بەماوەیەکی کەم پزیشکێکی بۆلیڤی هات، بەم زووانە بووەتە خۆبەخش و پەیوەندی پێوەکردوین و پەیامێکی لەرۆلاندۆوە هاوردبوو کە تیایدا ئەوە هاتووە مارکۆس وئانتۆنیۆ رەنگە لای ناوچەو پێگەی ئاوەکە چاوەڕوانی بکەن. بەهۆی هەمان پەیامبەرەوە ئەوەم پێراگەیاندن کە جەنگ لەشەڕدا دەستەبەردەکرێت و دەبێت دەستبەجێ بەرەو خێوەتگەکە بکشێنەوەو چاوەڕوانی هاتنی من بکەن. هەموو شتێك هێما بۆ بۆشاییەکی تۆقێنەر دەکات...ئەو کارە ناکەن کە پێویستە بکرێت.
گفتوگۆیەکی سەرەتاییم لەتەك چینۆدا کرد. ناوبراو داوای مانگانەی5000 دۆلارو بۆ ماوەی دە مانگی بەردەوام دەکات و لەهاڤانا پێیراگەیەنراوە کە دەبێت لەتەکمدا رێکبکەوێت. لەتەك خۆیدا نامەیەکی هاوردبوو لەبەرئەوەی دورودرێژە ئارتۆرۆ نەیتوانی کۆدەکانی بکاتەوە. قایلبوونی مەبدەئیی خۆمم لەسەر داواکەی پێراگەیاند بەو مەرجەی لەماوەی شەش مانگدا پەیوەندی بەجەنگەوە بکات. وتی وەکی سەرکردەی گروپێك کە لە15پیاو پێکهاتووە خۆم تەرخانی ناوچەی ئایاکۆشۆ دەکەم، ئیدی رێککەوتین، وێرای ئەوە ئەمێستا پێنج پیاوی دەدرێتێ و، دواتر15 پیاو بەهەموو چەکەکانیانەوە، لەدوای مەشقپێکردنیان لەسەر شەڕ، رەوانەی دەکرێن. بەڵێنیدا ئامێرێکی پەخش بۆ ماوەیەکی مامناوەند(40میل)م بۆ بنێرێت و...لەدواییدا کار بۆ ئەوە دەکەین کۆدێکی تایبەت بەخۆمان دابنێین و لەپەیوەندییەکی بەردەوامدابین. پێدەچێت زۆر پەرۆش و نامەزرۆبێت. هەروەها بڕێکی زۆر لەزانیاری دەربارەی رۆدۆڵفۆ لەتەك خۆیدا هاورد بەڵام هەموویان کۆنن. هەواڵمان پێراگەیەنرا کە لۆرۆ هاتووەتەوەو بە وتەی خۆی سەربازێکی کوشتووە.

# 21ی ئادار

ڕۆژم لەقسەکردن لەتەك چینۆو ڕوونکردنەوەی هەندێك خاڵ لەتەك کابرای فەرەنسیو بیلاوو تانیادا بەسەربرد. کابرای فەرەنسی هەندێك دەنگوباسی کۆنی دەربارەی مۆنجەوکۆلیوسیمۆن ڕایس لابوو...وتی بەنیازی مانەوە هاتووم بەڵام من داوام لێکرد بگەڕێتەوە بۆ فەرەنسا تاوەکو لەوێندەر تۆڕێك بۆ پشتگیری شۆڕش دروست بکاتو...پێشنیاری ئەوەم بۆ کرد لەرێگای گەڕانەوەیدا سەردانی کوبا بکاتو دەمزانی ئەم سەردانە لەتەك خواستی خۆیدا دێتەوە چونکە دەیەوێت هاوڕێ کیژەکەی بکاتە هاوسەرو خێزان پێکەوەبنێن. پێویستە نامەیەك بۆ سارتەرو بیرتراند ڕوسێڵ بنووسمو داوای ئەوەیان لێبکەم هەڵمەتێکی کۆمەککردنی نێودەوڵەتیی بۆ جوڵانەوەی ئازادیخوازی بۆلیڤیا بەرپابکەن. ئەرکی قسەکردن لەتەك برادەرێکمدا کە خەریکی ڕێکخستنی سەرجەم ئەو شتانەیە کە پەیوەندییان بەدەستگیرۆییەوە هەیە بەتایبەتی پارەوپولو داوودەرمانو کەلوپەلی ئەلیکترۆنیو، مەبەستیشم لەوە ناردنی ئەندازیارێکی ئەلیکترۆنیو کەلوپەلی پێویستو گونجاوە، بەکابرای فەرەنسی سپارد.

بیلاو ئامادەیی خۆی بۆ کارکردن لەژێر سەرکردایەتی مندا دەربڕی بەڵام لەکاتی ئێستادا پێشنیاری ئەوەم بۆ کرد کە ئەرکی ڕێکخستنی پەیوەندییەکان لەتەك گروپەکانی جۆزامیو جیلمانوستمبونیدا لەئەستۆبگرێت...هەروەها داوام لێکرد پێنج پیاو بنێرێت تاوەکو لەتەك ئێمەدا مەشق لەسەر شەڕکردن بکەن. بەهۆیەوە ڕێزوسڵاوم بۆ ماریا ڕۆزا ئۆلیڤەرو پیرەمێردەکە ناردو بڕی500 پیزۆسو هەروەها سەد پیزۆسی دیکەشم بۆ کرێی ڕێگا پێدا...ئەگەر قایلبوون بەوەی کە لێرە کاربکەن دەبێت باکوری ئەرجەنتین تاقیبکەنەوەو ڕاپۆرتێك دەربارەی ئەو

دەرەنجامانــە کــە پێیرادەگـــەن پێشـــکەش بکـــەن. تانیـــا رێکخســـتنی پەیوەندییـەکان بەپیاوەکانـەوەی لەئەستۆگرت و پێدەچێت ئـەوانیش بـەپیر داواکەیـەوە چـووبن بـەڵام ناچـاربوون بـەئۆتۆمبیلی جیـپ سـەفەر بکـەن بۆئـەوەی رۆژێـك لێـرە بەسـەر ببـەن بـەڵام کاروبارەکـان ئـاڵۆزبوون. جـۆزامی یەکـەمجار نـەیتوانی بمێنێتـەوە هـەروەها جـاری دووەمـیش بـەهۆی ئـەوەی تانیـا لـەوێ نـەبوو نـەیتوانی هـیچ پەیوەندییـەك بگرێـت. بـەجۆرێك لـەقێزو بێـزەوە باسـی ئیڤـان دەکـات و، لـەو هۆکـارە راسـتەقینەیە تێناگـەم کـە پـاڵ بەوەوە دەنێت ئەم چەشنە هەڵوێستەی هـەبێت. لیسـتێکمان دەربـارەی ئـەو پارانە کە لۆیـۆلا تـا رۆژی نـۆی شـوبات خـەرجی کـردون پێراگەیشـت و، بـڕی خەرجکراو1500 دۆلارە. هەروەها لۆیـۆلا باسـی ناکۆکییـەکانی خـۆی لەتـەك سـەرکردایەتی لاوانـدا دەکـات و، پۆسـتەکە دوو راپـۆرتی لای ئیڤـانەوە بـۆ هـاوردم: یەکـەمیان سـادەیەو وێنەگـەلی قوتابخانەیـەکی سـەربازیی تیادایـەو دووەمیشیان بێبایەخەو هەندێك زانیاری لەدوتوێدا هاتووە. گـرنگترین شـت کـە لەراپۆرتەکانیـدا هـاتووە ئەوەیـە کـە ناتوانێـت کۆدەکـانی نامەگەلـە کۆدکراوەکـان(د/13)بکاتـەوە. لـەئانتۆنیۆوە راپـۆرتێکم پێراگەیشـت تیایـدا دەیـــەوێت پاکانــە بــۆ هەڵوێســتی خــۆی بکــات. لەیــەکێك لەهەواڵــەکانی ئێستگەدا ئەوە بڵاوکرایەوە کە سەربازێك بەکوژراوی دۆزراوەتەوەو هێنـدەی نەبرد ئەم هەواڵە بەدرۆخرایەوە، وابزانم ئەوەی کە لۆرۆ وتی راستبوو.

## 22ی ئادار

لـە(  )(23)...خێوەتەکـەمان چـۆڵکرد کـە هەنـدێك خـواردنی تیـادابوو نــــەمانتوانی بیشـــارینەوە(  ). لــــەنیوەرۆدا گەیشـــتینە لای خـــواروی خێوەتگەکـەو گروپێکمـان لـە47 پیـاو، بەمیوانەکانیشـەوە، دروسـتکرد و، سـەروەختێکیش ئـانتی هـات هەنـدێك لـەو هەلانـەی پێشچاوخسـتم کـە

ماركۆس كردبوونی. منیش زۆر توڕە بووم و بەماركۆسم وت ئەگەر ئەو قسانە كە ئانتی دەیانكات راستبن لەگروپەكە دەردەكرێت، ئەویش بەوە وەڵامی دامەوە كە ئەو دەمە وام پێ باشە گوللەباران بكرێم.
فەرمانم دەركرد بۆسەیەك لەپێنج پیاو لای بەشی خوارەوەی رووبارەكەوە دابنرێت و لەژێر سەركردایەتی ئانتۆنیۆو ئەندامێتی میگیل ولۆرۆشدا ئەركێكی پشكنینم بەگروپێكی دی سپارد. پاچۆ لەسەر ئەو تەپۆلكە رووتەنەوە كە بەسەر خانووەكەی ئارگانارازدا دەڕوانێت كاری چاودێریكردنی ئەنجامدا بەڵام هیچ شتێكی تێبینی نەكرد. لەئێوارەدا پیاوانی گروپی پشكنین، بەپێچەوانەی ئەو فەرمانەی كە پێیاندرابوو، گەڕانەوەو منیش بەسەرزەنشتكردنێكی توند پێشوازیم لێكردن. لۆرۆ زۆر هەڵچوو و ئەو تۆمەتانەی رەتكردەوە كە روبەروی كران...ئەو كۆبوونەوەیەی كە ئەنجامدرا هیچی لێنەهاتە بەرهەم...كۆبوونەیەكی بەپەلەو پێشوەختەبوو. بەهیچ كلۆجێك لەوە دڵنیانیم كاروبارەكان بەو چەشنە بەرێوە رۆیشتبن كە ماركۆس باسیكرد. دوای ئەوەی كە دەركەوت30پیاو لەگروپی ناوەراست برسێتی تەنگی پێ هەڵچنیون، ناردم بەشوێن رۆلاندۆدا بۆ زانینی ژمارەی خۆبەخشە تازەكان و چۆنێتی دابەشكردنیان.

## 23ی ئادار

رۆژێكە لەكاروكردەوەگەلی جەنگیی. پۆمبۆ ویستی(گوندۆل)ێك بۆ گواستنەوەی هەندێك پێویستیی لەخێوەتگەكەوە رێكبخات بەڵام من بەرهەڵستیی ئەو پرۆژەیەم كرد تا ئەو كاتەی مەسەلەی ئاڵوگۆڕپێكردنی ماركۆس یەكلایی دەكرێتەوە. كەمێك لەدوای كاتژمێر هەشت كۆكۆ بەپەلە هات وهەواڵی ئەوەی هاورد پەلێك لەسەربازانی سوپا كەوتوونەتە نێو ئەو

بۆسەیەوە کە داندراوە. دوایین ئەنجامەکانیش تا ئەم ساتە بەمجۆرەیە: دەستکەوتەکان: 3شەستیر لەجۆری مۆرتەر عەیاری60ملیمەتر، 16پارچە چەك لەجۆری مۆزەر، 3 تفەنگ لەجۆری ب.ز، 3 ی.س.ئە.س، شەستیرێکی عەیار30 ملیمەتر، ئامێرێکی رادیۆو چەند جوتێك پێڵاو...لەگەڵ 7 کوژراو،14 دیل کە تەندروستییان باشەو، 4 بریندار...بەڵام هیچ ئازوخەو خواردنێکمان دەستکەوت نەبوو، هەروەها نەخشەی ئەو پرۆسانەشمان کەوتە دەست کە لەدوتوێیدا پێشرەویکردن لەهەردوو بەری نانکاهوازوو بەیەکگەیشتنەوە لەبەشی لای ناوەراستیدا هاتووە. دەسبەجێ پیاوەکانمان بەرەو لایەکەی دی گواستەوەو مارکۆس و پیاوانی پێشرەوم لەکۆتایی رێگای مانۆرەکان داناو پاسەوانی دواوەو گرووپی ناوەراستیش بۆ بەرگری مانەوەو برۆلیۆش راسپێردرا بۆسەیەك لەکۆتایی رێگاکەی تری مانۆرەکاندا دابنێت. شەو بەمجۆرە بەسەردەبەین تابزانین سەربازە (ناوداراەکان)سبەینێ دێنەوە مەیدان یان نا. لەکاتی پرسیار ئاراستەکردنیاندا، دوو ئەفسەر بەپلەی مێجۆرو کاپتنێك وەکی توتی وەڵامی پرسیارەکانیان دایەوە.

کۆدەکانی نامەیەکمان کردەوە کە چینۆ هاوردبووی. نامەکە باس لەسەفەری دۆبریێ و ناردنی60000(دۆلار)و داواکارییەکانی چینۆ دەکات، هەروەها هۆکاری دابرانیان لەنووسین بۆ ئیڤان، شیدەکاتەوە.

هەروەها نامەیەکم لەسانشێوە پێراگەیشت لەدوتوێیدا زانیاریگەل دەربارەی تواناو ئەگەری هاتوچۆی تیۆ بۆ هەندێك شوێن‌وجێ هاتووە.

## 24ی ئادار

دوایین دەستکەوتەکان بەمجۆرەیە: 16 پارچە چەك لەجۆری مۆزەر، 3 تۆپ لەجۆری مۆرتەر لەگەڵ 24 گوللەدا، 2 ب.ز، 2000 گوللەی مۆزەر، 3 ی.س.ئە.س لەگەڵ دوو مەخزەن بۆ هەریەکێکیان، شەستیرێکی عەیار30

ملیمـەتر لەگـەڵ دوو شـریت فیشـەك. هـەروەها: 7 کـوژراوو14 دیـل هـەن لەنێویانـدا 4 زامـدار هەیـە. مارکۆس‌م بۆ کارێکی پشـکنین رەوانـەکرد بـەڵام بەهیچـەوە هاتـەوە. ئەمێسـتا فرۆکـەکان کوختـە بچـوکەکەمان بۆردومـان دەکـەن. ئانتی‌م نـارد بـۆ دواجـار قسـە لەتـەك دیلەکانـدا بکـات و دوابەدوای داماڵینیـان لەجلوبەرگـە سـەربازییەکانیان و لـە هـەر شـتێك کـە دەکرێـت و دەشێت کەڵکی لێوەربگیرێت ئازادیـان بکـات. هەرچی دوو ئەفسەرەکەشـە، دوای ئـــەوەی هەریـــەك بـــەجیا پرســـیاریان لێکـــرا...بەتـــەواوی جلوبەرگەکانیانـەوە ئـازادکران. بەمێجۆرەکـەم وت بـواری تـاوەکو نیـوەرۆی بیسـت وحەوتی مانگـت دەدەم سـەربازە کوژراوەکانـت لێـرە بگوێزیتـەوە، هـەروەها پێشـنیاری ئـەوەم پێشچاوخسـت ئاگربەسـتێك گرێبـدات ناوچـەی لاگۆنیلاس بگرێتـەوە لەبارێکدا ئەگـەر لـەم ناوچـەیەدا بمێنێتـەوە بـەڵام وتـی لەسـوپادا نـامێنم و دەسـت لـەکار دەکێشـمەوە. کاپتنەکـەش وتـی لەوەتـەی سـاڵێکەو بـۆ بەپیرەوەچـوونی داخـوازی حیـزب بـۆ نێـو ریزەکـانی سـوپا گەڕاومەتـەوە، هـەروەها وتـی برایـەکم هەیـە لـەکوبا خوێنـدن تـەواودەکات و. وێـڕای ئـەو نـاوی دوو ئەفسـەری دیکـەی سـوپای پێـداین و وتـی ئامـادەن هاوکاریتـان بکـەن. کـاتێکیش فرۆکـەکان دەسـتیانکرد بـەبۆمبابارانکردنی بنکەکانمان، توشی ترسێکی بێوێنە بوون...هەروەها دوو پیـاو لـەپیاوەکانی ئێمەش: رائول و، واڵتـەر کە لەسـەروەختی بۆسەکەشـدا ئازایەتییـەکی زۆری نەنواند، لەترساندا زەندەقیان چوو.

مـارکۆس ناوچـەکەی پشـکنی و کەسـی تیـادا نەدۆزییـەوە، نـاتۆوکۆکـۆش لەتەك خۆبەخشە(دودڵ) ەکاندا بۆ ئەنجامدانی(گوندۆلا)یـەك دەرچـوون بـەڵام پـاش ئـەوەی رێکردنیـان رەتکـردەوە ناچـاربوون بیانگەڕێننـەوە. دەبێـت تەسریحیان بکەین.

# 25ی ئادار

ڕۆژ بەبێ هیچ ڕووداوێکی تازە تێپەڕی. ئۆربانۆوئارتۆرۆم بۆ چاودێری لەجێیەکەوە کە بەسەر دەروازەکانی بەرەو هەردوو بەری ڕووبارەکەدا دەڕوانێت، ڕەوانەکرد. لەنیوەڕۆدا مارکۆس لە پێگەکەی خۆی کشایەوەو هەمووان لەشوێنی سەرەکی بۆسەکەدا خڕبوونەوە. لەکاتژمێر شەش‌ونیودا هاوڕێیانم کۆکردەوەو نمایشێکی شرۆڤەئامێزی ئەو گەشتەم بۆ کردن کە کردومانەو...ئامانج و مەبەستەکانیم بۆ ڕاڤەکردن و هەڵەو چەوتییەکانی مارکۆسم پێشچاو خست و لەپۆستەکەی لامبرد و میگیلم کردە سەرکردەی پیاوانی پێشڕەو. هاوکات تەسریحکردنی هەریەك لەباکۆوبیبوشنگۆلۆوئۆزبیبیۆم ڕاگەیاندو پێموتن لەمەودوا خواردنتان نادرێتێ ئەگەر ئەو کاروبارانە کە داوای جێبەجێکردنیان لێدەکرێت، جێبەجێ نەکەن، هەروەها ئەوەشم پێراگەیاندن کە لەمڕۆ بەدواوە بەشی خۆیان لەتوتن پێنادرێت و کار بۆ ئەوەم دەکەم پێویستییە کەسییەکانی ئەوان بەسەر ئەو هاوڕێیانەدا کە لەوان هەژارترن دابەش بکەم. ڕاگوزارانەش هێمام بۆ پرۆژەکەی کۆڵی کرد کە دەیەوێت بێت و لەتەکماندا بکەوێتە گفتوگۆوە...ئەمە لەکاتێکدا خەریکی دەرکردنی ژمارەیەك لەو ئەندامانەی لاوانە کە هەنوکە لەتەك ئێمەدان. پێموتن کە تەنها هەر ڕاستییەکان گرنگن...هەرچی ئەو قسانەشە کە لەگەڵ ڕاستییەکاندا ناگونجێن قسەلۆکن و کەڵکیان نییە. هەروەها دەربارەی ئەو تەقەللایانە زانیاریم پێدان کە بۆ پەیداکردنی مانگاو، هەروەها سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی لێکۆڵینەوە دەدرێن.

قسەم لەتەك پیدرۆوپزیشکەکەدا کردو وەکی دوو جەنگاوەری نایاب ستایشم کردن...هەروەها ستایشی ئابۆلینارم کرد و دەستیم گوشی.

هاوکات رەخنەم لەوالتەر گرت چونکە لەکاتی گەشتەکەدا کۆڵیداو لەپای هەڵوێستیشی لەشەڕەکەداو ئەو ترسەی لەبەردەم بۆردومانی فڕۆکەکاندا دەریبڕی سەرزەنشتم کرد. ئەویش کاردانەوەی باش نەبوو.
هەندێك وردەکاریم لەچینۆوبیلادۆ روونکردەوەو باسێکی زارەکی دوردرێژی رەوشەکەشم پێشچاوی کابرای فەرەنسی خست.
لەسەروەختی کۆبوونەوەکەدا ناوی سوپای ئازادیخوازی نیشتیمانیی بۆلیڤیامان نا لەگروپەکەمان(دواتر راگەیاندنێك دەربارەی ئەم کۆبوونەوەیە بڵاودەکەینەوە).

## 26ی ئادار

ئانتی بەیانیزوو بەهاوڕێیەتی ئانتۆنیۆورائول وپیدرۆ بۆ گەڕان لەناوچەی نیکۆشا بەشوێن مانگایەکدا دەرچوون و لەرێگاو لەدوری سێ کاتژمێر لەپێگەکانمانەوە توشی هێزگەلی سەربازیی بوون و دەسبەجێ و پێش ئەوەی سەربازەکان بیانبینن گەڕانەوە. وتیان سەربازەکان بنکەیەکی پاسەوانییان لەسەر تەپۆلکەیەکی رووتەن دامەزراندووەو لەخانوویەکدا بینراون کە سەقفەکەی لەژێر تیشکی خۆرەکەدا دەدرەوشێتەوە...هەروەها بەچاوی خۆیان پێنج پیاویان بینیوە لەم خانووە هاتوونەتە دەرەوە. پێدەچێت لەناوچەکانی دەوروبەری ئەو رووبارەدا کە پێیی دەڵێن (یاکی)بڵاوبووبنەوەو تەشەنەیان کردبێت. قسەم لەتەك مارکۆسدا کردو ناردم بۆ لای پاسەوانانی دواوە...هەست ناکەم هەڵسوکەوتی زۆر باش بووبێت.
(گوندۆلا)یەکی بچوکمان ئامادەکردو، شانبەشانی ئەوەش پاسەوانیی ئاساییمان ئەنجامداو هاوڕێیان لەروانگە نزیکەکەیان لەئارگانارازەوە سیتاچل سەربازو هیلیکۆپتەرێکیان بینی دەنیشتەوە.

# 27ی ئادار

ئەمڕۆکــە هــەواڵو دەنگوبــاس وەکــی گــەردەلول هــەڵیکردو ئێســتگەی بەخۆیــەوە خــەریك کــرد، هــەروەها کەڵەکەیــەك لەراگەیانــدن و لێــدوانێکی ڕۆژنامەوانیی باریانتۆسی وروژاند. ڕاگەیاندنە فەرمییەکە باسی لەکوژرانی ژمارەیەك سەربازکرد کوژراوێکی لەراگەیاندنەکەی ئێمە زیاتربوو، هەروەها وتــی کوژراوەکــان لەســەرەتادا زامــداربوون دواتــر کــوژراون...هاوکــات ڕاگەیاندنەکە باســی لــەوە کرد کە ژمارەی کوژراوانی ئێمە گەیشتووەتە15 کوژراوو4 دیل لەنێویاندا دوو بیانی هەن، هەروەها وتی بیانییەکی دیکەش خۆی کوشتووەو، هەندێك زانیاری سەبارەت شۆڕشەکە باسکرد. پێدەچێت ئەوانەی لەگروپەکە هەڵهاتوون قسەیان درکاندبێت یاخود ڕەنگە دیلەکان کە ئازادمــان کــردن ئــەو کارەیــان کردبێــت بــەڵام نــازانین کتومــت چییان وتــووەو چۆنیان بــاس کــردووە. بەڵگــەکان هــەموویان هێمــا بــۆ ئــەوە دەکــەن کــە ڕۆڵــی تانیــا ئاشــکرابووەو..ئەمــەش مانــای وایــە ئــەو کــارە پــڕ لەمانــدوێتی و خۆراگرانەیــەی کــە لــەماوەی دوو ســاڵی ڕەبەقــدا ئەنجاممانــدا بەفیڕۆچــوو. ئەمێستا کشانەوەی میوانــەکان ئێجگــار دژواربــووەو پێموابێــت دانتــۆن بــەم ئەنجامە خۆشحاڵ نــەبوو و، دواتر بۆمــان دەردەکــەوێت لــەژێر ڕووداوەکانــدا چی خۆیان حەشارداوە. بینینیۆولۆرۆو جۆلیۆ بۆ پشکنینی ئەو ڕێگایــە کــە بــــەرەو بیریرنــــدا دەچــێت دەرچــوون و...مــاوەی دوو یــاخود ســێ ڕۆژ دەمێننــەوەو ڕێنمــایی تونــدی ئــەوەم پێــدان کــە لــەبیریرنــدا خۆیــان نەخەنــە بەرچــاوو دواتــر بــەرەو گــۆتییێریز بــڕۆن. فڕۆکــەی پشــکنینەکە هەنــدێك پەڕەشــوتی بەردایــەوەو...ڕەقیبەکــە پێیراگەیانــدین کــە پەڕەشــوتەکان کەوتونەتە نێو کێڵگەکانی شکارەوە. ئانتۆنیۆم لەتەك دوو پیاوی تردا بۆ پشکنینی شوێنەکەیان و دیلکردنیان نارد بەڵام کەسیان نەدۆزییەوە.

لەئێوارەدا کۆبوونەوەیەکمان بۆ فەرماندەیی گشتی ئەنجامداو لەماوەی کۆبوونەوەکەدا نەخشەکانی رۆژانی داهاتوومان دانا کە بەمجۆرەیە: لەبەیانی زووەوە(گوندۆلا)یەك بۆ کوختە بچوکەکەمان بنێرین بۆ هاوردنی گەنمەشامی، کڕینی هەندێك کەلوپەل لەگۆتییێرێز، ئەنجامدانی هێرشێکی بچوك بەنێو دارستانەکاندا لەنێوان بنکال ولاگۆنیلاس بۆ سەر ئەو ئۆتۆمبیلانەی کە لەسەر ئەم رێگایە کاردەکەن، بەمەبەستی چەواشەکردنی سەربازەکان.

لەداڕشتنی شێوەی راگەیاندنی ژمارە 1 تەواوبووین و دواتر دەیدەینە دەست رۆژنامەنووسان لەکامیری(د/17).

## 28ی ئادار

تائێستا ئێستگەکان باسی هەواڵی جوڵانەوە چەکدارییەکە دەکەن. هێزێکی 2000 سەربازیی لەناوچەیەکدا کە نیوەی چێوەکەی 120 کیلۆمەترە گەمارۆیان داوین و پاڵپشت بەبۆمبی ناپاڵم کە فڕۆکەکان بەریان دەدەنە خوارەوە، خەریکە تەوقی ئابلۆقەکە بەرتەسك و بچوك دەبێتەوەو دەمانتاسێنێت. نزیکەی 10 بۆ 15 پێکرانمان هەیە.

برۆلیۆم بە سەردەستەی نۆ پیاو بەمەبەستی هاوردنی گەنمەشامی ناردو ئێوارە کە گەڕانەوە ئەم رستە لەدەنگوباسی سەرنجراکێشیان لەتەك خۆیاندا هاوردبوو: 1)کۆکۆ کە بۆ ئاگادارکردنەوەی ئێمە دەرچوبوو شوێن بزربووە. 2)سەروەختێك کە لەکاتژمێر چواری دوای‌نیوەرۆدا گەیشتونەتە کێڵگەکە نیشانەگەلی ئەوەیان بینیوە کە ئەشکەوتەکە پشکنراوە. هەر کە بۆ چنینەوەو کردنەوەی گەنمەشامییش بڵاوەیان لێکردووەو جیابوونەتەوە حەوت لەپیاوانی خاچی‌سورو دوو پزیشك و چەند سەربازێکی بێچەك هاتوونەتە ناوچەکەو ئەوانیش دەسبەجێ دیلیان کردون و دوای ئەوەی

بۆیان رونکردونەتەوە کە ئاگربەستەکە تەواوبووە رێگایان پێداون درێژە بەرێکردنی خۆیان بدەن. 3)ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگری بەسەرباز بارکراو هاتووەتە ناوچەکەو...لەجیاتی ئەوەی تەقەیان لێبکرێت، فەرمانیان پێداون بکشێنەوە دواوە.4)سەربازەکان بەرێکوپێکی کشاونەتەوەو جەنگاوەرەکانمان هاورێی بەرپرسەکانی تەندروستی بوون بۆ ئەو شوێنەی کە تیایدا لاشە بۆگەنکردووەکان بڵاوبوونەتەوە بەلام بەرپرسەکان نەیانتوانیوە باریانکەن و بیانبەن و وتویانە سبەی دێینەوە بۆ سوتاندنیان. هاورێیانمان دەستیان بەسەر دوو ئەسپی ئارگاناراز‌دا گرت و دوای ئەوەی ئانتۆنیۆورۆبیۆوئانیسیتۆیان لەو جێیانەدا بەجێهێشت کە تیایاندا ئەسپ ناتوانێت درێژە بەرێکردنی بدات، بەرەو لای ئێمە گەرانەوە. لەکاتێکدا کە ئێمە سەرقاڵی سۆراخکردنی بووین، کتوپڕ کۆکۆ هاتەوەو پێدەچێت کەمێك نووستبێت.

تائێستا هیچ هەواڵێکمان لەبینینیۆوە پێرانەگەیشتووە.

کابرای فەرەنسی بەپەرۆشییەکی زۆرەوە دەربارەی باوەڕبوونی بەوەی کە لەدەرەوە کەڵکێکی زۆری دەبێت، قسەی کرد.

## 29ی ئادار

ئەمڕۆکە زۆر کارمان نەکرد بەلام بەهۆی دەنگوباسەکانییەوە رۆژێکی زۆر سەرنجراکێش بوو. سوپا نهێنییەکی زۆری ئاشکراکرد کە ئەگەر راستبن کەڵکێکی زۆریان بۆمان دەبێت. ئەم زانیارییانەش لەهاڤاناوە بڵاوکرانەوە. لەزاری بەرپرسێکیشەوە لێدوانێکی فەرمیی گواستەوە کە دەڵێت حکومەت پشتگیری لەپێشنیاری ڤەنزەوێللا دەکات سەبارەت باسکردنی دۆزی کوبا لەرێکخراوی دەوڵەتانی ئەمەریکادا. لەنێو ئەو هەواڵانەشدا کە باسکران دەنگوباسی پێکدادانێك سەرقاڵی کردم و سەرنجی راکێشام کە لەدۆڵی

تیرابۆی‌دا روویداوەو بووەتە هۆی گیانلەدەستدانی دوو شۆڕشگێڕ. چونکە ئەم دەرەیە ئەو رێگا سروشتییەیە کە بەرەو بیریرندا دەچێت‌و لەبەرئەوەی بینینیــۆ راســپێردراوە ئــەو ناوچـــەیە بپشـــکنێت‌و دەبـــوو ئـــەمڕۆ بگەڕێتـەوەو...تائێستا شوێن بزرەو دیارنییە. پێشان فەرمانم پێدا خۆی لـەرێکردن بـەنێو دۆڵەکـەدا دووربگرێــت بـەڵام لـەم چـەند رۆژەی دواییــدا رێنماییەکانم جێبەجێ نەدەکران.

گیڤارا لەکارەکەیدا بەخاویی پێشڕەویی دەکات‌و بـەدینامیت تـەیارمان کــردووە بـــەڵام پیاوەکــانی نــەیانتوانی بــەرۆژ بــەکاریبهێنن. هاوڕێیــان ئەسپێکیان سەربڕی‌و گۆشتێکی ئەوەندە زۆریان خوارد کە دەکرا بەشی تا چوار رۆژی دی بکات.

پێدەچێت هێشتا لاشە بۆگەنکردووەکانیان نەسوتاندبێت چونکە قەل‌وداڵ هــەر بەســەر ناوچــەکەوە دەگــەڕێن‌و لەهاموشــۆ نەکــەوتون. هــەر لەگــەڵ ســازکردنی ئەشـکەوتەکەدا، لـەم خێوەتـە کـە ئاشـکرا بـووەو لەبارنییــە، دەگوێزینـەوە. داوام لەئالیخاندرۆ کـرد لێـرە لەتـەك پزیشـکەکەو جـواکین‌دا بمێنێتـەوە(هەڵبـەت لـە کـەمپی ورچـەکە). رۆلانـدۆش هـەر پێدەچـێت زۆر ماندوبێت.

قسـەم لەتـەك ئۆربـانۆوتۆمـادا کـرد بـەڵام نـەمتوانی تۆمـا لـەهۆکاری ئـەو رەخنانە کە لێیدەگرم حاڵی بکەم.

## 30ی ئادار

جارێکی دی هێمنی‌و ئارامی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشایەوە. بینینیۆو هاوڕێکانی پێش نیوەرۆ گەڕانەوەو بەکردەوە لەدۆڵی تیرابۆی پەڕیبوونـەوە بەڵام شوێن پێی دوو کەس نەبێت هیچی تریان چاوپێنەکەوت‌و، ئەگەرچی توشـی هەنـدێك جوتیـار بوون‌و دواتـر گەڕانـەوە...بـەڵام بەشـوێنی مەبەسـت

راگەیشتن. هاورێیـان ئـەوەیان رونکـردەوە کـە سـەفەر بـۆ بیریرنـدا چـوار کاتـژمێر دەخایـەنێت و راگەیشـتنیش بـەو شـوێنە هـیچ مەترسـییەکی تیادانییە.

فڕۆکەکان بەهۆی شەستیرەوە لەسەر پەلاماردانی کوختە بچوکەکە بەردەوام بوون.

ئـانتۆنیۆم لەتـەك دوو پیـاودا بـۆ پشـکنینی ناوچـەی سـەروی رووبارەکـە رەوانەکردو بەپێی زانیارییەکانیان سەربازەکان لەبنکەکانی خۆیان جوڵـەیان نەکردووە..ئەگەرچی هەندێك شوێنپێ و شوێنەوار هەن هێما بۆ ئـەوە دەکـەن کـە هەنـدێك لـەو سـەربازانە ناوچـەکەیان پشـکنیوە. پێدەچێت خەنکگـەلیان لێدابێت.

ماینـە شـوێن بزرەکـە گەڕایـەوەو ئەمێسـتا ئەوەنـدەمان گۆشـت هەیـە کـە بـارودۆخ چـەندێك روو لـەخراپییش بکـات هـەر بەشـی چـوار رۆژ دەکـات.

سبەی پشودەدەین و دوو سبەی پێشڕەوەکە دەڕوات بۆ جێبەجێکردنی ئـەم دوو ئەرکـە: داگیرکردنـی گـۆتیێریزو، دانـانی بۆسـە بـۆ سـەربازەکان لەسـەر رێگای ئارگاناراز ـ لاگۆنیلاس.

## 31ی ئادار

هـیچ رووداوێکـی تـازە نییـە کـە شـایانی بـاس بێـت. گیڤـارا وتـی سـبەینێ ئەشکەوتەکە ئامادە دەبێت، ئانتی و ریکاردۆ وتیان سەربازەکان وەکـی رێگـا هــەموارکردنێك بــۆ کارەکــانی تــۆپی (مۆرتــەر) و فڕۆکــەکان، ســەرلەنوێ کێڵگەکـەیان داگیرکردووەتـەوە. ئـەم کـارە دەبێتـە لەمپـەر لەسـەر رێگـای نەخشەکانمان سەبارەت راگەیشتنمان بەبیریرنداو ئازوخە پەیداکردن لـەو جێیـەوە، فەرمانمـدا بـەمانوێـل بـەخۆی و پیاوەکانییـەوە رووەو کوختەکـە پێشـڕەویی بکـات و ئەگـەر چـۆڵبوو دەسـتی بەسـەردا بگرێـت و دوو پیـاو

لەپیاوەکانیشی بنێرێتە لام بەمەبەستی ئاگادارکردنم لەو کارە تاوەکو دوو سبەی ئێمە درێژە بەرێکردنەکەمان بدەین..ئەگەر کوختەکە کەوتبووە دەست دوژمن و دژواربوو کە بتوانرێت بەهۆی هێرشێکی کتوپڕەوە دەستی بەسەردا بگیرێتەوە، دەبێت بگەڕێتەوە بۆ کۆڵینەوە لەئەگەرو توانای گەمارۆدانی کێڵگەکەی ئارگاناراز لە هەردوو لاوەو دانانی بۆسەیەك بۆ سوپا لەنێوان بنکال ولاگۆنیلاس دا. هێشتا ئێستگەکە درێژە بەلێدوانەکانی دەدات و راگەیاندنە فەرمییەکانیش سەبارەت بەرێوەچوونی شەڕ بەردەوامە. پێگەکەمانیان لەنێوان یاکی ونانکاهوازودا زۆر بەوردیی دەستنیشان کردووەو دەترسم ئابلوقەمان بدەن.

قسەم لەتەك بینینیۆدا کردو ئەو چەوتییەم بۆ راڤەکرد کە بەهۆی دەرنەچوونی بۆ سۆراخی ئێمە کردی و هەروەها رەوشی مارکۆس یشم پێشچاوی خست. لەئێوارەدا قسەم لەتەك لۆرۆ و ئانیسیتۆدا کرد و گفتوگۆکە گەرم بوو. لۆرۆ وتی هەلومەرج و هەڵوێستەکە روو لەگرژبونەو، کاتێکیش داوام لێکرد مەبەستی لەو قسەیەی رونبکاتەوە وتی مەبەستم لەقسەکانم مارکۆس و بینینیۆیەو، ئانیسیتۆ لەهەندێك لەقسەکانیدا پشتگیری لێکرد بەڵام دواتر لای کۆکۆ وتی هەردوکیان پێکەوە لەدزینی هەندێك خواردنی قوتوودا بەشداربوون، هەروەها بەئانتی شی وت لەگەڵ ئەو قسانەدا نیم کە لۆرۆ سەبارەت بینینیۆ وپۆمبۆ دەیانکات و، هەروەها لەگەڵ نیوەی ئەو قسانەشیدا کە دەربارەی(نوشوستیی جەنگی پارتیزانیی بەشێوەیەکی گشتی) دەیانکات، ناکۆکم.

# لێکدانەوەی مانگانە

ئەم مانگە پڕبوو لەرووداوگەل بەڵام تابلۆی گشتی خاوەنی ئەم چەند تایبەتمەندییە: قۆناغی پشتگیریو بێگەردکردنی پارتیزانان بەتەواوی دوایی هات. قۆناغێك لەگەشەكردنی خلیچكو پەیوەندیكردنی ئەو ئەندامانەی كە لەكوباوە هاتوونو وادیارە خاوەنی لێهاتووییەكی باشنو، هەروەها پەیوەندیكردنی پیاوەكانی گیڤارا كە دەركەوت ئاستی گشتییان نزمە(دووانیان هەڵهاتن، یەكێكیان دیلكراو هەموو شتێكی دركاند، سیانیان خواستی وازهێنان لەخزمەتیان دەربڕی، هەرچی ئەو دووانەشە كە ماون سستو لاوازن).

تایبەتمەندییەكی قۆناغی دەستپێكردنی شەڕ هێرشێكی وردو دروستو سەرنجراكێش بوو كە پێشوپاش دەستپێكردنەكەی بەهۆی هەندێك هەڵسوكەوتی هەڵەشەوە هەندێك لەلایەنەكانی شێوێنران (لەنموونەی هەڵوێستی كشانەوەی ماركۆس، رەفتاری برۆلیۆ)، قۆناغی دەستپێكردنی دژە هێرشی دوژمن كە ئەمێستا دەركەوتووە: ا) بەئاراستەی دامەزراندنی خاڵگەلی چاودێری كە لەبارياندايە گۆشەگیرمان بكەن. ب)پڕوپاگەندەیەكی بەهێز لەسەر ئاستی نیشتیمانییو نێودەوڵەتیی. ج)ناكارایی سەرتاپاگیری ئامادەگیی جوتیاران.

هەڵبەت ئێمە ناچارین رێكردنەكە لەكاتێكی لەوە زووتر كە بڕوامان دەكرد دەست پێ بكەینو...لەپاش خۆشمانەوە گروپێك كە توانای رێكردنی نییەو، لایەنی كەم چوار سیخوڕ جێبهێڵین.

هەڵوێست باش نییە بەڵام قۆناغێكی دی لەتاقیكردنەوەی جەنگاوەران دەستپێكردو هەر لەگەڵ تەواوبوونیشیدا كەڵكێكی زۆری بۆیان دەبێت.

تیمە بچوكەكەمان بەمجۆرە رێكخرا:

پێشڕەو: میگیل وەکی سەرۆك و هەریەك لە بینینیۆ، پاچۆ، لۆرۆ، ئانیسیتۆ، کامبا، کۆکۆ، داریۆ، جۆلیۆ، پابلیتۆ، پۆل، ی لەتەکدایە.

پاسەوانی دواوە: جواکین سەرکردەیەو، برۆلیۆ پارمەتیدەرێتی و هەریەك لە رۆبیۆ، پیدرۆ، پزیشکەکە، پۆلۆ، والتەر، ڤیکتۆر(پیت، باکۆ، ئۆزیبیۆ، شنگۆلۆ)ی لەتەکدایە.

ناوەڕاست: من، ئالیخاندرۆ، رۆلاندۆ، ئانتی، پۆمبۆ، تاتۆ، تۆما، ئۆربانۆ، مۆرۆ، نیگرۆ، ریکاردۆ، ئارتۆرۆ، ئۆستاکیۆ، گیڤارا، ویلی، لویس، ئانتۆنیۆ، لیۆن(تانیا، بیلادۆ، دانتۆن، چینۆ...میوانن)، سیرابیۆ(پەناهەندەیە).

# 1ی نیسان 1967

پیاوانی پێشڕەو لەو وادەیەی کە بۆ دەرچوونیان دەستنیشان کرابوو دواکەوتن و لەکاتژمێر حەوتی بەیانیدا دەرچوون...هێشتا کۆمباش لەسەفەرەکەی لەتەك ناتۆدا بۆ ئەشکەوتی ورچەکە ...بەمەبەستی حەشاردانی چەکەکان، نەگەڕابووەوە. تۆما لەکاتژمێر دەدا لەروانگەکەی هاتەوەو هەواڵی ئەوەی هاورد کە سیان یاخود چوار سەربازی لەکێڵگەی شکارەکەدا بینیوەو...دەسبەجێ بەرەو پێگەکانمان دەرچووین و واڵتەریش لەبنکەی چاودێرییەکەوە ئەوەی پێراگەیاندین کە سێ سەربازی بینیوە هێسترێك یاخود گوێدرێژێکیان لەتەکدابووەو سەرقاڵی دانانی شتێك بوون نازانرێت چییەو ناوبراو بەپەنجەی خۆیشی هێمای بۆ شوێنی سەربازەکان بۆ کردم و پیشانیدام بەڵام من هیچم نەبینی. لەکاتژمێر چواری دوای نیوەڕۆدا کشامەوەو دڵنیابووم لەوەی کە پەلامارمان نادەن و...پێموابێت ـ ئەوەی کە واڵتەر بینویەتی لەسەراب بەولاوە زیاتر نییە.

بڕیارمدا لەبەیانییەوە هەموو شتێك کۆبکرێتەوەو لابرێت و، رۆلاندۆشم راسپارد لەکاتی لەوێ نەبوونی جواکین دا سەرکردایەتی دواوە بکات. .ناتۆوکامبا لەکاتژمێر نۆی ئێوارەداو دوای ئەوەی هەموو شتێکیان حەشاردا تەنها خواردنی ئەو شەش کەسە نەبێت کە دەمێننەوە، گەڕانەوە، ئەو شەش کەسەش ئەمانەن: جواکین، ئالیخاندرۆ، مۆرۆ، سیرابیۆ، ئۆستاکیۆ، پۆلۆ. سێ کوباییەکە نارەزاییان بەرامبەر ئەم بڕیارە دەربڕی.

ماینێکی دیکەمان بەمەبەستی وشککردنەوەی گۆشتەکەی وجێهێشتنی ئازوخە بۆ شەش پیاوەکە، سەربڕی. ئانتۆنیۆ لەکاتژمێر یانزەدا هاتەوەو وتی هیچ رووداوێکی تازە نییەو، لەتەك خۆشیدا کیسێك گەنمەشامی هاوردبوو.

رۆلانـدۆ لەکاتـژمێر چـواری بەیانیـدا دەرچـوو و هەریـەك لـەم چـوار پیـاوە لاوازەشـی لەتەکـدابوو: (شـنگۆلۆ، ئۆزیبیـۆ، بـاکۆ، پیـب)، پیـب داوای چەکێکی کـردو وتـی لەتەکتانـدا دەمێنمـەوە، هـەروەها کامبـاش لەتەکیانـدا دەرچوو.

کۆکـۆ لەکاتـژمێر پێنجـدا گەیشـتو پـەیامێکی نـوێی هـاوردبوو کـە دەڵێـت مانگایەکمان سەربڕیوەو چاوەڕوانی هاتنی ئێوەین. لەسەر ئەوە رێککەوتین لـەنزیك ئـەو جۆگەیـە کـە لەشـاخەکەوە هەڵـدەقوڵێتو لای خـواروی کێڵگەکە...دوو سبەی لەسەروەختی نیوەرۆدا دیداری یەکدی بکەین.

## 2ی نیسان

کەڵەکـەکردنی ئـەو بـڕە سەرسـوڕهێنە لەشـتگەلو پێویسـتیی، بـووە هـۆی ئـەوەی هـەموو رۆژمـان لەرێکخسـتنی لـەنێو ئـەو ئەشـکەوتانەدا کـە بۆیـان سازکراوە، بەسەرببەین...پێشان گواستنەوەیان لەکاتژمێر پێنجدا تەواو بوو بوو. چوار پیاومـان بۆ پاسـەوانیی جێهێشـت بـەڵام بەشێوەیەکی زۆر سەیر هێمنی هەر بەردەوام بوو و، هیچ فڕۆکەیەکیش بەسەر ناوچەکەدا نەهات. لێدوانـەکانی رادیـۆ دەڵـێن(پەیتاپـەیتا تـەوقی ئـەو گەمارۆیـە کـە لەسـەریانە بەرتەسـك دەبێتـەوە)و گوایـە جـەنگاوەرانمان لەدۆڵـەکانی نانکـاهوازودا دەسـتیانکردووەتە بـەرگری، هـەروەها لـەنێو دەنگوباسـەکاندا هـەواڵی ئـەوە هـات کـە دۆن ریمبرتـۆ دەسـتگیرکراوەو دانـی نـاوە بـەوەدا کـە کێڵگەکـەی بەکۆکۆ فرۆشتووە.

بڕیارماندا ئەمڕۆ بەهۆی درەنگ وەختییـەوە رێکـردن دوابخـەین بـەڵام لەسـەر ئـەوە رێککـەوتین کـە سـبەینێ بـەیانی لەکاتـژمێر سـێدا دەربچـینو رۆژێکـی تەواو بەوە کورت بکەینـەوە کـە راسـتەوخۆ بـەرەو رێگـای نانکاهوازو بڕۆین

ئەگەرچـی ئـەو شـوێنەی کـە بـۆ بەیەکگەیشـتن دیـاریکراوە بەئاراسـتەکەی تردایە.
قسـەم لەتـەك مـۆرۆدا کـردو ئـەوەم تێگەیانـد کـە بـەهۆی لاوازییەکەیـەوە بەتایبەت بەرامبەر برسێتیو خواستی تورەکردنی هاوڕێیـان بەشێوازێکی گاڵتەجاڕانـە، نـاویم لـەنێو گروپەکـەدا تۆمـار نـەکردووە. گفتوگـۆو قسـەکان کەمێك کاتی خایاند.

## 3ی نیسان

ئـەو پرۆگرامـەی کـە دامانـابوو بـەبێ زەحمـەت جێبـەجێمانکردو لەکاتـژمێر سـێ ونیودا بـەخاویی هـەنگاومان هـەڵگرتو لەکاتـژمێر شـەش ونیودا گەیشـتینە سـەرەولێژییەکەو لەدەوروبـەری کاتـژمێر هەشت ونیویشـدا گەیشـتینە نزیکـی کێڵگەکـە. سـەروەختێك بـەو ناوچـەیەدا تێپـەڕین کـە بۆسـەکەی جـاری یەکـەمی تیـادا دانـرا، لەحـەوت لاشـەکەی یەکـەمجار تـەنها ئێسكوپروسـکگەلێکی زۆر پـاك مابوونـەوەو پێدەچـێت قەلوداڵـەکان کاروبـاری خۆیـان زۆر بەچـاکیجێبەجێکردبێت. دوو پیـاو کـە ئـەوانیش بریتین لە(ئۆربانۆ، ناتۆ)رەوانەم کردن بۆ ئەوەی پەیوەنـدی لەتـەك رۆلانـدۆدا بگـرنو دوای نیـوەرۆ بـەرەو دۆڵـەکانی تیرابـۆی گواسـتمانەوەو دوای ئـەوەی ئێوارە خوانێکمان لەگۆشتی مانگاو گەنمەشـامی خـوارد، شـەومان لەوێنـدەر کردەوە.
قسـەم لەتـەك دانتـۆنوکـارلۆسدا کـردو ئـەم سـێ ئەگـەرەم پێشچاوخسـتن: بـەردەوامبوون لەتـەك ئێمـە یـاخود کشـانەوە بەتـەنها یـاخود رۆیشـتن بـەرەو گـۆتییێریزو تاقیکردنـەوەی بـەختیان لەوێنـدەر، ئـەوانیش رێگاچـارەی سێیەمیان هەڵبژارد.
سبەی بەختی خۆمان تاقیدەکەینەوە.

## 6ی نیسان

رۆژێکــی پــڕ لــەبارگرژیو نائارامییــە. لەکاتــژمێر چــواردا لــەنانکــاهوازو پەڕینــەوەو دواتــر چــاوەڕوانی هــەڵهاتنی خۆرمــان کــرد بــۆ ئــەوەی درێــژە بەرێکردنەکـەمان بـدەین...میگیـل دەسـتیکردە پشـکنینی ناوچـەکە بـەلام دووچار بەهۆی چەوتیگەلەوە کە کردنیو لەئەنجامیاندا لەسەربازەکان زۆر نزیکبووینــەوە، ناچــاربوو بگەڕێتــەوە. رۆلان لەکاتــژمێر هەشــتدا ئــەوەی پێراگەیاندین دە سەرباز لەدەروازەی ئەو دۆڵەدان کە ئەمێستا جێمانهێشت. بەخاویی درێژەماندا بەرێکردنەکەو لەکاتژمێر یانزەدا گەیشتینە بەرزاییەکی دوور لەمەترسـی. دواتـر رۆلان شـوێنمان کـەوتو هـەواڵی ئـەوەی پـێبوو کـە زیاد لە100سەرباز لەدۆڵەکەدا جێگیربوونو پێگەیان داناوە.

ئێــوارە پــێش ئــەوەی بگەینــە جۆگەکــە گوێمــان لــەهاواری هەنــدێك گــاوان بــوو...دەنگەکــە لەبــەری لای رووبارەکــەوە دەهــات. بــەرەو ئــەو شــوێنە بەرێکەوتینو لەوێندەر چوار جوتیارمان دەستگیرکرد گاوگۆلی ئارگانارازیـان پــێبوو. مۆڵــەتێکی ســوپایان پــێبوو ســەبارەت هــاوردنی 12ســەر ئــاژەڵ. هەنــدێکیان بــەر لەگەیشــتنی ئێمــە رۆیشــتبوونو نــەمانتوانی شــوێنیان بکـەوینو بیانگرینـەوە ئیـدی دوو مانگامـان بـۆ خـواردنی خۆمـان گلدایـەوەو بـەرەو ئەوبـەری رووبارەکـە کێشـمان کـردنو لـەنزیك جۆگەکـە بەدارێکـەوە بەســتماننەوە. لەدواییــدا دەرکــەوت ئــەو چــوار هاولاتییــە کــە گرتومــانن ئەمانەن: بەڵێندەرێكو کوڕەکەیو جوتیارێکی خەڵکی شۆکیزاکاو یـەکێکی دی خەڵکی کامیری کە لەتەکماندا زۆر کراوەبوو ئێمـەش ئـەو راگەیاندنـەمان پێدا کە ئامادەمان کردبوو و ئەویش بەڵێنیدا بلاوی بکاتەوە.

ماوەیەك چوار پیاوەکەمان لای خۆمان هێشتەوەو دواتر لەبەرامبەر ئەوەدا کە بێدەنگبن ئازادمان کردنو ئەوانیش گفتی بێدەنگبوونیان پێداین.

ئێوارەمان بەنانخواردن بەسەربرد.

## 7ی نیسان

بەنێو ئەو ڕێگایەدا کە بەتەنیشت جۆگەکەدا دەڕوات ڕێمانکردو دوایین مانگای زیندومان لەتەك خۆماندا بردو دواتر بەمەبەستی وشککردنەوەی گۆشتەکەی لەژێر تیشکی هەتاودا، سەرمانبڕی. ئەرکی دانانی بۆسەیەك لەنزیك ڕووبارەکەوە بەپێدانی فەرمانی تەقەکردنیشەوە بەرۆلاندۆ سپێردرا بەلام بەدرێژایی ڕۆژگار هیچ ڕوداوێك ڕووینەدا. بینینیۆوکامبا درێژەیان بەپشکنینی ئەو ڕێگایەدا کە بەبیریرندامان دەگەیەنێت و ئەوەیان پێراگەیاندین کە لەیەکێك لەدۆڵە تەنگەبەرەکانی نزیك جۆگەکەمانەوە گوێیان لەدەنگێك بووە لەدەنگی بزوێنەری مشار چووە.

ئۆربانۆوجۆلیۆم نارد لەتەك خۆیاندا پەیامێك بۆ جواکین ببەن و ڕۆژ ئاوابوو هەر نەگەڕانەوە.

## 8ی نیسان

هیچ شتێکی تازە نییە. بینینیۆ بۆ درێژەدان بەکارەکەی دەرچوو بەلام نەیتوانی تەواوی بکات و وتی سبەینێش هەر ناتوانم تەواوی بکەم. میگیل چوو بۆ پشکنینی دۆڵێك کە بینینیۆ لەشوێنە بەرزەکەی خۆیەوە بینیبوی، بەلام هەر نەگەڕایەوە. ئۆربانۆ لەتەك جۆلیۆوپۆلۆدا هاتەوە. سەربازەکان دەستیان بەسەر خێوەتگەکەدا گرتووەو ئەمێستا خەریکی پشکنینی تەپۆلکەکانن. جواکین پشتگیری لەراستیی ئەم دەنگوباسانە کردو هەندێك لەگیروگرفتەکانی دیکەی بۆ باسکردین لەدوتوێی بەلگەنامەی هاوپێچ(و/19)دا نووسیم. هەنوکە خاوەنی سێ مانگاو گوێرەکەیەکین بەلام یەکێك لەمانگاکان هەلهاتووەو ئەمێستا تەنها سێ ئاژەلمان لا ماوە. بەهۆی

ئەو برە خوێنیەوە کە ماومانە ئاژەڵێك یان دووان بۆ ئامادەکردنی گۆشتی وشك تەرخان دەکەین.

## 9ی نیسان

پۆلۆولویس وویلی بۆ پێدانی یاداشتێك بەجواکین و یارمەتیدانی لەگەڕانەوە لەتەك گروپەکەیدا، دەرچوون. هەندێك شوێن وجێ هەن ئەگەرچی لەجۆگەکەوە زۆر نزیکن بەڵام خراپ نین. ناتۆو گیڤارا بۆ هەڵبژاردنی یەکێك لەشوێنە گونجاوەکانیان چوون. ناتۆ وتی ئەگەرچی شوێنەکان لەجۆگەکەوە نزیکن بەڵام شوێنگەلێکی لەبارن لەدوریی کاتژمێرێك لەخێوەتگەکەوەو کەمێك لەو جێیەوە دورن کە ئێستاکە تیایدا نیشتەجێین. میگیل گەڕایەوەو وتی ئەو ڕێگایەم دۆزیوەتەوە کە بەرەو بیریرندا دەچێت و ڕاگەیشتنمان بەو جێیە بەبارەکانی سەرشانمانەوە ڕۆژێکی تەواو دەخایەنێت، بەمجۆرە ڕێنماییەکانی خۆمدا بەبینینیۆ تاوەکو گەڕانەکانی رابگرێت چونکە تەواوی ڕۆژێکی دی دەبات.

## 10ی نیسان

بەبێ هیچ ڕووداوێکی تازە بەیانی بووەوەو دوای ئەوەی سەرجەم ئەو شوێنەوارانەمان لەناوبرد کە بەڵگەن بۆ تێپەڕبوونمان لەم جێیەوە، دەستمانکردە خۆئامادەکردن بۆ بەجێهێشتنی جۆگەکەو بڕیارماندا ڕێگای بیریرندا ـ گۆتییێریز لەو دۆڵەوە کە میگیل دۆزییەوە، ببڕین. نیگرۆ لەنیوەی بەیانیدا هات و شڵەژاو دیاربوو، هەواڵی ئەوەی بۆ هاوردین کە ئەمێستا 15 سەرباز بەرێگاوەن بەرەو ڕووبارەکە. ئانتیەم نارد بۆ بۆسەکە بۆ ئاگادارکردنەوەی ڕۆلاندۆ. هیچ چارێکی ترمان لەبەردەمدا نەماوە تەنها چاوەڕوانکردن نەبێت، هەربۆیە چاوەڕوانمان کرد. داوام لەتۆما کرد لە هەر

پەرەسەندنێك كە روودەدات ئاگادارم بكاتەوە، دەنگوباسە سەرەتاییەكان خێراو خەراپ بوون. رۆبیۆ:(گیرۆ سواریز گایۆل)پێكراوەو زامەكانی سەختەو هەر لەگەڵ گەیەنرایە خێوەتەكەو. بەهۆی ئەوەی كە گوللە سەری پێكابوو. گیانی لەدەستدا. رووداوەكان بەمجۆرە روویاندابوو:

بۆسەكە لەهەشت پیاو لەپیاوانی پاسەوانی دواوەو گروپێك لەگیانپارێزان كە لەسێ پیاو لەپیاوانی پێشڕەو پێكدەهات. پێكهاتبوو و. بەسەر هەردوو بەری رووبارەكەدا دابەش بوو بوون. سەرەوەختێك كە ئانتی بەگەیشتنی سەربازەكانی زانی دەسبەجێ خۆی گەیاندە ئەو جێیە كە رۆبیۆ تیایدا لەبۆسەدابوو، خێرا پێیوتبوو كە ئەو شوێنەی گونجاونییە چونكە لەبەری رووبارەكەوە دیارەودەبینرێت. سەربازەكانیش بەبێ وریاییەكی ئەوتۆ پێشڕەوییان دەكرد بەلام لەسەر رێگایاندا توشی برۆلیۆ یاخود پیدرۆ بوون كە بەرلەوەی بكەونە نێو بۆسەكەوە سەرقاڵی پشكنینی ئەملاولای رووبارەكە بوون بۆ سۆراخی رێچكەو رێرەوگەل. تەقەكردن چەند چركەیەكی خایاندو لەپاش خۆیەوەو لەگۆڕەپانی شەڕەكەدا سێ زامدارو شەش دیلی بەجێهێشت و دەسبەجێ هەر لەوێدا ئەفسەرێكی پۆل كوژراو چواریش هەڵهاتن. هاوڕێیان رۆبیۆیان لەتەنیشت یەكێك لەبریندارەكانەوە دۆزییەوە كە گیانی دەدا، ئەمە پاش ئەوەی تفەنگەكەی لەكاركەوتبوو و لەنزیكیشییەوە رومانەیەك كەوتبوو كە ئەگەرچی ئەڵقەكەشی دەرهێنرابوو بەلام نەتەقیبووەوە. دیلەكە بەو هۆیەوە كە لەبارێكی تەندروستیی مەترسیداردابوو نەمانتوانی پرسیاری لێبكەین و دواتر مرد، هەروەها ئەو ئەفسەرەش كە گەشتی پشكنینەكەی رابەرایەتی دەكرد ئەویش گیانی لەدەستدا.

لەئەنجامی ئەو پرسیارانەدا كە لە دیلەكانمان كرد ئەم وەڵامانەمان دەستگیربوو: پانزە سەربازەكە سەر بە بەتالیۆنی یەك بوون لای خواروی

رووبـاری نانکـاهوازو بنکـەیان دانـابوو، ئـەم پۆلـە لـەو دۆڵـە تەنگەبـەرەوە تێپەڕبوونو ئیسكوپروسكی ئەو سەربازانەیان كۆكردبووەوە كە لەبۆسەی یەكەمدا كوژرانو، دواتـر پـەلاماری خێوەتەكەیانـدا...بە وتـەی دیلـەكان كـە ئەگەر راست بكەن پێدەچێت پیاوەكانیان هیچیان نەدۆزیبێتەوە...ئەگەرچی ئێسـتگەی رادیـۆ بـاس لەبەڵگەنامـەو وێنەگـەل دەكـات كـە لەوێنـدەر دۆزراونەتـەوە. بەتالیۆنەكـە بریتـی بـوو لـە100 پیـاو، 15 پیاویـان بەهاوڕێیـەتی تیمێك لەرۆژنامەنووسـان رۆیشـتبوون بـۆ خێوەتگەكـەمانو، ئەوانیش ئەركی ئەوەیان پێ سپێردرابوو كە ناوچەكە بپشكننو لەكاتژمێر پێنجـی دوای نیـوەڕۆدا بـەرەو بەتالیۆنەكـە بگەڕێنـەوە. بـەم چەشـنە هێـزە سەرەكییەكان لەبنكال بوون...سەبارەت لاگۆنیلاس‌یش نزیكـەی30 سـەرباز كۆببونـەوەو پێدەچـێت ئـەو گرووپـەی كـە بـەرەو تیرابـۆی رێیـان كـردووە بەئاراستەی گۆتییێریزدا كشابنەوە، دیلـەكانیش بەسـەرهاتی ئـەم گرووپـەیان گێڕایەوە كە رێگـای لـەنێو چیاكاندا لێ هەڵـەبوو، ئاویـان لێ بڕابوو، هەروەها باسیان لەپێداویستیی فریاكەوتنو رزگاركردنـی كرد. بۆسـەكەم هەڵنەگرتو وەكی خۆی جێمهێشت چونكە بڕوام وا بوو ئەوانەی كە هـەڵهاتون لـەكاتێكی درەنگدا دێن. رۆلاندۆ ماوەی نزیكەی500 مەتر بۆسەكەی گواستبووەوە بـۆ جێیـەك كـە ئەمێسـتا دەتوانێـت كـەڵك لەیارمـەتی هـەموو پیـاوانی پێشـڕەو وەربگرێـت. سـەرەتا فـەرمانی كشـانەوەم دەركـردو، دواتـر پاشـگەزبوومەوەو سـەرنجمدا لۆژێـك وا دەخوازێـت كاروبارەكـان وەكیخۆیـان جێبهێڵـرێن. لەهەواڵێكدا لەكاتژمێر پێنجی پـاش نیـوەڕۆدا ئـەم دەنگوباسـە بڵاوكرایـەوە: سوپا بەهێزێكی زۆرەوە پێشڕەویی دەكات. هەربۆیـە چیدیمان لەبەردەمدا نـەماوە تـەنها چـاوەڕوانیكردن نـەبێت. پۆمبـۆم بـۆ ئـەركێكی پشـكنین رەوانـەكرد كـە لەباریدایـە بیرۆكەیـەكی رۆشـن دەربـارەی هەڵوێسـتەكە بەرچاوبخات..گوێم لەچـەند تەقەیـەك بـوو بەشـێوەیەكی پچڕپچڕ لـەماوەی

چرکەیەکدا دەنگی دایەوەو، پۆمبۆ هاتەوەو وتی سەربازەکان جارێکی دی کەوتوونەتە نێو بۆسەوە. وادیارە چەند کوژراوێك هەن و ئەفسەرێکیش بەپلەی مێجۆر دیلکراوە.
ئەمجارە ڕووداوەکە بەمجۆرە ڕوویدا: سەربازەکان لەسەر ڕێگای ڕووبارەکە پێشڕەوییان کردووەو بەبێ هیچ ورياییەك بلاوبوونەتەوە، ئیدی ڕووداوەکە تەواو کتوپڕ بووە. چوار کوژراون و پێنج بریندرابوون و22 سەرباز بەدیل گیراون. دوایین ئەنجامەکانیش بەمجۆرەیە:
(بەهۆی ئەوەی زانیاری دڵنیام دەستگیرنەبوو نەمتوانی ئەژماریان بکەم).

## 11ی نیسان

لەبەیانییەوە دەستمانکردە گواستنەوەی سەرجەم پێویستییەکانمان و، بەهۆی ئەوەشەوە کە کەلوپەلی پێویستی هەڵکەندنمان پێنەبوو، ڕۆبیۆمان لەچاڵێکی بچوکدا کە کەمێك لەئاستی زەوییەکەوە بەرزترە ناشت و ئانتی‌شمان هاوڕێی دیلەکان لەتەك پاسەوانی دواوە جێهێشت بۆ ئەوەی کار بۆ ئازادکردنیان بکات و هاوکات ئەو چەکانەش بهێنێتەوە کە کرابوون بەژێر خۆڵەوە. لەدواییدا کە گەڕایەوە ئەم ئەنجامەی لەتەك خۆیدا هاوردەوە: دیلکردنی دوو سەربازی دی لەگەڵ دوو چەك لەجۆری(گاران). نموونەیەك لەراگەیەندراوی ژمارە 1مان دایە دەست مێجۆرەکە بۆ ئەوەی بیگەیەنێتە دەست ڕۆژنامەنووسەکان. دەتوانین زیانەکانی سوپا بەمجۆرە دابەش بکەین: 10 کوژراو لەنێویاندا دوو ئەفسەر هەن، 30 دیل لەنێویاندا ئەفسەرێك بەپلەی مێجۆرو چەند ئەفسەرێکیپۆل هەن و هەرچی ئەوانی دیکەشە سەربازن، 6 زامدار یەکێکیان لەپێکدادانی یەکەمجاردا پێکرا..ئەوانی دیکەش پێکراوی شەڕی دووەمجارن. ئەمانە هەموویان سەر بە فیرقەی چوارن بەڵام ئەندامی لیواگەلێکی جیاجیان. هەروەها چەند

ئەفسەرو سەربازی پەرەشوت‌و سەربازی دی ناوچەکە هەن زۆربەیان لەو گەنجانەن کە هیچ ئەزمونێکیان نییە.

دوای نیوەڕۆ لەگواستنەوەی پێویستییەکانمان بۆ ئەو ئەشکەوتەی کە بۆی سازکراوە لێبوویەنەوە بەڵام هێشتا ڕێکمان نەخستووە. گاوگۆڵەکان ئەم ماوەیەی دوایی زۆر ترسان‌و هەڵهاتن، ئەمێستا تەنها گوێرەکەیەکمان ماوە.

بەیانی‌زوو لەکاتی گەیشتنماندا بۆ خێوەتگە تازەکە توشی هەریەک لەجواکین‌وئالیخاندرۆ بووین کە لەتەك هەموو پیاوەکانیاندا بەرەو لای ئێمە دەهاتن. پێدەچێت ئەو سەربازانەی کە ئۆستاکیۆ بینیونی دەستکردی خەیاڵی خۆی بن، لەبەرئەوە گواستنەوەمان بۆ شوێنە نوێیەکە بووە تەنها تەقەللایەکی نەزۆك.

ئێستگەکە باسی لە(پێکدادانێکی دیکەی خوێناوی)و نۆ کوژراو لەسەربازانی سوپاو(مردنی) چوار هاوڕێی ئێمە کرد. ڕۆژنامەنووسێکی خەڵکی چیللی وەسفێکی وردی خێوەتەکەمانی کردووەو وتویەتی وێنەیەکی منی بەبێ ریش‌و بە پایپێك بەدەممەوە دۆزیوەتەوە. دواتر لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوان لەبارەی ئەو بابەتەوە دەکەم چونکە هیچ هێمایەك نییە ئەوە بسەلمێنێت کە ئەشکەوتەکەی سەرەوە ئاشکرابووە...ئەگەرچی هەندێك بەڵگە هەن ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن.

## 12ی نیسان

لەکاتژمێر شەش‌ونیودا هەموو جەنگاوەرەکان کۆکرانەوە تەنها ئەو چوار پیاوە نەبێت کە جێیانهێشتین بۆ ئەوەی دیلبکرێن یاخود بکوژرێن..بۆ ئەوەم کۆکردنەوە تاوەکو کەمێك باسی ڕۆبیۆیان بۆ بکەم‌و ئەوەیان پێشچاوبخەم کە یەکەمین دلۆپە خوێن لەپێناوی بۆلیڤیادا ڕژێنرا خوێنێکی کوبایی‌بوو. سەرنجیانم بەرەو ئاقارێك کێشکرد کە پەیتاپەیتا خەریکە

لەنێوەنــــدی پێشـــڕەودا دەردەکــــەوێت و ئامـــانجی ســــوکایەتیکردنە بەکوباییەکان...یەکەمین نیشانەکانیشی رۆژی دوێنێ دەرکەوت کاتێك کامبا بـــەهۆی دەمــەقاڵێی لەتـــەك ریکـــاردۆدا وتـــی: رۆژ لـــەدوای رۆژ متمانـــەم بەکوباییــەکان کــەمتر دەبێتــەوە. ســەرلەنوێ داوام لێکردنــەوە بەتــەواوی و بەجۆرێکی توندوتۆڵ یەکگرتو و وابەستەی یەکدی بن چونکە ئەم یەکبوونە مــەرجێکی ســەرەکییە بــۆ گەشــەکردنی ســوپاکەمان...ئــەو ســوپایەی کــە بەردەوام تینی ئاگری چەکەکانی و دانبـەخۆداگریی لەشـەڕدا زیـاتر دەکات، بێئــەوەی لــەرووی ژمــارەوە زیــاد بکـات و نــەك هــەر زیــاد ناکـات بــەڵکو بەپێچەوانەوە لەم چەند رۆژەی دواییدا ژمارەکەی کەمیشی کردووە.

لەکاتــژمێر دووی پــاش نیــوەرۆداو پــاش نــەوەی دەســتکەوتەکانمان لەئەشکەوتێکدا کـە نـاتۆ ئامادەی کـردووە قـایمکرد، بـەخاویی هـەنگاومان هـەڵگرت...پێشڕەویکردنمان ئەوەنـدە خلیچك بـوو پـێش ئەوەی ماوەیـەکی ئـەوتۆ کـە شـایانی بـاس بێـت بـبڕین، لـەنزیك سەرچـاوەیەکی بچـوکی ئـاو لاماندا.

ژمارەی کوژراوان لەراگەیاندنەکەی سوپادا گەیشتە 11 سەرباز.

پێدەچـێت یـەکێك لەسـەربازەکانیان بـەکوژراوی دۆزیبێتـەوە یـاخود یـەکێك لەزامـدارەکانیان مردبێـت. کورتـە لێکچـەرێکم دەربـارەی کتێبەکـەی دۆبـرێ پێشکەش کرد.

نامەیەکی کۆدکراومان پێراگەیشت و کۆدەکانیمان کردەوەو پێناچێت گرنگ بێت.

## 13ی نیسان

بەمەبەستی ئەوەی بەخێرایی پێشڕەویی بکەین گروپەکەم بەسەر دوو تیمدا دابەشکرد. بـەڵام تەقەللاکـەم کـەڵکی نـەگرت چونکە پێشڕەوییەکمان نـەکرد

کــه شــایانی بــاس بێــت. لەکاتــژمێر چــواری دوای نیــوەڕۆدا گەیشــتینە خێوەتگەکەو...هەرچی ئەوانەشە کە بەجێمان دواتر لەکاتژمێر شەش‌ونیودا گەیشتن. پێشـان میگیـل لەوەتـەی بەیانییـەوە گەیشـتبووە خێوەتگەکـە... ئەشکەوتەکان هەر وەکی خۆیـانن‌و کـەس نەیدۆزیونەتـەوەو، هـەموو شتێك لەشــوێن‌وجێی خۆیــەتی: کورســییەکان، قاپ‌وقاچــاخەکان، فڕەنەکــەو، گەنمەشامییەکان. ئانیسیتۆورائول بۆ گەشتێکی پشکنین دەرچوون بەڵام سـەرکەوتونەبوو، پێویســتە سـبەینێ گەشــتێکی تــر بکرێــت‌و رووبــاری ئـیکیراش بگرێتــەوە. ئەمەریکییــە باکوورییــەکان ئــەوەیان ڕاگەیانــد کــە تـەیارکردنی بۆلیڤیا بەشـارەزایان پرۆژەیـەکی دێرینـەو هیچ پەیوەندییـەکی بـەو جەنگـە پارتیزانییـەوە نییـە کـە لـەو وڵاتـەدا بـەرپابووە. ڕەنگـە ئـەم دەستێوەردانەیان قۆناغی یەکەمی ڤێتنامێکی نوێ بێت.

## 14ی نیسان

ڕۆژێکە لەسەر تەرزێکی بێ گۆڕان گوزەر دەکات.

لەو پەناگەیـەوە کـە بۆ نەخۆشـان تـەرخانکراوە هەنـدێك پێویسـتیمان هـاورد بەشـی پێـنج ڕۆژ خواردنمـان دەکـات. لەئەشـکەوتەکەی سـەرەوەش قوتـووە شــیری گیراوەمــان هــاوردو دیارنــەمانی دڕدۆنگــی23 قوتووشمــان بــۆ دەرکەوت...پێشان مۆرۆ48 قوتووی لەئەشکەوتەکەدا جێهێشتبوو کەسمان کـاتی پێویسـتی ئـەوەمان نـەبوو بەمەبەسـتی خـواردن دەری بکـەین. شـیر یەکێك لەفاکتەرەکانی گەندەڵبوونمانە. لەئەشـکەوتەکەی سـەرەوەدا تـۆپێکی مۆرتـەرو دۆشـکەیەکمان بۆ پشتگیری پێگەکـەمان تـا ئـەو وەختـەی جـواکین دەگەڕێتەوە، دەرهاورد.

هێشــتا بەتــەواوی نەخشــەی پرۆســەکانی داهــاتوو لەزەینمــدا ڕۆشــن نەبووەتـەوە بـەڵام پێموابێـت باشـترین کارێـك کـە بیکـەین ئەوەیـە سـەرجەم

جەنگاوەران رووەو کارکردن لەناوچەی میۆپامبا هەنگاو هەڵبگرن و دواتر بەرەو باکور دەگەڕێینەوە، هەروەها وام پێ باشە دانتۆن وکارلۆس بنێرین بۆ ئەوەی، بەگوێرەی هەلومەرج، رێگای(سوکر ـ کۆشاپامبا) بەسەربکەنەوە. لەنووسینی راگەیاندنی ژمارە2 کە ئاراستەی گەلی بۆلیڤیا کراوەو هەروەها لەنووسینی راپۆرتی ژمارە4 کە ئاراستەی مانێلا کراوەو...دواتر کابرای فەرەنسی ئەرکی رەوانەکردنی لەئەستۆدەگرێت، لێبوومەوە. د/21.

## 15ی نیسان

جواکین لەتەك هەموو پیاوانی دواوەدا هات و بڕیارماندا سبەینێ رێکردن دەستپێبکەینەوە. جواکین لەنێو ئەو قسانەدا کە کردنی وتی سەرلەبەری ناوچەکە شانۆی پشکنینی فرۆکەکان بوو کە بەهۆی شەستیرەکانیانەوە تەقەیان بەنێو جەنگەڵەکاندا کرد. رۆژ بەبێ هیچ رووداوێکی تازە تێپەڕی. لەدوای تەرخانکردنی دۆشکەیەکی عەیار30 ملیمەتر بۆ پاسەوانی دواوە(بۆمارکۆس)، پڕچەککردنی گروپەکە تەواوبوو.

لەئێوارەدا چەند هۆشداریییەکم دەربارەی گەشتەکەو چەند دانەیەکی توندتریشم سەبارەت دیارنەمانی قوتووە شیرەکان خستەڕوو.

کۆدی بەشێك لەنامەیەکی دوورودرێژمان کردەوە کە لەکوباوە پێمان راگەیشتووە...لەنێو ئەو هەواڵانەدا کە لەنامەکەدا هاتووە دەنگوباسی ئەوە هاتووە کە لیچین شوێنی من دەزانێت و دواتر بەیاننامەیەك بۆ پشتگیری جوڵانەوەکە دەردەکات و لایەنی زۆر دوای بیست رۆژی دی بەنهێنی دێتەوە نێو وڵات.

یاداشتێك(ژمارە4)م بۆ فیدڵ نووسی و لەدوتوێیدا گرنگترین رووداوەکانم تۆمارکرد. بەهۆی کۆدو بەمەرەکەبی نهێنی نووسیم.

## 16ی نیسان

لەکاتــژمێر شەش‌وچــارەکدا پیــاوانی پێشــڕەو دەرچــوون‌و لەکاتــژمێر حەوت‌وچارەکدا ئێمــەش شــوێنیان کــەوتین‌و...ماوەیــەکی باشمــان بــڕی تــا گەیشــتینە رووبــاری ئــیکیرا بــەڵام تانیــاوئالیخانــدرۆ لەکاروانەکــە بــەجێمان. دواتــر بەشــەکەتیی گەیشــتن‌و، پلــەی گــەرمایانمان پێــوا تەماشــامان کــرد گەرمیی تانیا پتر لە39 پلەیەو گەرمیی ئالیخاندرۆش 38 پلەیە. بەجێمان‌و دواکــەوتنیان بــووە هــۆی تێکــدانی بەرنامــەی رێکردنەکــە. بەسەرپەرشــتی نیگرۆوسیرابیۆو لــەدووریی کیلۆمــەترێك لــەئیکیراوە جێمانهێشــتن‌و لــەرێگای ئەو گوندەوە کە پێیدەڵێن بیلاڤیستا درێژەماندا بەرێکردنەکەمان‌و لەوێنــدەر توشــی چــوار جوتیــار بــووین‌و بڕێــك پەتاتــەو گەنمەشــامی‌و هــەروەها بــەرازێکمان لێکــڕین. جوتیارەکــان لــەجوتیارە هــەژارەکان بــوون‌و لــەبینینی ئێمە لەم ناوچەیەدا زۆر ترسان.

شــەومان لــەئامادەکردنی خــواردن‌و خــواردنی نــانی ئێــوارەدا بەســەربرد‌و لەخێوەتەکەمانــەوە هــەنگاوێك رێمــان نــەکرد‌و...چاوەڕوانی شــەوی داهــاتوو بووین تاوەکو بەنهێنی بەرەو تیکوشا بەرێبکەوین.

## 17ی نیسان

دەنگوباسەکان جیاوازبوون‌و لەتەکیشیاندا بڕیارەکــان گــۆڕان...جوتیارەکــان وتیــان تیکوشــا کــات بەفیرۆدانــەو رێگایــەکی راســتەوخۆ هەیــە بــەرەو میۆپامبا(فاکاگۆزمان) زۆر لەرێگای یەکەم کورتترە‌و دەکرێت نیوەی دواتری بەسواری ئۆتۆمبیل ببڕدرێت. لەراستیدا لــەدوای دودڵییــەکی زۆر کــە دودڵ بووم بڕیارمانــدا راســتەوخۆ درێژە بەرێکردنەکــەمان بــەرەو میۆپامبــا بــدەین. نــاردم بەشــوێن ئــەو چــوارەدا کــە دواکــەوتون بــۆ ئــەوەی لەتــەك جــواکین‌دا

بمێننەوەو فەرمانمدا بەجواكین مانۆرێك بۆ چەواشەكردن لەناوچەكەداو بەمەبەستى رێگرتن لەجموجوڵى زۆر ئەنجام بداتو پاشان ماوەى سێ رۆژى دیكەش چاوەروانمان بكاتو بۆ خۆبەدورگرتن لەپێكداادان لەگەڵ دوژمندا تا ئەو كاتەى كە ئێمە دێینەوە لەناوچەكە نەجوڵێت. لەئێوارەدا هەواڵى ئەوەمان بیست كە یەكێك لەكوڕى جوتیارەكان لەگوندەكە شوێن بزربووەو لایەنى زۆر چووە لاى دەسەڵاتداران خەبەرمان لێبدات. بەڵام وێڕاى ئەوە بڕیارماندا بارودۆخ هەرچۆنێك بێت درێژە بەرێكردنەكەمان بدەین تاوەكو بوارى دەرچوون بۆ كابراى فەرەنسىوكارلۆس هەمواربكەین. موازیس بەهۆى ئێشوئازارى جگەرییەوە پەیوەندى بەگروپى جێماوانەوە كرد.

هەڵوێستى گشتیمان بەمجۆرەیە:

ئەگەر لەهەمان رێگاوە بگەرێینەوە روبەروى مەترسى پێكدادان لەتەك سوپایەكى ئامادە لە لاگۆنیلاس یاخود لەتەك ژمارەیەكى زۆر سەرباز كە لەتیكوشاوە پێشرەویى دەكات، دەبینەوە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئەم رێگایە وەبەربگرین بۆ ئەوەى لەپاسەوانى دواوە دانەبڕێین.

لەكاتژمێر دەى ئێوارەدا رێمانكردو بەخێرایى هەنگاومان هەڵگرتو ناوبەناویش وچانمان دەدا.. دواجار لەكاتژمێر چوارونیوى بەیانیداو، دواى ئەوەى نزیكەى دە كیلۆمەترمان بڕى، بۆ ماوەیەك نووستن لاماندا.

لەنێو ئەو جوتیارانەدا كە قسەمان لەتەكدا كردن پێدەچێت سیمۆن لەهەموویان زیاتر بەدەنگمانەوە بێت بەڵام دەترسێت..هەروەها جوتیارێكى دیكەش هەیە ئارەزومان دەكاتو ناوى ڤیدسەە بەڵام كەسێكى مەترسیدار دیارە. پیاوى(دەوڵەمەند)ى ناوچەكەیە. نابێت ئەوەشمان لەیادبچێت كوڕەكەى كارلۆس رۆداس شوێن بزربووە لەگوندەكەو رەنگە بەهۆى

کاریگەریی فیدس‌ەوە کە لەلایەنی ئابوورییەوە وەکی سەرداری ناوچەکە تەماشادەکرێت، خەبەرمان لێبدات.

## 18ی نیسان

رێمانکرد تاوەکو خۆرهەڵهات‌و ماوەیەکی کەم لەدوایین کاتژمێرەکانی شەو و سەرمایەکی زۆر سارددا خەوتین. لەبەیانیدا پیاوانی پێشڕەو چوون بۆ پشکنینی ناوچەکەو کوختی هندییەکیان دۆزییەوە بەڵام خاوەنەکانی زانیارییەکی ئەوتۆیان پێنەداین کە شایانی باس بێت. پاسەوانان ئەسپ سوارێکیان دەستگیرکرد لەدواییدا دەرکەوت یەکێکە لەکوڕەکانی کارلۆس ڕۆداس(جگە لەکوڕی یەکەم)و بەنیازی چوون بوو بۆ یاکۆندی ئیدی خاوپێیانمان دیلیان کرد. بەخاویی پێشڕەوییمانکردو لەکاتژمێر سێدا گەیشتینە ماتاگال ماڵی ئە.بادیلا کە برای هەژاری جوتیارێکی دیکەیە شوێنی نیشتەجێی ماوەی پێنج کیلۆمەترێك لێرەوە دوورە. پێشان پەنامان بردبووە بەر خانووەکەی. کابرا ترسا و هەموو رێیەکی گرتەبەرو ویستی بەوە قایلمان بکات ماڵەکەی جێبهێڵین بەڵام باران بەلێزمە دەستیکرد بەبارین‌و ناچاربووین بمێنینەوە.

## 19ی نیسان

بەدرێژایی رۆژ شوێنی خۆمان جێنەهێشت‌و سەرجەم ئەو جوتیارانەمان دەستگیرکرد کە لە هەردوو ئاراستەکەوە دەهاتن...ئیدی بەو هۆیەوە توانیمان ئاوێتەیەك لەخەڵکی دەستبەسەر بکەین. لەکاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆدا پیاوانی پاسەوان دیارییەکیان بۆ هاوردین لایەقی یۆنانییەکان بوو: رۆژنامەنووسێکی ئینگلیزە ناوی رۆس‌ەو بەهاوڕێیەتی هەندێك لەگەنجانی لاگۆنیلاس شوێن پێی ئێمەی هەڵدەگرت. ئەو بەڵگەنامانەی کە

لەتەك خۆیدا هەڵیگرتبوون راست بوون بەلام ویڕای ئەوە لەهەڵویستیدا شتێك هەبوو شوێنی گومان بوو: چونکە پاسپۆرتەکەی هێما بۆ ئەوە دەکات کە خوێندکارەو لەدواییدا وشەی خوێندکار کوژێنراوەتەوەو کراوە بە رۆژنامەنووس(خۆیشی دەڵێت وێنەگرم)...پاسپۆرتەکە ڤیزەی پۆرتۆریکۆی لێدراوە...

سەروەختێك کە هەندێك پرسیارمان سەبارەت کارتێکی رێکخەری شاری بۆینس ئایرس لێکرد کە لەنێو کاغەزەکانیدا دۆزرانەوە، دانی نا بەوەدا کە مامۆستای زمانی ئیسپانی بووە لەیەکێك لەفیرقە سەربازییەکاندا. هەروەها وتی سەردانی خێوەتگەکەم کردووەو چاوم بە رۆژانەکانی برۆلیۆ کەوتووە کە تیایدا باس لەگەشت و گەڕان و ئەزمونەکانی دەکات...بەمجۆرە ئەو گرفتەی کە پێشان گیرۆدەی بووین هێشتا هەر ماوە، مەبەستیشم لەو کێشەیە نەبوونی دیسپلین و بەرپرسیارێتی باوی لای هاوڕێیانمانە. هیچ زانیارییەکی ئەوتۆمان لەو گەنجانەوە دەستگیر نەبوو کە هاوڕێی رۆژنامەنووسەکە بوون. وادیارە هەواڵی گەیشتنمان بۆ ئێرە هەر هەمان شەو لەلاگۆنیلاس و بەهۆی ئەو زانیارییانەوە کە کەسێك داونی، بلاوبووەتەوە.

کاتێك گوشارمان بۆ کورەکەی رۆداس هاورد دانی نا بەوەدا کە براکەی و یەکێك لەپیاوەکانی ڤیدس بەمەبەستی خەبەرلێدانمان چوون بۆ لاگۆنیلاس بۆ ئەوەی ئەو خەلاتەیان دەستگیربێت کە بڕەکەی لەنێوان 500و1000 دۆلاردایە. ئێمەش وەکی تۆڵەسەندنەوەیەك دەستمان بەسەر ئەسپەکەیدا گرت و لای جوتیارە دیلەکانیش ئاشکرامان کرد.

کابرای فەرەنسی پێشنیاری ئەوەی بۆ کردین کە وەکی بەڵگەیەك بۆ نیازباشی ئینگلیزەکە، داوا لەئینگلیزەکە بکەین یاریدەی دەرچوونی ئەو میوانانە بدات کە لێرە ماونەتەوەو، کارلۆس لەدوای دودڵی بەو کارە قایل بوو. سەبارەت خودی خۆیشم دەستم لەهەموو بەرپرسیارێتییەك شۆرد.

لەکاتــژمێر نــۆدا گەیشــتین(    )و درێژەمانــدا بەگەشــتەکەمان بــەرەو میۆپامبا..کە بە وتەی جوتیارەکان لەوێندەر هەموو شتێك ئارامو هێمنە. ئینگلیزەکە بەو مەرجانە قایل بوو کە ئانتی پێشچاویخست، بە وەرگرتنی راپــۆرتێکی بچوکیشـــەوە کـــە خـــۆم..لەدەوروبـــەری نیوەشـــەودا (11/45)نووسیبوم، لەدوای ماڵئاواییکردن لەو هاوڕێیانەی کە دەڕۆنەوە، رێکردنەکـەمان بـۆ دەسـتگرتن بەسـەر گوندەکـەدا دەسـتپێکردو...لەتـەك پۆمبۆوتۆماوئۆربانۆدا مامەوە. دنیا زۆر ساردبوو ئیدی ئاگرێکی بچوکمان پەی کرد. لەکاتژمێر یەکی بەیانیدا ناتۆ هاتەوەو وتی گوندەکە لەدۆخی ئامادەباشـیدانو 20 سـەرباز لەسـەربازانی سـوپا شانبەشـانی دەورییـەی دانیشتوانی گوندەکە پێگەو بنکەیان داناوە. وادیارە یەکێك لەم دەورییانە توشی دیدەوانەکانمان بووە بەڵام هەردوو سەربازە چەکدارەکەیان بەچەکی م - 3و دوو دەمانچە، بەبێ تەقە خۆیاندا بەدەستەوە. داوام لەهاوڕێیان کرد بکشێنەوە چونکە کات درەنگبوو، ئەرکی رێکەوتن لەسەر بڕیارێکیش کە بۆیان بگونجێت بۆ رۆژنامەنووسە ئینگلیزەکەو کابرای فەرەنسیوکارلۆسم بەجێهێشت. لەکاتـژمێر چواری بەیانیـداو بێئـەوەی ئامانجەکـەمان بهێنینـە دی دەسـتمانکرد بەگەڕانـەوە بـەڵام کارلۆس مانـەوەی پـێ بـاش بـوو ئینجـا کابرای فەرەنسیش ئەمجارە کەمێك بەدودڵی شوێنی کەوت.

لەدەوروبەری کاتژمێر حەوتدا گەیشتینە ماڵی نیمیزیۆ کارابالۆ کە دوێنێ ئێوارە لەرێگا توشمان بوو و، قاوەی بۆ هاوردین. خانووەکەی جێهێشتبوو و، کلیلەکەی لەسـەر دەرگاکە دانابوو هەندێك لەخزمەتکارانیش لەترساندا زەنـدەقیان چـوو بـوو. پێشـان هاوڕێیـان گەنمەشـامیو کولەکـەیان کڕیبـوو هەربۆیـە دەسـبەجێ دەسـتمانکرد بـەئامادەکردنی خـواردن...لەدەوروبـەری یەکی دوای نیوەڕۆدا چاومان لەئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگربوو بەیداخێکی سپی هــەڵکردبوو لەتــەك خۆیشــیدا یاریــدەدەری حــاکمو پزیشــكو کەشیشــی

میۆپامبای هەڵگرتبوو کە بەرەچەڵەك ئەڵمانییە. هاتبوون داوای ئاشتییان دەکرد بەو مەرجەی لەسەر ئاستێکی نەتەوایەتی بێت. ئامادەیی خۆیشیان بۆ نێوانکاریی پیشاندا. ئانتی پێشنیاری ئەوەی پێشچاوخستن لەبەرامبەر لیستێك کەلوپەل و شتومەکدا کە پێش کاتژمێر شەش ونیو لەتەك خۆیاندا بۆمانی بهێنن، میۆپامبا لەماڵوێرانیی شەڕو پێکداادان بەدووربگیرێت، بەڵام ئەوان بەڵێنی هیچیان نەدا چونکە گوندەکە نان بەسوپا دەدات، هەموو ئەو شتەی کە ئەوان داوایانکرد درێژکردنەوەی کاتی دیاریکراوبوو، ئێمەش داواکەیانمان رەتکردەوە.

بۆ دەرخستنی نیازباشی خۆشیان، (دوو کارترێج)جگەرەو، هەواڵی دەستگیرکردنی هەرسێ هاورێمان لەمیۆپامباوگرتنی ناسنامەی ساختە بەدووانیان، لەتەك خۆیاندا بۆ هاوردبووین.

ئەم هەڵوێستە سەبارەت کارلۆس هەڵوێستێکی دژوارە...هەرچی دانتۆنە رەنگە بتوانێت خۆی لەم تەڵزگەیە قوتاربکات.

سێ فڕۆکە لەجۆری ئە.ت.6 لەکاتژمێر پێنج ونیودا هاتە سەر ناوچەکەو دەستیکردە بۆردومانی ئەو خانووەی کە خواردنمان تیایدا ئامادە دەکرد. بۆمبێك لەدووریی تەنها 15 مەتر لەئێمەوە کەوتە خوارەوەو ریکاردۆی بەسوکی زامدارکرد. ئەمە وەڵامی سوپابوو. پێویستە دەنگوباس بزانین بۆ ئەوەی بتوانین ترس وسامو دڵەراوکێ لەنێو ریزی سەربازەکاندا پەخش بکەین کە بە وتەی رۆژنامەنووسان..بێزاریی لەنێویاندا تەشەنەی سەندووە. لەکاتژمێر دوونیوی شەودا دەرچووین و دوو ئەسپمان بەشوێن خۆماندا کێش دەکرد، ئەسپی رۆژنامەنووسەکەو ئەسپە دەست بەسەردا گیراوەکە، بەرەو تیکوشا رێمانکرد کە تا کاتژمێر یەك ونیو بەردەوامبوو دواتر بۆ کەمێك نووستن لاماندا.

## 21ی نیسان

کەمێك ڕێمانکردو گەیشتینە ماڵی ڕۆزا کاراسکۆ کە بەگەرمیی پێشوازی لێکردین‌و هەر کەلوپەل‌و پێویستییەکمان ویست پێی فرۆشتین. ئێوارە تا خاڵی دوبەشبوونی ڕێگای میۆپامبا_ مۆنیگۆدۆ لەجێیەکدا کە پێیدەڵێن تابیریلاس، ڕێمانکرد. بیرۆکەی زاڵ ئەوەبوو کە لەتەنیشت سەرچاوەی ئاوێکەوەی بمێنینەوەو ناوچەکە بپشکنرێت بۆ دەستنیشانکردنی شوێنی بۆسەکە. هاوکات هۆکارێکی دیکەش هەبوو داوای مانەوەی لێدەکردین ئەویش ئەو هەواڵەبوو کە رادیۆ سەبارەت کوژرانی سێ بەکرێگیراو بڵاوی کردەوە: یەکەمیان فەرەنسیی‌و، دووەمیان ئینگلیزو سێیەمیان ئەرجەنتینییە. پێویستە لەراستیی ئەم هەواڵە بکۆڵرێتەوە بۆ ئەوەی سزای ئەنجامدەرانی بدەین‌و ببێتە سەرمەشق بۆ هەمووان. پێش خواردنی نانی ئێوارە سەردانی ڕۆداس‌ی بەساڵداچومان کرد کە باوکی فارگاسە کە لەنانکاهوازو کوژرا. هەلومەرجی ڕووداوەکەمان بۆ باسکردو پێدەچێت بەقسەکانی ئێمە قەناعەتی کردبێت. پیاوانی پێشڕەو ئەو ڕێنماییانەیان وەرنەگرت کە پێیاندرابوو و لەسەر ڕێگاکەیان بەردەوام بوون‌و ئەمەش بووە هۆی بێدارکردنەوەی سەگەکان کە بەتوندی دەستیان بەوەڕین کرد.

## 22ی نیسان

لەوەتەی بەیانییەوە هەڵەکان دەستیانپێکرد:

چونکە ڕۆلاندۆ‌و میگیل‌و ئانتۆنیۆ بۆ پشکنینی ناوچەکانی دەوروبەرو دانانی بۆسەیەك دەرچوون دوای ئەوەی بەنێو قوڵایی دارستانەکاندا پێشڕەوییان کرد توشی ژمارەیەك لەپیاوان بوون لەنێو ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگری بچوکدا لەجۆری ب.ف.ب کە شوێن پێی ئێمەیان هەڵدەگرت‌و سەبارەت جموجوڵەکانی دوێنێ شەومان پرسیاریان لەیەکێك لەجوتیارەکان

دەکرد. ئیدی بڕیاریاندا هەموویان دیلبکەن و بەوهۆیەشەوە ناچاربووین نەخشەکانمان بگۆڕین...بەلام ویڕای ئەوە بڕیارماندا بەرۆژ بۆسەیەك دابنێین و دەست بەسەر ئەو بارهەڵگرانەدا بگرین کە بە بارەکانیانەوە تێدەپەڕن و، بۆسەیەکی دیکەش بۆ سوپا دابنێین ئەگەر لەم لایەوە پێشڕەویی کرد.

ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگریان دەستگیرکردو دەستیان بەسەر بارەکەیدا کە بریتی‌بوو لەمۆز، گرت و، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لەجوتیارانیشیان دیلکرد بەلام جوتیارێکیان بەرەلاکرد کە دروست بۆ چاودێریی ئێمە هاتبوو..هەروەها وازیان لەکۆمەڵێك ئۆتۆمبیلی بچوکی بار هاورد کە لەکێڵگەکاندا کار دەکەن..دواتر نانخواردن لەرێکردنی دواخستین بەتایبەت حەزی ئەو نانە کە جوتیارەکان وتیان بۆتان دەهێنین وچاومان پێی نەکەوت.

بڕیارمدا ئۆتۆمبیلێکی بچوکی باری سەر بەکێڵگەکان بەهەموو ئەو خۆراك و خواردنانە باربکەین و لەتەك پیاوانی پێشڕەودا بەرەو خاڵی دوبەشبوونی رێگا لەتیکوشا کە دەکەوێتە دوریی چوار کیلۆمەترەوە، پێشڕەویی بکەین. کاتێکیش کە تاریکی کرد فڕۆکە بچوکەکە دەستیکرد بە جموجوڵ بەسەر پێگەکانماندا و سەگوەڕیش لەخانووەکانی دەورووبەرماندا رووی لەزیادبوون کرد. سەروەختێك کاتژمێر دەبووە هەشت خۆمان ئامادەکردبوو بۆ سەفەر ئەگەرچی گومانی تیادانییەو بوونمان لەناوچەکەدا ئاشکرابووە...لەناکاو گوێمان لەدەنگە دەنگێك بوو داوای چەك فڕێدان و خۆبەدەستەوەدانی دەکرد. دۆش دامان دەمی کردین بەتەڵەی تەقیوو، لەراستیدا هیچ ئاگام لەوە نەبوو چی دەگوزەرێت بەلام بۆ خۆشبەختیمان، پێویستیی و کەلوپەلە دەستبەسەرداگیراوەکان باری نێو ئۆتۆمبیلەکە کرابوون. دەسبەجێ کاروبارەکان بەشێوەیەکی خۆبەخۆ ئاسایی بوونەوەو هەموو لەوێندەر بووین تەنها لۆرۆ نەبێت...هەموو شتەکان وایان دەکرد باوەڕمان وا بێت کە

توشی وەی نەبووە چونکە پێکدادانەکە لەتەك ریکاردۆدا روویدا کە توشی ڕێبەری سەربازەکان بوو لەکاتێکدا کە بۆ گەمارۆدانمان بەسەر بەرزاییەکەدا سەردەکەوتن. وادیارە ڕێبەرەکە بەهۆی گوللەیەکەوە پێکراوە. بەسواری ئۆتۆمبیلەکەو سواری ئەو ئەسپانەی کە هەبوون(ژمارەیان شەش ئەسپ بوو)دەرچووینو پیاوەکان بەنۆرە سواری ئەسپەکان دەبوون دواتر هەموویانمان باری ئۆتۆمبیلەکە کردو ئەسپەکانماندا بەپیاوانی پێشڕەو. لەکاتژمێر سێ ونیوی بەیانیدا گەیشتینە تیکوشاو لەکاتژمێر شەش ونیویشدا گەیشتینە میزۆن کە کێڵگەی کەشیشەکەیە، هەموو بەبێ جوڵە لەشوێنێکی چاڵدا خۆمان مت کرد. ئاکامەکانی کارەکەمان خەراپ بوونو بەمجۆرە بوون: نەبوونی دیسپلینو دووربینیی لەلایەكو، لەلایەکی دیکەوە شوێن بزربوونی پیاوێك(کە ئومێدەوارم بەشێوەیەکی کاتیی بێت)...لەکیسچوونی ئەو ئازوخانە کە کڕیبومانو نەمانتوانی باریان بکەین. .لەدەستدانی سەفتەیەك دۆلار کە لەگیرفانی پۆمبۆ کەوتبووە خوارەوە. ئەمانە ئەنجامەکانی کارەکەمان بوو. .ئەمە ئەگەر باس لەوە نەکەین کە لەلایەن گروپێکی ژمارە کەمەوە بەسەرماندا دراو تێکشکاین. ئەگەرچی پیاوەکانمان ورەشیان بەرزە بەڵام هێشتا تەقەللایەکی زۆرمان ماوە کە دەبێت بۆ گۆڕینی پیاوەکانمان بۆ هێزێکی جەنگاوەر بیدەین.

## 23ی نیسان

ئەمڕۆمان بۆ پشوو تەرخانکردو هیچ ڕووداوێکی شایانی باس ڕووینەدا. لەنیوەڕۆدا فڕۆکە بچوکەکە(ئە.ت.6) دەستیکرد بەجموجوڵ بەسەر ناوچەکەدا. دەسبەجێ فەرمانمدا پاڵپشتیی پاسەوانیی بکرێت بەڵام هیچ شتێکی نوێ ڕووینەدا. کاتێکیش ئێوارە داهات ڕێنماییەکانم سەبارەت سبەینێ دەرکرد. بینینیۆوئانیسیتۆ دەچن بۆ گەڕان بەشوێن جواکینداو

ماوەی چوار رۆژم بۆ گەڕانەوە بۆ داناون. هەرچی کۆکۆرکامباشە ئەو ڕێگایە دەپشکنن کە بەرەو ریۆگراندی دەچێتو دەیسازێنن بۆ ئەوەی بەکەڵکی ڕێکردن بێت: ماوەی کارەکە چوار رۆژە. ئێمەش لەنزیك کێڵگە گەنمەشامییەکانەوە دەمێنینەوەو چاوەڕوانی هاتنی سوپا دەکەین...تا ئەو کاتەی جواکین پەیوەندیمان پێوە دەکاتەوە...کە فەرمانی پێدراوە لەتەك هەموو پیاوەکانیدا بگەڕێتەوەو...کەس جێنەهێڵێت تەنها نەخۆشان نەبێت. دانتۆنوبیلادۆورۆژنامەنووسە ئینگلیزەکە هیچیان دەنگوباسییان نییە. رۆژنامەکان خراونەتە ژێر چاودێرییەوەو ئێستگەکە چاوپێکەوتنی لەتەك سیان یاخود پێنج دیلی تردا راگەیاند.

## 24ی نیسان

پشکنەرەکان دەرچوونو خێوەتەکەمان لەدوریی ماوەی کیلۆمەتریك لەبەرزایی رووبارەکەو لەبناری بەرزاییەکدا هەڵدا کە تیایدا چاو تاوەکوماڵی دوایین جوتیار کە دەکەوێتە پێش کێڵگەی کەشیشەکە بەماوەی نزیکەی500مەتر، بڕ دەکات، (لەنێو کێڵگەکاندا حەشیشەی ماریهوانامان بینی چێنرابوو). جوتیارەکە هاتەوەو ئەمجارە نەرۆیشت...رووداوێکی سەیرە! دوای نیوەرۆ فرۆکەیەك لەجۆری(ئە.ت.6) بەهۆی شەستیرەکەیەوە دەستریژی لەکوختە بچوکەکە کرد...پاچۆ بەشێوەیەکیناديار شوێن بزربوو. ئانتۆنیۆ لەبەرئەوەی نەخۆش بوو دوای ئەوەی ڕێگاکەی پیشاندا، لەریزی دواوەدا مایەوە. ئانتۆنیۆ بۆ دیداری پاچۆو هێنانەوەی لەتەك خۆیدا لەماوەی پێنج کاتژمێردا..دەرچوو...بەلام نەگەڕایەوە...سبەینێ هەوڵ دەدەین بەشوێنیدا بگەڕێین.

# 25ی نیسان

رۆژێکی رەشە. پۆمبۆ لەکاتژمێر دەدا لەبنکەی چاودێرییەکەوە هاتەوەو لەوە ئاگاداری کردینەوە کە30 سەرباز هەنوکە بەرەو کوختە بچوکەکە پێشرەویی دەکەن. ئانتۆنیۆ بۆ چاودێریکردنی جموجوڵەکانیان مایەوە. لەکاتێکدا خۆمان بۆ بەیەکگەیشتنیان ئامادە دەکرد ئانتۆنیۆ هاتەوەو ئەوەی راگەیاند کە60 سەربازی دیو هەندێکی دیکەشی بینیوە خۆیان بۆ پەیوەندیکردن بە30 سەربازەکەوە ئامادە دەکەن. پیاوانی چاودێریی سەلماندیان ناکارانو دەرکەوت کارەکانی خۆیان بەپێی پێویست رانەپەڕێننو ئاگادارکردنەوەکانیشیان هەمیشە لەکاتێکی درەنگوەختدا دەگات. بڕیارماندا دەسبەجێ بۆسەیەکیان لەسەر ئەو رێیە بۆ دابنێین کە بەرەو خێوەتگەکە دەچێتو هەرخێرا رێچکەیەکی زۆر سەختمان لای جۆگەکەوە هەڵبژارد کە دەتوانین لەرێگایەوە دوریی50 مەتر ببینین. لەو جێیەدا لەتەك ئۆربانۆو میگیلدا پێگەمان داناو دۆشکەیەکمان پێبوو، پزیشکەکەوئارتۆرۆورائول‌یش لەبەری لای راستدا پێگەیان دانا بۆ ئەوەی رێگا لە هەر هەوڵێکی هەڵهاتنو پێشڕەویکردن لەو لایەنەوە بگرن... رۆلاندۆوپۆمبۆوئانتۆنیۆوریکاردۆو جۆلیۆوپابلیتۆوداریۆوویلیولویس‌ولیۆن پێگەیەکی پاشکەوتویان لەبەرەکەی تری جۆگەکەو بەمەبەستی پەلاماردانی یەکجارەکییان لەو رێگایەوە، داگیرکرد. ئانتی‌ش لەرێڕەوی جۆگەکەدا مایەوە بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر ئەوانەی کە دەیانەوێت پەنای بۆ ببەن. هەرچی ناتۆو ئۆستاکیۆشە ئەرکی ئەوەیان پێ سپێردرا کە تەماشابکەنو هەر لەگەڵ تەقە دەستپێکرد دەسبەجێ بەرەو دواوە بکشێنەوە. چینۆ ئەرکی مانەوە لەدواوەی پێسپێردرا بۆ پاسەوانیکردنی خێوەتگەکە. ئەم سیانە لەژمارەی پیاوەکانیان کەم کردەوە: پاچۆ کە رێگای لێ هەڵەبووە، تۆماولویس کە

چوون بۆ سۆراخی. دوای ئەوە بەماوەیەکی کەم پێشڕەوی هێزی دوژمن دەرکەوت کە لەئاست سەرسوڕمانی زۆرماندا لەسێ سەگی ئەڵمانی و رێبەرەکەیان پێکهاتبوو. سەگەکان ئاژەڵگەلێکی تووڕەو بەلەسەبوون و پێناچێت شوێنەکەمانیان ئاشکرا کردبێت، بەڵام وێڕای ئەوە لەسەر پێشڕەویکردنەکەیان بەردەوام بوون، منیش تەقەم لەسەگی یەکەم کردو نەم پێکا، کاتێکیش لولەی چەکەکەم رووەو رێبەرەکە وەرچەرخاندو تەقەم لێکرد تفەنگەکەم کە لەجۆری(م.2)ە لەکار کەوت و گوللەکەی نەتەقاند. چاوم لەمیگیل بوو سەگی دووەمی کوشت و، لەوەش زۆر دڵنیانیم. ئینجا مەسەلەکە کۆتاییهات و کەس نەکەوتە نێو بۆسەکەوە. لەلایەنی سوپاشەوە تەقەکردن بەشێوەیەکی پچڕپچڕ دەستیپێکردو کاتێک تەقەکان وەستان ئۆربانۆم نارد بۆ لای هاوڕێیان و فەرمانی کشانەوەی پێبوو..هەواڵی ئەوەیان بۆ هاوردم کە رۆلاندۆ زامداربووەو پاش کەمێك بەگیانی خوێناوییەوە هاوردیان بۆ لام و بەر لەوەی پزیشکەکە بتوانێت پلازمای بۆ بکات گیانی لەدەستدا. گوللەیەك ئێسکی رانی بڕیبوو و دەماری گەورەی قرتاندبوو هەربۆیە پێش ئەوەی بتوانین فریای بکەوین خوێنێکی زۆری لەبەر رۆیشتبوو. بەو هۆیەشەوە یەکێك لەباشترین پیاوی جەنگاوەری گروپەکەمان و هەڵبەت یەکێك لەکۆڵەکەکانیشیمان لەکیس چوو. ئەو هاوڕێیەم لەدەستدا کە لەوەتەی لاوێتییەوە پەیامبەربوو لەتابوری ژمارە4 لەرۆژانی گرانمـا تاوەکو ئەمرۆکە لەم سەرکێشییە شۆڕشگێڕییەماندا..هەموو ئەو شتەی کە دەتوانین دەربارەی مەرگی دڕدۆنگی ئەو لەپێناو داهاتوویەکی نارۆشندا بیڵێین ئەمەیە: (لاشە بچوکەکەت وەکی سەرکردەیەکی دلاوەر. سەرجەم ئاسمانی بەرینی داپۆشی). پاشماوەی کارەکەمان پرۆسەی کشانەوەیەکی خاوبوو. لەماوەیدا هەموو شتێك هێنران و لاشەکەی رۆلاندۆ بەرەو(سان

لویس)گواسترایەوەو دواتر پاچۆ پەیوەندی پێوە کردینەوە. ناوبراو رێگای لێتێکچوبوو و پەیوەندی بەکۆکۆوە کردو بەو هۆیەشەوە گەرانەوەکەی هەموو شەوی پێچوو. لەکاترژمێر سێدا لاشەکەمان لەنێو چاڵێکدا ناشت لەئاستی ئەرزەکەوە بوو. لەکاترژمێرچواردا بینینیۆوئانیسیتۆ هاتن و هەواڵی ئەوەیان لەتەك خۆیاندا هاوردبوو کە کەوتونەتە نێو بۆسەوە(یاخود راستتر بڵێین دوچاری پێکدادان بوون)لەتەك سوپاداو بەو هۆیەشەوە کەلوپەلەکانیان لەکیس چووە بەڵام خۆیان بەبێوەی هاتنەوە. پێدەچێت ئەم رووداوە، ئەگەر مەزەندەکانی بینینیۆ دروست بن، لەکاتی راگەیشتنماندا بەنانکاهوازو روویدابێت. ئەمێستا ئەو دوو دەروازە سروشتییەمان لەسەر داخراو پێویستە بەسەر چیاکاندا سەربکەوین چونکە رێگای بەرەو ریۆگراندی لەبەر دوو هۆکار رێگای هاتوچۆ نییە، ئەو دوو هۆکارەش ئەمانەن: یەکەم چونکە رێگایەکی سروشتییە. دووەم چونکە لەجواکین دوورمان دەخاتەوە کە دەنگوباسی‌نییە. لەئێوارەدا گەیشتینە شوێنی بەیەکگەیشتنی هەردوو رێگای نانکاهوازوو ریۆگراندی‌و شەومان لەوێندەر کردەوە بەو مەرجەی چاوەروانی کۆکۆوکامبا بکەین تاوەکو تیمە بچوکەکەمان گردبکەینەوە.

دەرەنجامەکانی پرۆسەکە خراپ بوون چونکە رۆلاندۆ گیانی لەدەستدا..جگە لەوە ئەو زیانانەی کە بەسوپاشمان گەیاند لەدوو پیاو و سەگێك تێپەری نەکرد چونکە پێگەو شوێنی بۆسەکە بەوردی لێی نەکوڵرایەوە یاخود دەستنیشان نەکراو، چونکە ئەو هاورێیانەمان کە تەقەیان کرد نەیانتوانی‌دوژمن ببینن. دواجار چاودێریی ئێجگار خەراپ بوو دەرفەتی ئەوەمان بۆ نەرەخسا تاوەکو بەپێی پێویست خۆمان ئامادەبکەین.

فرۆکەیەکی هیلیکۆپتەر دووجار لەنزیك ماڵی کەشیشەکەوە نیشتەوەو نازانین مەبەست لەو دابەزینە بۆ گواستنەوەی بریندارانە. هەروەها جارێکی

دی فرۆکەکان هاتنەوە بۆ بۆردومانکردنی شوێنە کۆنەکانمان و ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە دوژمن هەنگاوێك پێشڕەویی نەکردووە.

## 26ی نیسان

چەند مەترێك ڕێمانکردو فەرمانم دا بەمیگیل شوێنێك بدۆزێتەوە بەکەڵکی ئەوەبێت خێوەتەکەی تیادا هەڵبدەین و پیاوی دیکەشم بۆ گەڕان بەدوای کۆکۆو کامبادا نارد بەلام لەنیوەڕۆدا میگیل لەتەك دوو شوێنبزرەکەدا گەڕایەوە. وادیارە ڕێگاکەیان بۆ ماوەی چوار کاتژمێر ڕێکردن هەموارکردووەو تواناو ئەگەری ئەوەش لەگۆڕێدایە بۆ سەرکەوتن بەسەر بەرزاییەکەدا. بەهەرحاڵ بینینیۆوئۆربانۆم نارد بۆ لێکۆڵینەوە لەئەگەرو توانای سەرکەوتن لەشوێنێکی دی لەنزیك ئەو دۆڵی ڕووبارەوە کە دەرژێتە نێو نانکاهوازووەوە بەلام لەگەڵ خۆرئاوابووندا بەدەنگوباسی زۆر خراپەوە گەڕانەوە.

بڕیارماندا لەسەر ئەو ڕێگایە کە کۆکۆ لێیداوە درێژە بەرێکردنەکە بدەین تاوەکو ڕێگایەکیدی دەدۆزینەوە کە بەرەو ئیکیرامان ببات. ئەمێستا چاوەزارێکمان هەیە، شادن ناوی لۆلۆی لێنا. دواتر بۆمان دەردەکەوێت لەچارەی نووسراوە بژی یان نا.

## 27ی نیسان

ئەو ڕێگایەی کە کۆکۆ لێیدابوو لەماوەی دوو کاتژمێرونیودا بڕیمان. گەیشتینە جێیەك درەختێکی زۆری لەو پرتەقاڵە لێیە کە بەرەکەیان تاڵە...پێدەچێت ئەم شوێنە لەنێو نەخشەکەدا یەکسان بێت بەمازیکۆری. ئۆربانۆ وبینینیۆ لەسەر لێدانی ڕێگاکە بەردەوام بوون وماوەی کاتژمێرێك ڕێکردنیان خۆشکرد. شەوان کەش زۆر ساردە.

ئێستگەکانی بۆلیڤیا چەند راگەیاندنێکی سوپایان بڵاوکردەوە کە تیایاندا باس لەکوژرانی رێبەرێکی مەدەنی و راهێنەری سەگێك و سەگێك کە ناوی ریۆیەو، هەروەها کوژرانی دووان لەپیاوەکانی ئێمە دەکات کە بڕوایان وایە یەکێکیان کوبییەو نازناوی رۆبیۆی هەڵگرتووەو ئەوی دیکەشیان بۆلیڤییە. دەنگوباسی دڵنیامان دەربارەی دەستگیرکردنی دانتۆن لەنزیك کامیری بەدەست راگەیشت. پێدەچێت ئەوانی دیش زیندوبن ودەستگیرکرابن.
بەرزایی: 950مەتر.

## 28ی نیسان

تا کاتژمێر سێی دوای نیوەرۆ بەخاویی رێمانکرد. لەم کاتەدا ئاوی جۆگەکە وشکی کردبوو و، ئاقارێکی دیکەی وەرگرتبوو، ئیدی کەمێك لامانددا. لەبەرئەوەی کات درەنگبوو نەمانتوانی ناوچەکە بپشکنین هەربۆیە بۆ هەڵدانی خێوەتەکە بەرەو خاڵێك کە ئاوی لێیە گەڕاینەوە. ئەوەندە خواردن هەیە کە بەشی چوار رۆژ دەکات. سبەی، هەڵبەت لەدوای هەموارکردنی رێگاکە، هەوڵدەدەین لەرێگای ئیکیرییەوە بگەینە نانکاهوازو.

## 29ی نیسان

بەپشتبەستن بەهەندێك کون وکەلێن کە بینیمانن، ویستمان لەو جێیە دەربچین بەڵام کەڵکی نەبوو. ئەوەی دڵیخۆشکردین ئەوەبوو لایەنی کەم لەدۆڵێکداین لەمەترسییەوە دوورە. کۆکۆ وتی دۆڵێکی تەگەرەم بینیوەو هێشتا نەمپشکنیوە. سبەینێ هەمووومان ئەو کارە جێبەجێ دەکەین. بەتەواوی، بەڵام زۆر بەدرەنگیی، کۆدەکانی نامەی ژمارە35 مان کردەوە، گرنگترین شت کە لەنامەکەدا هاتووە برگەیەکە داوای مۆڵەتی من دەکات

تاوەکو ناوم لەپەراوێزی بانگەوازێك لەپێناوی ڤێتنامدا بنووسرێت کە بەدەستپێشخەریی بیرتراند روسێڵ(24) دەرکراوە.

## 30ی نیسان

دەستمانکردە سەرکەوتن بەسەر بەرزاییەکەداو ئەوەی کە ئێمە بەدۆڵمان دەزانی بەرەو قەدپاڵێکی ئێجگار سەختی بردین بەڵام رێرەوێکی بچوکمان دۆزییەوەو دەتوانین درێژە بەسەرکەوتنەکە بدەین. لەنزیك لوتکەکەوە شەومان بەسەردا هات، ئیدی لەوێندەرو بێئەوەی هەست بەسەرمایەکی زۆر بکەین لێی خەوتین.

لۆلۆ بووە قوربانیی سروشتی توندوتیژی ئۆربانۆ چونکە گوللەیەکی نا بەتەوقی سەرییەوە.

ئێستگەی هاڤانا ئەوەی راگەیاند کە هەندێك رۆژنامەنووسی خەڵکی چیللی وتویانە جەنگەکانی پارتیزانیی بەجۆرێك پەرەیان سەندووە کە یەکی پرۆژەگەلی شارەکان دەخەن و جەنگاوەران بەم دواییانە دەستیان بەسەر دوو ئۆتۆمبیلی بارهەڵگری پڕ لەخۆراکدا گرتووە. رۆژنامەی(سییمبەر) یش دیدارێکی لەتەك باریانتۆسدا بلاوکردووەتەوە، ناوبراو لەچاوپێکەوتنەکەیدا دانی ناوە بەوەدا کە لەنێو سوپاکەیدا راوێژکارگەلی یانکیی هەن و شۆڕشی چەکداریی بۆلیڤیاش لەئەنجامی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی بۆلیڤیادا بەرپابووە.

# لێکدانەوەی مانگانە

ئەگەرچی بەهۆی گیانلەدەستدانی رۆبیۆورۆلاندۆوە دوو زیانی گەورەو بەسویێمان لێکەوت بەلام کاروبار تارادەیەك سروشتیی پێشچاوەدەکەوێت. مەرگی رۆلاندۆ گورزێکی ئازاربەخش بوو بەر من کەوت چونکە بیرم لەوە کردبووەوە هەر لەگەڵ کردنەوەی بەرەی دووەمدا سەرکردایەتی بدەمە دەست. چوار پرۆسەی نوێمان ئەنجامداو ئەنجامەکانیشیان بەشێوەیەکی گشتی باش بوون و تەنانەت یەکێکیان زۆر سەرکەوتوبوو: دیارە مەبەستم لەشەری بۆسەکەیە کە رۆبیۆ تیایدا گیانی لەدەستدا.

لەچەند لایەنێکی تریشەوە هێشتا گۆشەگیرییەکەمان سەتاپاگیرەو نەخۆشیی پەلاماری هەندێك لەهاورێیانیداوەو بەو هۆیەشەوە ناچاربووین هێزەکانمان دابەش بکەین و ئەم دابەش کردنەش بەشێکیگەورە لەچالاکییەکانمانی ئیفلیج کردووە: تا ئێستاکە نەمانتوانیوە پەیوەندی لەگەڵ جواکیندا نوێبکەینەوەو... بنکەی جوتیارییش گەشە ناکات، ئەگەرچی بەڵگەی ئەوە هەیە کە ماوەیەکی ترو بەهۆی پەیوەندی رێکوپێکەوە دەتوانین بەشێکی زۆر لەجوتیاران لەحکومەت دابڕین. هەر کاتێکیش ئەو پرۆسەیە جێبەجێبوو ئەو دەمە جوتیاران دەسبەجێ دێن بەپیرمانەوەو دەستگیرۆییمان دەکەن. هیچ خۆبەخشێکی نوێ پەیوەندی بەشۆڕشەوە نەکردووەو لەپاڵ کوژراوەکانیشماندا لۆرۆمان لێ ونبووە کە دوابەدوای پێکدادانی تابیریلاس دیارنەماو شوێنبزربوو.

ئەمانەیخوارەوە تێبینییەکانی منن دەربارەی ستراتیژی سەربازیی:

ا)ئەوچاودێرییەی کە سەپێنرابوو بەسەرماندا تائێستا کارا نییە. هەندێك جەڕاندوینی بەلام بەهۆی لاوازیی هێزەکانی دوژمن و کەنەفتیی دەربارەی

جموجوڵکردن، یەکی جموجوڵمان ناخات. واش بڕوا دەکرێت لەپاش ئەم بۆسـەیەی دواییـەوە دژ بەسـەگەکان و راهێنەرەکـەیان، خـۆی ناخاتـە مەترسییەوەو نایەتە نێو دارستانەکانەوە.

ب)هێشـتا کـاروکردەوەی پشـکنین لـە هـەردوو بـەری رووبارەکـەوە هـەر بەردەوامەو بڕوام وایە بوونم لێرە لای دەسەلاتداران ئاشکرابووە بەتایبەت لەدوای بڵاوکردنەوەی وتارێکم لەهاڤانا. ئەوەی کە گومانیشی تیادا نییە ئەوەیە کە ئەمەریکییە باکورییەکان بەشێوازێکی دڕندانە بەشداری شەڕەکە دەکەن و هەر ئێستا دەستیانکردووەتە رەوانەکردنی فڕۆکەی هیلیکۆپتەرو سـەربازی پەڕەشـوت، ئەگەرچـی هـیچ شـوێنەوارێکی ئـەو سـەربازانەشمان لەناوچەکەدا نەبینیوە.

ج)سوپا(یاخود لایەنی کەم بەتالیۆنێك یاخود دووان)تەکنیکی خۆیان رووەو باشـیی گۆڕیـوە. چـونکە لـەتابیریلاس کتـوپڕ دایـان بەسـەرماندا و لەمیزۆنیش ورەیان نەرووخا.

د)ئامادەکردن وسـازاندنی جوتیـاران شـوێنەواری نییـە تـەنها لەهەنـدێك لایەنـەکانی چـالاکیی پرسـیارکردنمان دەربـارەی جموجوڵـەکانی دوژمـن نـەبێت، بـەڵام وێـڕای ئـەوە ئـەم چـالاکیيە بوێرانـەو کـارا نییـەو پێموابێـت دەتوانین دەستبەرداری بین.

رەوشیچینۆ گۆڕاوەو دەبێتە جەنگاوەر تا سەروەختی کردنەوەی بەرەیەکی تر یاخود بەرەی سێیەم.

دانتۆن وکارلۆس بوونە قوربانیی پەلەکردن و خواستی بەدبەختانە سەبارەت سەفەرکردن و هەروەها ئەوەی کە من رێگام لێنەگرتن ئەم هەنگاوە چەوتە هەڵبهێنن و...بەدەستگیرکردنی (دانتۆن)یش پەیوەندییەکانمان لەتەك کوبادا بچڕاو، بەهۆی دەستگیرکردنی(کارلۆس)یشەوە پلانی کارکردن لەئەرجەنتین لەکیسچوو.

بــەکورتی، ئــەم مانگــە مانگێــك بــوو تیایــدا کاروبارەکــان بەشــێوەیەکی سروشتیی بەرێوەچون، ئەمە ئەگەر ئەو رووداوە کتوپڕانە لەبەرچاوبگرین کــە زادەی جــەنگی پــارتیزانین. ورەی هــەموو ئــەو جەنگاوەرانــە بــەرزە کــە سەرکەوتووانە ئەزمونی سەرەتایان وەکی جەنگاوەر بڕیوە.

## 1ی ئایار1967

بەدەم هەمواركردنی ڕێگاكەوە زۆر بەخاویی لەسەری ڕێماندەكرد، بەهۆی جەژنی یەكی ئایارەوە ئاهەنگمان گێڕاو تا ئێستا نەمانتوانیوە بەهێڵی جیاكەرەوەی نێوان دوو ڕووبارەكە ڕابگەین.

(ئەلمیدا)لەهاڤانا گوتارێكی خوێندەوەو ستایشی منو جەنگاوەرە بۆلیڤییە بەناوبانگەكانی كرد، گوتارەكەی دوورودرێژبوو بەڵام باش بوو. ئەو خۆراكەی كە ماومانە بەشی سێ ڕۆژ دەكات. ناتۆ بەهۆی قۆچەقانییەكەیەوە چۆلەكەیەكی كوشتو...بەو هۆیەشەوە چووینە نێو چاخی چۆلەكەوە.

## 2ی ئایار

بەهۆی هەلومەرجی جوگرافیاوە ڕۆژێك لەڕێكردنی خلیچكو سەرلێتێكچوون بوو. لەڕاستیدا بەهۆی سەختیی ڕێگاكەوە كە پڕبوو لەدڕكودالّو ئەو گژوگیاو ڕووەكانەی كە هاوڕێیان سەرقاڵی بڕینی بوون، ماوەی تەنها دوو كاتژمێر ڕێمانكردو، توانیم لەیەكێك لەبەرزاییەكانەوە جێیەكی نزیك لەنانكاهوازو ببینم، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە كە زۆر بەرەو باكور ڕێمانكردووە بەڵام هیچ شوێنەوارێكی ئیكیری‌م بەدی نەكرد. فەرمانمدا بەمیگیل‌وبینینیۆ لەتەقەللایەكدا بۆ ڕاگەیشتن بەئیكیری یاخود لایەنی كەم یەكێك لەسەرچاوەكانی ئاو چونكە ئاومان لێبڕاوەو پێمان نەماوە، بەدرێژایی ڕۆژ خەریكی هەمواركردنی ڕێگاكەبن. ئەو خواردنەی كە ماومانە... بەچەند ژەمێكی سوك بەشی پێنج ڕۆژ دەكات. هێشتا ڕادیۆی هاڤانا لەسەر هەڵمەتەكانی ڕاگەیاندنی بۆ سەر بۆلیڤیا بەردەوامە بەڵام هەواڵەكانی لەزێدەڕۆیی خاڵیی‌نییە.

بەرزایی:1760مەتر، لەسەر بەرزایی1730مەتر بۆخۆم لێی‌خەوتم...

## 3ی ئایار

ڕۆژێکی تەواومان لەخۆشکردنی ڕێگادا بەسەربرد، بەمجۆرە دەرفەتی ئەوەمان بۆڕەخسا ماوەی دوو کاتژمێر یاخود کەمێك زیاتر ڕێبکەین و گەیشتینە جۆگەیەکی ئاو کە پێدەچێت ڕووەو باکور بڕوات. سبەینێ ناوچەکە دەپشکنین تاوەکو بزانین جۆگەکە پارێزگاریی لەئاراستەکەی خۆی دەکات یان نا، هاوڕێیانیش لەولاوە خەریکی لێدانی ڕێگا دەبن. ئەو خواردنەی کە پێمان ماوە بەچەند ژەمێکی سادە بەشی تەنها دوو ڕۆژ دەکات. ئەمێستا لەبەرزایی1080مەترو بەرزایی200 مەتر لەئاستی ڕووباری نانکاهوازوین. گوێمان لەدەنگی بزوێنەرێك بوو لەدورەوە دەهات بەڵام نەمانتوانی سەرچاوەکەی دەستنیشان بکەین.

## 4ی ئایار

لەوەتەی بەیانییەوە کارکردن لەسەر لێدانی ڕێگا بەردەوام بوو، لەولاشەوە کۆکۆوئانیسیتۆ چوون جۆگەکە بپشکنن و لەکاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆدا هاتنەوەو وتیان جۆگەکە ڕووەو خۆرهەڵات و بەرەو باشور وەردەچەرخێت و پێدەچێت ئیکیری بێت. ئەو دەمە فەرمانمدا ئەو هاوڕێیانە بانگ بکرێنەوە کە ڕێگاکە لێدەدەن و شوێن ڕێرەوی سەرەولێژبوونەوەی جۆگەکە بکەون. لەکاتژمێر یەك ونیودا دەرچووین و لەکاتژمێر پێنجداو پاش ئەوەی ئەمجارە دڵنیابووین کە ئاراستە گشتییەکەی ڕووەو خۆرهەڵات ـــ باکور ـــ خۆرهەڵاتەو، بەم پێیە ئەگەر ئاراستەکەی نەگۆڕێت ناشێت ڕووباری ئیکیری بێت، ڕاوەستاین و لاماندا. ئەو هاوڕێیانەی کە ڕێگاکە هەمواردەکەن وتیان ئاومان نەدۆزیوەتەوەو لەڕێگاش تەنها توشی خاكوزەوی دێم و بێئاو بووین. ئیدی ئەو دەمە بڕیارماندا بەئاراستەی ڕووەو ڕیۆگراندی درێژە

بەرێکردنەکە بدەین. تەنها(کاکاری)(25)یەکمان راوکرد ئەویش بەهۆی بچوکییەکەیەوە بەشی ئەو هاوڕێیانەمان بوو کە خەریکی لێدانی رێگاکەن. خواردنێکی کەمی بەشی دوو رۆژمان پێماوە.

ئێستگەکە دەستگیرکردنی لۆرۆی راگەیاند کە دوابەدوای پێکرانی لاقی دیلکراوە. پێدەچێت تا ئێستا لێدوانەکانی باشبن و هەموو بەڵگەکانیش هێما بۆ ئەوە دەکەن کە لەکوختەکەدا زامدار نەبووە بەڵکو لەشوێنێکی دی بریندارببووەو لایەنی زۆر لەکاتی هەوڵی هەڵهاتندا پێکراوە.

بەرزایی:980 مەتر.

## 5ی ئایار

بەکردەوە ماوەی پێنج کاتژمێر رێمانکردو مەودای 12تا14 کیلۆمەترمان بڕی و گەیشتینە خێوەتێك کە هەریەك لەئانتی وبینینیۆ ئامادەیان کردبوو. ئەمێستا ئەوەتاین لەکەنارەکانی جۆگەی کۆنگری کە لەسەر نەخشەکە دەرناکەوێت، لەدوور لەباکوری ئەوجێیەوە کە پێمان وابوو لەو شوێنەدایە. ئەمەش ئەم پرسیارانەی وروژاند: رووباری ئیکیری لەکوێیە؟ ئایا بینینیۆو ئانیسیتۆ لەئیکیری لەناکاو نەدرا بەسەریاندا؟ ئایا پەلاماردەران لەپیاوانی جواکین نین؟ بڕیارماندا هەنوکە رووەو خێوەتی ورچەکە بڕۆین. لەوێندەر خۆراکێکی ئەوتۆی لێیە کە بەشی دوو رۆژ دەکات و...دواتر بەرەو خێوەتگە کۆنەکە بەرێدەکەوین. ئەمرۆکە دوو باڵندەی گەورەو باڵندەیەکی(کاکاری)مان راوکردو بەوهۆیەشەوە دەرفەتی هەڵگرتنی هەندێك خواردن و عەمبارکردنی یەدەگی دوو رۆژمان بۆ رەخسا کە بریتییە لە: شۆربای نێو کیسی بچوك و گۆشتی پارێزراو. ئەرکی راوکردن بەئانتی وکۆکۆ وپزیشکەکە سپێردرا.

لەنێو دەنگوباسەکاندا هەواڵی ئەوە بڵاوکرایەوە کە دۆبرێ لەکامیری بەتۆمەتی رابەرایەتیکردن و رێکخستنی جەنگیپارتیزانیی دەدرێتە دادگا. سبەینێ دایکی دەگاتە بۆلیڤیاو تا ئێستا ئەم مەسەلەیە مایەی بگرەوبەردەیەکی زۆرە. لۆرۆهیچ دەنگوباسێکی نییە.

بەرزایی: 840 مەتر.

## 6ی ئایار

دەرکەوت خەملاندنەکانمان سەبارەت ماوەی راگەیشتن بەخێوەتگەی ورچەکە راست نەبوو چونکە ماوەی بەرەو کوختە بچوکەکەمان لەگوێ جۆگەکەوە لەوە دورتربوو کە باوەڕمان دەکرد، هەروەها رێگاکە داخرابوو ئیدی ناچاربووین رێرەوێك بکەینەوە. لەکاتژمێر چوارونیوداو پاش ئەوەی کەژوکێوێکمان بری بەرزاییەکانیان دەگەیشتە1400مەترو پیاوەکانیشمان لەدورودرێژیی رێگاکە جاڕسبون، گەیشتینە کوختەکە. نانی پێش کۆتایی، کە خواردنێکی زۆر کەم بوو، خواردمان. هاورێیانمان پۆرێکیان شکارکردو دامانە بینینیۆ بۆ ئەوەی لەتەك ئەو دوو پیاوەدا کە، بەگوێرەی ریزبەندیی قافڵەکە، بەشوێنییەوە بوون، دابەشی بکات.

هێشتا دەنگوباسەکان بایەخ و گرنگییەکی زۆر بەمەسەلەکەی دۆبرێ دەدەن.

بەرزایی: 1100 مەتر.

## 7ی ئایار

لەکاتێکی زوودا گەیشتینە خێوەتگەی ورچەکەو تەماشامانکرد هەشت قوتووە شیر لەچاوەڕوانی هاتنی ئێمەدان...بەرچاییەکی بەتامман ئامادەکرد. هەندێك پێویستیمان لەئەشکەوتەکەی تەنیشتەوە دەرهاورد، لەنێویاندا مۆزەرێك بۆ ناتۆ کە وەکی بازۆکا کەڵکی لێوەردەگرین، لەتەك پێنج رومانەی دژە تانکدا. بەهۆی نۆبەیەکی رشانەوەوە تەندروستیی ناتۆ رووی لەخراپیی کرد. هەر کە گەیشتینە خێوەتگەکە بینینیۆو ئۆربانۆو لیۆن و ئانیسیتۆو بابلیتۆ بۆ بەسەرکردنەوەی کێڵگە بچوکەکە دەرچوون. دوایین شۆربا کە مابوومان لەتەك دوایین ژەمە گۆشتدا خواردمان بەلام لەنێو ئەشکەوتەکەدا برێك بەزوچەوریمان دۆزییەوەو هەروەها هەندێك شوێنپێ و پیچێك سوکە زیانمان بەدی کرد کە بەڵگەی ئەوەن هەندێك لەسەربازەکان سەردانی ئێرەیان کردووە. بەیانی زوو پشکنەرەکان بەدەستی خاڵیی گەڕانەوە. چونکە سەربازەکان لەکێڵگەکەدا نیشتەجێن و گەنمەشامییەکەیان لێکردووەتەوە،(لەوەتەی هاتنمەوە بۆ ئێرەو هەڵگیرسانی فەرمیی جەنگی پارتیزانیی تائێستا ماوەی شەش مانگ تێپەڕیوە).

بەرزایی: 880 مەتر.

## 8ی ئایار

داوام لەهاوڕێیان کرد ئەشکەوتەکان لەکاتێکی زوودا رێکبخەن و تەنەکە چەورییەکەش دەربهێنن بۆ ئەوەی بتوانین هەندێك شوشەی لێ پڕبکەین..چونکە ئەمە هەموو ئەو خواردنەیە کە ماومانە. لەدەوروبەری کاتژمێر دەونیودا گوێمان لەهەندێك تەقەی پچڕپچڕ بوو لەشوێنی بۆسەکەو دواتر دەرکەوت دوو سەربازی بێچەك بەرەو رووباری نانکاهوازو سەردەکەوتن ئیدی پاچۆ وایدەزانی لەپێشڕەوی سوپان و تەقەی لێکردن و

لاقیانی پێکاو زگیشیانی کەمێك برینداركرد. پاچۆ پێی‌وتن بۆیە تەقەم لێکردن چونکە بەگوێی فەرمانەکانتان نەکردم کە داوای راوەستانم لێکردن..هەڵبەت ئەوانیش گوێیان لەشتی لەو جۆرە نەبوو. بۆسەکە بەپێی پێویست دانەنرابوو، هەروەها پاچۆش بەشێوازێکی دەمارگیرانە رەفتاری کرد. دواتر دوای ئەوەی ئانتۆنیۆو چەند کەسێکی دیکەم بۆ بەری لای راستی بۆسەکە ردوانەکرد، هەڵوێستەکە رووی لەباشی کرد. دوو سەربازەکە وتیان هێزەکانی سوپا لەنزیك ئیکیری نیشتەجێن بەڵام ئەوان باوەڕیان بەقسەکانیان نەکرد. لەنیوەرۆدا دوو سەربازی دیکەمان دیلکرد کە لەسەر رێگای رووباری نانکاهوازو رێیان دەکردو وتیان بەمەبەستی شکار دەرچووین و لەکاتی گەڕانەوەیاندا لەرێگای ئیکیری‌یەوە بەتالیۆنەکەیان لەوێ نەمابوو و رۆیشتبوو ئیدی دەسبەجێ کەوتونەتە عەوداڵ و پەیوەندی پێوە کردنەوەی..دیسان هەر درۆیان دەکرد. لەراستیدا سەربازەکان لەکێڵگەیەکی شکاردا نیشتەجێبوون و پاش ئەوەی فرۆکەی هیلیکۆپتەرەکەیان لەپێدانی ئازوخە پێیان دەستی هەڵگرت ئەوانیش ئەم دوو پیاوەیان رەوانەکرد بۆ هاوردنی خواردن لەکێڵگەکەی ئێمە. لەدوو سەربازەکەی یەکەمجار چوار قوتوو لەگەنمەشامیی وشککراوەوسەوزو چوار قوتوو ماسیمان دەست بەسەردا گرت، ئەمە وێڕای شەکروقاوە، بەمجۆرە لەم رۆژەدا زگە برسییەکانمان بەخواردنی چەوریی تێرکردو ئەوەندە زۆرمان خوارد هەندێك لەهاوڕێیانمان ئینتەلایان کرد.

لەکاتێکی درەنگوەختدا پیاوانی چاودێریی هەواڵی دووبارە دزەکردنەوەی سەربازەکانیان پێراگەیاندین کە دەگەنە سەرەولێژیی رووبارەکەو دواتر دەگەڕێنەوە دواوە. بارودۆخەکە ئەو کاتە گەیشتە ئەوپەڕی نائارامیی کاتێك کە27 سەرباز رووەو ئێمە هاتن و پێدەچێت هەستیان بەبوونمان کردبێت، ئیدی بەرێبەریی مولازم لۆریدۆ رووەو ئێمە پێشڕەوییان کرد..لۆریدۆ

دەستیکردە تەقەکردن بەڵام دەسبەجێ لەتەك دوو سەربازی دیکە لەشوێنی خۆیدا کوژرا. تاریکیی خەریکبوو بەری بینینی هەموو شتێکی دەگرت هەربۆیە پیاوەکانمان پێشڕەوییان کردو شەش سەربازیان دیلکرد، هەرچی سەربازەکانی تریشە بەرەو دواوە کشانەوە.

ئەنجامی بۆسەکە بمجۆرە بوو: 3کوژراو 10دیل دووانیان زامدارن، 7پارچە چەك لەجۆری م.1 و 4مۆزەر لەگەڵ پێویستیگەلی کەسیی و کەلوپەل و بڕێك لەخۆراك...کە لەتەك چەورییشدا برسێتییەکەمانی دامرکاندەوە. دواتر لەشوێنی خۆماندا لێیخەوتین.

## 9ی ئایار

لەکاتژمێر چواردا لەخەو هەستاین(بەدرێژایی شەو، خەو نەچووە چاوم)و، دوای ئەوەی پرسیارمان لەسەربازەکان کرد دواتر ئازادمان کردن. دەستمان بەسەر پێڵاوەکان وجلوبەرگە سەربازییەکانیشیاندا گرت و لەبری ئەوە هەندێك جلوبەرگی سادەمان پێدان...هەرچی ئەوانەشە کە درۆیان لەتەکدا کردین تەنها جلوبەرگەکانی ژێرەوەمان لەبەریاندا هێشتەوە..لەدواییدا لەتەك زامدارەکانیاندا رووەو کێڵگەکە بەرێکەوتن. ئێمەش لەکاتژمێر شەش ونیوداودوای ئەوەی لەئەشکەوتەکە لامانداو دەستکەوتەکانمان تیایدا شاردەوە، بەرەو جۆگەی مەیمونەکان گەڕاینەوە. هیچی خواردنمان لانەماوە تەنها چەوریی نەبێت...هەستم بەشەکەتیی زۆر کردو ماوەی دوو کاتژمێری تەواو لێی نووستم و دواتر بەخاویی و قورسیی هەنگاوم هەڵگرت و درێژەمدا بەرێکردن...پێدەچێت رەوشی هاوڕێیان هەموویان هەر وەکی رەوشی من وا بێت، لەگەڵ گەیشتنماندا بەیەکەمین سەرچاوەی ئاو دەستمانکرد بەخواردنی شۆربا لەگەڵ چەوریی، پیاوە لاوازەکان و ئەوانی دیش دوچاری ئێش وئازاری هەوکردنیپێیەکانیان بوون.

لەئێوارەدا سەرکردایەتی سوپا راگەیاندنێکی دەرکرد باس لەژمارەی ئەو کوژراو و بریندارانە دەکات کە بەهۆی پێکدادانەکەوە بەرکەوتن بەڵام هیچ شتێکی سەبارەت دیلەکانیان باس نەکرد ...هەروەها راگەیاندنەکە باسی لەرووودانی شەڕگەلی گەورەو بەرکەوتنی زیانی گەورە بەئێمە، کرد.

## 10ی ئایار

بەشێنەیی درێژەماندا بەپێشڕەویکردنەکەمان. سەرەوەختێك گەیشتینە ئەو خێوەتگەیەی کە لاشەکەی رۆبیۆی لێنێژراوە، تەماشامانکرد ئەو گۆشتە وشککراوەیە کە جێمان هێشتبوو لەبارێکی خراپدابوو، هەروەها چەورییشمان دۆزییەوەو هەرچییەکمان بەردەست کەوت کۆمان کردەوە. لەوێندەر سەربازەکانمان نەبینی. زۆر بەوریایی لەنانکاهوازو پەڕینەوەو بەتێپەڕبون بەدۆڵێکدا کە پێشان میگیل دۆزیبوویەوەو جاروبار رێچکەکانی پێویستییان بەهەموارکردن هەبوو، رێکردنمان بەرەو بیریرندا دەستپێکرد. لەکاتژمێر پێنجدا لاماندا و پارچەیەك لەگۆشتە وشککراوەکەمان بەچەورییەوە خوارد.

بەرزایی:800 مەتر.

## 11ی ئایار

پیاوانی پێشڕەو لەپێشەوە دەرچوون ومنیش مامەوە گوێم لەهەواڵەکانی ئێستگە دەگرت. پاش کەمێك ئۆربانۆ هات و وتی بینینیۆ بەرازێکی کێوی راوکردووەو داوا دەکات رێگای پێبدرێت ئاگرێك پەی بکات و خواردنەکە ئامادەبکات. ئەو دەمە بڕیارماندا لەشوێنی خۆماندا بمێنینەوە بۆخواردنی گۆشتی بەرازەکەو، بینینیۆوئۆربانۆومیگیلیش راسپێردران درێژە بەکاری لێدانی رێگاکە بەئاراستەی دەریاچەکەدا بدەن. لەکاتژمێر دووی پاش

نیوەڕۆدا سەرلەنوێ ڕێکردنمان دەستپێکردەوەو دواتر لەکاتژمێر شەشدا خێوەتەکەمان هەڵدا. هەرچی میگیل‌و هاوڕێیانی دیکەیە لەسەر کاری هەموارکردنی ڕێگاکە بەردەوام بوون.

دەبێت بەجدیی قسە لەتەك بینینیۆوئۆربانۆدا بکەم. چونکە یەکەمیان لەڕۆژی شەڕەکەدا قوتوویەك خواردنی خواردو خۆی نەکرد بەخاوەنی و، دووەمیشیان لەخێوەتگەکەی ڕۆبیۆدا بەشێك لەگۆشتە وشککراوەکەی خوارد.

لەنێو هەواڵەکاندا ئەوە هات کە کۆلۆنێل ڕۆشای سەرکردەی فیرقەی چوار کە لەناوچەکەدا دەست بەکارە، لەپۆستەکەی لابرا.

## 12ی ئایار

بەهێواشی ڕێمانکردو ئۆربانۆوبینینیۆ دەستیانکرد بەکردنەوەی ڕێگاکە. لەکاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆدا ئەو دەریاچەیەمان بینی کە لەنزیکی پێنج کیلۆمەترێك لێرەوە دوورە، ئینجا دوای ئەوە بەماوەیەکی کەم ڕێییەکی کۆنمان دۆزییەوە. لەدوای کاتژمێرێك لەڕێکردنیش گەیشتینە کێڵگەیەکی گەورەی گەنمەشامی وکولەکە بەڵام هیچ شوێنەوارێکی ئاومان لەناوچەکەدا بەدی نەکرد. خواردنێکمان لەکولەکەی سورەوکراو بەچەوریی و لەگەنمەشامی برژاو ئامادەکردو بڕێك گەنمەشامی سەوزمان عەمبارکرد، دواتر پشکنەرەکان هاتنەوەو هەواڵی دۆزینەوەی ماڵی شیشۆیان لەتەك خۆیاندا هاوردەوە، ئەم ماڵە هەمان ئەو ماڵەیە کە مولازم هینری لۆریدۆ لەڕۆژانەکانیدا ئاماژەی بۆ دەکات‌و وەکی مرۆڤ‌و دۆستێکی باش باس لەخاوەنەکەی دەکات. شیشۆ لەماڵەوە نەبوو بەڵام چوار کرێکارو کارەکەرێك لەوێندەربوون، کارەکەرەکە مێردەکەی هاتبوو بەشوێنیدا تاوەکو لەتەك خۆیدا بیباتەوە بەڵام ئێمە ڕێگامان پێنەدا. بەرازێکمان لەبرنج و پێی

سـوورەوکراوە بەکولەکـەوە خـوارد. پۆمبـۆوئـارتۆرۆوویلـی وداریـۆ بـۆ پاسـەوانیی کەلوپەلـەکان مانـەوە بەڵام بـۆ بەدبەختیی ئـاوی ماڵەکـە نـەبێت هیچ ئاوێکی دیکەمان دەست نەکەوت.

لەکاتـژمێر پێنج ونیـودا بـەخاویی هـەنگاومان هـەڵگرت و کشاینەوە دواوەو هاوڕێیـان هـەموو بەدەسـت تەندروسـتیی خراپـەوە گیرۆدەبـوون. هێشـتا خـاوەن ماڵەکـە بـۆ ماڵـەوە نەگـەڕابووەوە هەربۆیـە یاداشـتێکمان سـەبارەت نرخی ئەو زیان و شتومەکانە بۆ بەجێهێشت کە لەتەك خۆماندا بردمان و بۆ کارەکەرەکـەو هەریـەك لـەکرێکارەکانیش لـەبری کارەکانیـان دە دۆلارمـان پێدان.

بەرزایی:950 مەتر.

## 13ی ئایار

رۆژێکـــــە لــــــە قرقێنەدانــــــەوەو باوبــــــژ(باوبــــــژی نێــــــو زگ)و رشانەوەوسکچـون...کۆنشـیرتۆ پەتیارەیـەکی تـەواوە. بێجوڵـە لەشـوێنی خۆماندا ماینەوە بەڵکو بتوانین گۆشتی بەرازەکە هەرس بکەین و تینوێتیمان بـەدوو قوتـوو ئـاو بشـکێنین. هەستم بـەئازارێکی زۆرکـرد بـەرۆکی بەرنـەدام تـاوەکو رشـامەوە. لـەئێوارەدا خواردنێکمـان لەگەنمەشامیسـوورەوکراو و گەنمەشامی برژاو و بەرماوەی خواردنیدوێنێمان بۆ ئـەو کەسـانە ئامادەکرد کـە گـەدەیان گۆشـتی بەرازەکـەی هـەرس کردبـوو. هـەموو ئێسـتگەکان لەدەنگوباسـەکانیاندا ئـەو هەواڵـەیان دووبارەکردەوە کـە دەڵێت هەڵمـەتێکی کوبایی کە لەڤەنزەوێللا دابەزێنراوە دوچاری شکست بووەو حکومەتەکەی لیـۆنی بەئاشـکرا نـاو و پلـەی سـەرجەم پیـاوانی بەشـداری پرۆسـەکەی بڵاوکردووەتـەوە. هـیچ کـام لـەناوەکانم نەناسـی بـەڵام بەڵگـەکان ئامـاژە بـۆ رووداني پرۆسەیەکی سەرنەکەوتوو دەکەن.

# 14ی ئایار

لــەکاتێکیزوودا بــەبێ پەرۆشــییەکی زۆرو لەهەوڵێکــدا بــۆ راگەیشــتن بەدەریاچــەی بیریرنــدا لەرێگایەکــەوە کــە بینینیــۆوکامبــا لەســەروەختی پشــکنیندا دۆزیبویانــەوە، دەرچــووین. بــەر لــەجولکردنی کەژاوەکــە کۆبوونەوەیــەکم بــۆ پیاوەکــان کــردو هەنــدێك ســەرنجم ســەبارەت ئــەو تەنگوچــەڵەمانە پێشچاوخســتن کــە رەنگــە روبــەرومان ببنــەوە، بەتایبــەتی گیرگرفتی خواردن. رەخنەم لەبینینیۆ گرت چونکە قوتوویەك خۆراکی بەبێ هاورێیان خواردو دواتریش نکوڵی لەوە کرد، هەروەها رەخنەم لەئۆربانۆ گرت چونکە گۆشتە وشککراوەکەی بەدزییەوە خوارد، هەروەها لەپای ئەو پەرۆشییەش کە سەبارەت هەر شتێك کە پەیوەندی بەخواردنەوە هەبێت دەریدەبڕێت بەڵام هاوکاریکردن لەبوارەکانی دیکەدا رەتدەکاتەوە، رەخنەی ئانیسیتۆم کرد. لەکاتی کۆبوونەوەکەماندا گوێمان لەفڕەفڕی ئۆتۆمبیلی بارهــەڵگربوو لێمــان نزیکدەبوونــەوە، ئیــدی لەئەشــکەوتێکی نزیکــەوە دەوروبــەری 50 کولەکــەو دوو کــیس لەدانەوێڵــەی گەنمەشــامیمان وەکــی ئازوخە بۆ رۆژانی رەش شاردەوە. رێگاکەمان بەئاراستەی هەندێك کێڵگەدا بــۆ کردنــەوەی هەنــدێك فاسۆلیاجیهێشــتو لــەناکاو چــەند تەقینەوەیــەکی بــەهێز لەنزیکمانــەوە کەوتنــەوە کــە تەماشــامان کــرد فڕۆکــەکان(بەشێوازێکی درندانــە)بۆردومانمــان دەکــەن بــەڵام بۆمبــەکانیان لــەدوریی دوو یــاخود ســێ کیلۆمــەتر لــەولای پێگەکانمانــەوە کەوتنــەخوارەوە. درێژەمانــدا بەســەرکەوتن بەســەر بەرزاییــەکی بچــوکداو دەریاچــەکەمان بینــی، لەولاشــەوە هێشــتا ســەربازەکان بــەدەم تەقــەوە بەشــوێنمانەوەن. ســەروەختێك خــۆر ئــاوابوو گەیشــتینە خانویــەکی چــۆڵو بۆمــان دەرکــەوت کــە خاوەنەکــەی ماوەیەکــە چۆڵی کردووە، لەنێو خانووەکەدا سەرباری ئاو ئازوخەیەکی زۆر هەبوو.

ئێوارەنانێکی بەلەزەتم خوارد کە لەگۆشتی سورەوکراو و برنج پێکهاتبوو و، تا کاتژمێر چوار لەوێندەر مایەوە.

## 15ی ئایار

·هیچ ڕووداوێك نییە کە شایانی باس بێت.

## 16ی ئایار

لەوەتەی دەستپێکردنی ڕێکردنەکەوە توشی ژانە سکێکی توندی هاوڕێ بەرشانەوەوسکچون بووم کە دواتر دوای ئەوەی بەتەواوی لەهۆش خۆم چووم بەهۆی دۆمۆرۆڵەوە بەسەریدا زاڵبووم. هاوڕێیان هەڵیانگرتمو بردمیانە سەر جۆلانەیەك و. .کاتێك بێداربوومەوە ئازارەکە لەکۆڵم بوو بووەوە بەلاّم کتومت وەکی منداڵی شیرەخۆرە(پیسایی)م کردبوو بەخۆمداو، خۆم پیس کردبوو. هاوڕێیەك پانتۆڵێکی خۆی پێدامو بەهۆی بێئاوییەوە نەمتوانی خۆم پاك بکەمەوە. هەموو ڕۆژمان لەشوێنی خۆماندا و نیمچە بێهۆش بەسەربرد. دواتر کۆکۆوناتۆ بۆ پشکنینی ناوچەکانی دەوروبەر دەرچوون و ڕەوتێکیان دۆزییەوە بەرەو باشور ـ باکور دەڕوات. لەئێوارەدا ڕێگاکەمان گرتەپێش تا تریفەی مانگ نەما ئیدی ئەو دەمە بۆ پشوودان لاماندا.

پەیامی ژمارە 36 مان وەرگرت، هێما بۆ ئەو گۆشەگیرییە سەرتاپاگیرە دەکات کە دەوروخولی داوین.

## 17ی ئایار

تا کاتژمێر یەکی پاش نیوەڕۆ درێژەماندا بەڕێکردن...دواتر لەدارتاشخانەیەك لاماندا کە، بەگوێرەی بەڵگەکان، خاوەنەکەی لەوەتەی

ســـێ ڕۆژە جێی هێشـــتووە. لەوێنـــدەر ئەمانـــەمان دۆزییـــەوە: شـــەکر، گەنمەشامی، چەوریی، ئارد، ئاوی عەمبارکراو لەبەرمیلدا کە پێدەچێت لەدورەوەڕا هێنرابن. لەوێندەر بۆ هەڵدانی خێوەتەکە ماینەوەو پیاوەکانیش بۆ پشکنینی ئەو ڕێگایانە دەرچوون کە لەدارتاشخانەکەوە دەردەچێت و لەنێو دارستانەکاندا وندەبێت. رائول وتی ئەژنۆم هەوی کردووەو ئازاری زۆرەو بواری ڕێکردنم نادات. ئیدی پزیشکەکە موشەمایەکی بەهێزی دژ بە هەوی بۆ ئامادەکردو سبەینێ کێم و زۆخەکەی خاڵیی دەکاتەوە.

ماوەی نزیکەی 15 کیلۆمەترمان بڕی.

بەرزایی: 920 مەتر.

## 18ی ئایار

رۆبیرتۆ جوان مارتین

ئەمڕۆمان لەبۆسەیەکدا بەسەربرد کە بۆ وریابوون لەهاتنی کرێکارانی دارتاشخانەکە یاخود سەربازەکان دامانتابوو بەڵام کەس دیارنەبوو. میگیل لەتەك پابلیتۆدا دەرچوو و چاوگەیەکی ئاویان لەجێیەکدا دۆزییەوە کە نزیکەی دوو کاتژمێر لەخێوەتگەکەوە دوورەو دەتوانین لە لارێیەکەوە بیگەینێ. پزیشکەکە کێمەکەی لەئەژنۆی رائول خاڵیی کردەوەو 50 سی سی لە شلەمەنی زۆخکردوی لێدەرهاوردو داوایلێکرد چارەسەرێکی دژەهەوکردن بەکاربهێنێت. ناتوانێت هەنگاوێك هەڵبهێنێت. ددانی یەکەمم لەماوەی ئەم شۆرشەدا هەڵکەندو قوربانیی پێشکەوتووش کامیابوو بەڵام کاروبارەکان بەباشی بەرێوەچون. نانێکمان خوارد کە لە فرنێکی بچوکدا برژاندمان و لەئێوارەدا شۆربایەکی ترسناکمان خواردو بەدوایدا بەوێنەی نەخۆشکەوتنی سەگی هار نەخۆش کەوتم.

## 19ی ئایار

پیاوانی پێشڕەو لەکاتێکی زووەوە دەرچوون بۆ ئەوەی لەپێگەی خۆیاندا لەو بۆسەیەدا کە لەسەر دووریانەکە دامانناوە دابمەزرێن و، نۆرە هاتە سەر ئێمە بۆ چوونە شوێنی بەشێك لەو پیاوانە کە کاتی‌خۆی ئەرکی سۆراخی رائول و هاوردنیم بۆ جێیەکی لەنزیك خۆمانم پێ‌سپاردبوون. هەرچی پاشماوەی ناوەراستیشە بەرەو ئەو چاوگەی ئاوە کە دۆزرابووەوە درێژەیدا بەرێکردنەکەی تاوەکو لەوێندەر کیسە ئازوخەکان دابنێت و دواتر گەڕایەوەو رائول‌ی لەتەکدابوو کەخەریکە لەنەخۆشییەکەی چاکدەبێتەوە. ئانتۆنیۆ پشکنینێکی ماوەکورتی بەرەو خواروەکە ئەنجامداو لەوێندەر خێوەتێکی چۆڵی سەربازان و هەندێك خواردنی وشککراوەی دۆزییەوە. نانکاهوازو نزیك بووەتەوەو بڕوام وا بوو کە بەم زووانە دەگەینە لای خوارووی رووباری کۆنگری. بەدرێژایی شەو و بەپێچەوانەی پێشبینییەکانەوە باران باری و ئەمێستا هێندەمان ئازوخە هەیە کە بەشی دە رۆژمان دەکات، هەروەها لەنزیکیشمانەوە کولەکەو گەنمەشامی هەیە.

بەرزایی: 780 مەتر.

## 20ی ئایار

ئەمرۆکە لەخێوەتگەکەمان نەهاتینەدەرەوە. لەبەیانیدا گرووپی ناوەراست بۆسەیەکی داناو لە دوای نیوەرۆدا گرووپی پێشڕەو بەسەرکردایەتی پۆمبۆ شوێنی گرتەوە کە تەماشای کرد شوێنی بۆسەکە لەبارنییە. میگیل لای خواروی جۆگەکەی پشکنی و لەدوریی ماوەی دوو کاتژمێر رێکردن، بەڵام بەبێ هەڵگرتنی کەلوپەل، رووباری نانکاهوازوی دۆزییەوە. گوێمان لەدەنگی تەقەیەك بوو سەرچاوەکەیمان نەزانی و لەنزیك کەنارەکانی نانکاهوازووەوە شوێنەواری خێوەتگەیەکی دیکەی سەربازیمان دۆزییەوە

که بۆ دوو پەلی سەربازیی ئامادەکرابوو. ڕووداوێکی دڵتەزێن ڕوویدا کاتێك کە لویس خۆی وایپیشاندا کە گیاندەدات، دواتر سزامداو نەمهێشت لەبۆسەکەدا بەشداری بکات، وادیارە ئەویش بەم سزایە زۆر تورەبوو.

باریانتۆس لەلێدوانە ڕۆژنامەوانییەکەیدا ئەوەی ڕەتکردەوە کە سیفەتی ڕۆژنامەنووس بەدۆبرێ بدات و وتی داوا لەکۆنگرێس دەکەم یاسایەك بۆ چەسپاندنی فەرمانی لەسێدارەدان دەربکات، زۆربەی ڕۆژنامەنووسە بیانییەکان پرسیاریان سەبارەت دۆبرێ لەباریانتۆس کرد ئەویش بەهۆی بەهانەگەلێکی ئێجگار لاوازەوە داکۆکی لەهەڵوێستی خۆی کرد. کەنەفترین مرۆڤی ئەم سەرزەمینە خۆیەتی.

## 21ی ئایار

یەکشەممە. لەشوێنی خۆمان نەبزواین و لەکاتی نیوەڕۆداو هەر دە پیاو بەنۆرە بۆسەکەمان دانایەوە. باری تەندروستیی رائول بەخاویی ڕوو لەباشبوونەو پزیشکەکە بۆ جاری دووەم زامەکەی ئەژنۆی کردەوەو ئەمجارە40 سیسی لەشلەی زۆخکردوی لەئەژنۆی دەرهاورد. بەو هۆیەشەوە پلەی گەرمییلەشیدابەزی بەڵام هێشتا ئازاریهەیەو هەروەها توانای ڕێکردنیشینییە..لەئێستادا بیرو هۆشی منی بەخۆیەوە خەریك کردووە. ئێوارە خواردنێکیخۆشمان خوارد کە لەشۆرباو ئاردو گۆشتی وشککراوەی قیمەکراو و کولەکە لەگەڵ زەلاتەی گەنمەشامی سورەوکراو پێکهاتبوو.

## 22ی ئایار

پێشبینییەکەم ڕاست دەرچوو چونکە لەنیوەڕۆدا گۆزمان ڕۆبلزی خاوەنی دارتاشخانەکە بە شرە ئۆتۆمبیلێکی جیپ بەهاوڕێیەتی شۆفیرەکەی و

کورەکەی هات. لەسەرەتادا پێدەچوو لەسەر داوای سوپا هاتبێت بۆ ئەوەی بزانێت لەناوچەکەدا چ باسە بەڵام هێدی هێدی لەبوونمان دڵنیابووەوەو هەستەکانی نێو ناخی خۆی لادرکاندین و دواتر قایلبوو بەوەی لەئێوارەدا بچێت بۆ گۆیتێریزو کورەکەشی بەبارمتە لای ئێمە جێبهێڵێت تاسبەینێ دەگەرێتەوە. بریاری ئەوە درا پێشرەوەکە بەدرێژایی رۆژ لەبۆسەکەدا بێت و ئێمەش تا کاتژمێر سێی پاش نیوەرۆ چاوەروانی هاتنەوەی پیاوەکە بکەین. دەبوو دواتر بکشێینەوە چونکە رەنگە هەڵوێستەکە روو لەمەترسی بکات. هەموو شتێك هانماندەدات بروامان وابێت کە پیاوەکە ناپاکیمان لەتەکدا ناکات بەڵام نازانین داخۆ دەتوانێت بێنەوەی گومان دروست بکات کەلوپەلە پێویستەکانی ئێمە بکرێت. لەدواییدا قەرەبووی ئەو زیانانەیمان کردەوە کە دوچاری خاك و زەوییەکەی بوو بوو، ئەویش کۆمەڵێك زانیاری دەربارەی هەڵوێست لەتاتارنداولیمۆن وئیبیتا پێدراین...پێدەچێت ئەم شوێنانە سەربازیان لێنەبێت تەنها(ئیبیتا)نەبێت کە ئەفسەرێك بەپلەی مولازمی یەك لەوێندەرە.. دواتر ئەوەی پێراگەیاندین کە هەرگیز نەچووە بۆ تاتارنداو ئەو زانیارییانەش کە دەربارەی ئەو شوێنە هەیەتی لەخەڵکی تری وەرگرتووە.

## 23ی ئایار

رۆژێکی بارگرژونائارامە. بەدرێژایی رۆژ خاوەن دارتاشخانەکە نەگەرایەوە. ئەگەرچی هێمنیی باڵی بەسەر ناوچەکەشدا کێشاوە بەڵام لەئێوارەدا بریاری کشانەوەماندا و ئەو مێردمنداڵەشمان لەتەك خۆماندا برد کە تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو. ماوەی کاتژمێرێکی تەواو لەژێر تریفەی مانگدا رێمانکردو دواتر لەرێ لاماندا و لێی نووستین. ئەوەندەمان خواردن لەتەك خۆماندا برد کە بەشی دە رۆژمان دەکات.

## 24ی ئایار

لەپاش دوو کاتژمێر ڕێکردن گەیشتینە نانکاهوازو و پێدەچوو چۆڵەوانیی بێت. لەدەوروبەری کاتژمێر چواردا ڕووەو لای خواروی ڕووباری کۆنگری هەنگاومان هەڵگرت. بەهۆی هەنگاوە خاوەکانی ڕیکاردۆومۆرۆوە بەشێنەیی ڕێمانکردو گەیشتینە ئەو خێوەتگەیەی کە لەیەکەمین ڕۆژی گەشتەکەماندا پەنامان بۆ برد. هیچ شوێنەوارێکمان لەدوای خۆمانەوە جێنەهێشت و هیچ شوێنەوارێکی تازەشمان بەدی نەکرد. لەنێو هەواڵەکانی ئێستگەدا دەنگوباسی ئەوە بڵاوکرایەوە ئەو داوایەی لەلایەن هابیاس کۆربۆس سەبارەت دۆبریێ پێشکەش کراوە ڕەتکراوەتەوە. بڕوام وا بوو کە ئەوەتاین لەدوریی کاتژمێرێك یاخود دوو کاتژمێر لەسالادیۆوەو کاتێك کە دەگەینە لوتکەکە بڕیاردەدەین چیبکەین و چی نەکەین.

## 25ی ئایار

لەدوای کاتژمێرونیوێك لەڕێکردنی بەردەوام و بێئەوەی هیچ شوێنەوارێك لەپاش خۆمانەوە جێبهێڵین گەیشتینە سالادیۆ. ماوەی نزیکەی دوو کاتژمێر ڕووەو سەر ڕۆیشتین تاوەکو سەرچاوەی ڕووبارەکەمان دۆزییەوە. لەوێندەر نانمان خواردو لەکاتژمێر سێ ونیودا ماوەی دو کاتژمێر ڕووەو سەر درێژەماندا بەڕێکردن... سەروەختێك کاتژمێر بووە شەش خێوەتەکەمان لەبەرزایی 1100 مەتردا هەڵداو هێشتا نەگەیشتبووینە لوتکەکەو ئەگەر مێردمنداڵەکە ڕاست بکات هێشتا دە کیلۆمەترمان ماوە تا دەگەینە کێڵگەی باوەڵێ کە پڕە لەبەروبومی کشتوکاڵیی. بینینیۆ بڕوای وایە هێشتا ماوەی ڕۆژێکی تەواو ڕێکردنمان ماوە تا بەماڵی ڤارگاس لەسەر

رووباری ریۆگراندی، رادەگەین. دواتر بڕیاردەدەین سبەینێ چیبکەین و چینەکەین.

## 26ی ئایار

لەدوای دوو کاتژمێر لەرێکردن کە لەماوەیدا گەیشتینە ئەو لوتکەیە کە نزیکەی1200 مەتر بەرزە، گەیشتینە کێڵگەیەك خاوەندارییەکەی بۆ باوەگەورەی مێردمنداڵەکە دەگەڕێتەوەو دوو جوتیار کاریان تیادا دەکردو هەر کە چاویان پێمان کەوت بەرەو رووومان هاتن. کابرای بەسالاچوو زاوایان بوو و خوشکێکی ئەوانی هاوردبوو. جوتیارەکان پێیان وتین باوکی مێردمنداڵەکە دەستگیرکراوەو هەموو شتێکی درکاندووە. هەروەها وتیان30 سەرباز هەن لەئیبیتا نیشتەجێن و بەردەوام خەریکی پشکنینی ناوچەکەن. بەرازێکی برژاوو کولەکەی سورەوکراومان لەگەڵ چەورییدا خوارد. ناوچەکە ئاوی لێنەبوو، لێرەش هەر لە(ئیبیتا)وە دەیانهاوردو دواتر لەبەرمیلدا عەمباریان دەکرد. لەئێوارەدا بەرەو زەوی جوتە براکە بەرێکەوتین و ماوەی هەشت کیلۆمەترمان بڕی: چوار کیلۆمەتر بەئاراستەی ئیبیتاو چواری دیکەش رووەو خۆرئاوا. بەیانی زوو گەیشتینەجێ.
بەرزایی:1100مەتر.

## 27ی ئایار

رۆژێکە لەخاوبوونەوەو بەدبینی. لەنێو ئەو هەموو پێویستییە جوان وچاوەڕوانکراوانەدا تەنها کەمێك قامیشی شەکرمان دۆزییەوەو ئامێری گوشەرەکەش کەڵکی نەبوو. پێشبینییەکەمان راست دەرچوو کاتێك کابرای بەسالاچووی خاوەنی زەوییەکە لەنیوەرۆدا هاتەوەو عارەبانەیەکی بارکراو بەئاو و بەرازی بەدوای خۆیدا کێش دەکرد. لەکاتی گەڕانەوەیدا

رووەو ئەو جێیەی پیاوانی دواوە بۆسەکەیان دانابوو...شتێکی سەیری بەدی کرد، دەسبەجێ ئەو هاوڕێیانەمان ئەو و جوتیارێکیشیان دیلکرد کە لەتەکیدا کاردەکات. تا کاتژمێر شەش دەستبەسەر مایەوەو دواتر ئەوان و جوتە براکەشمان ئازادکردو پێمانوتن تاوەکو ڕۆژی دووشەممە ناوچەکە جێنەهێڵن و بێدەنگبن و قسەنەکەن، ماوەی دوو کاتژمێر رووەو کاراگواترندا ڕێمانکردو دواتر لەکێڵگەیەك لەکێڵگەکانی گەنمەشامیدا لێی خەوتین.

## 28ی ئایار

یەکشەممە. بەیانی زوو لەخەو هەستاین و درێژەماندا بەرێکردنەکەمان تا لەدوای کاتژمێرو نیوێك گەیشتینە کێڵگەکانی کاراگواترنداو ئەو دەمە بینینیۆوکۆکۆمان نارد بۆ پشکنینی ناوچەکە بەڵام لەرێگا جوتیارێك بینینی و ئەوانیش ناچاربوون دەستگیری بکەن. لەدوای ئەوە بەماوەیەکی کەم ژمارەیەك دیلکراومان لا خڕبووەوە کە هیچ هەستێکی ترسیان دەرنەبڕی. پیرەژنێك لەتەك مندالەکانیدا دەستیکرد بەقاوقیژ بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکانی دەوروبەر رابکێشێت بەڵام پاچۆوپابلۆ دڵیان نەهات دەستگیری بکەن و ئەویش رووەو گوندەکە هەڵهات. لەکاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆدا دەستمان بەسەر گوندەکەدا گرت و بنکەکانمان لەهەردوو بەرەکەیەوە دانا. هەروەها دەستمان بەسەر ئۆتۆمبیلێکی جیپ و دوو ئۆتۆمبیلی باردا گرت هەندێکیان خاوەندارییان بۆ خەڵکەکە دەگەڕێتەوەو هەندێکیشیان هینی کێڵگەکانی نەوتن. کەمێك نانمان خواردو قاوەمان خواردەوەو لەدوای مشتومڕگەلێك کە لەئەژمار نایەن لەکاتژمێر حەوت ونیودا رووەو(ئیبیتاسیتۆ)دەرچووین و لەوێندەر خۆمان کرد بەکۆگایەکداو بایی 500 دۆلار کەلوپەلمان لێکڕی و بە زەماوەندێکی بێوێنە لای جوتیارەکان جێمانهێشت...دواتر درێژەماندا بەرێکردنەکەمان تا

گەیشتینە ئیتای و لەوێندەر لەماڵێكدا بەگەرمیی پێشوازیمان لێكرا كە دەركەوت خاوەنەكەی هەروەها خاوەنی كۆگاكەی ئیبیتاسیتۆشە. لیستی نرخی كەلوپەلەكانمان پیشانداو مشتومڕێكم لەتەكدا كردو پێم وا بوو ناسیمییەوە...هەندێك پەنیرو نانی هەبوو لەگەڵ كەمێك قاوەدا بۆی هاوردین بەلام من لەم پێشوازییە گەرمەی كەوتمە گومانەوە. بەرەو ئیسبینۆ كە دەكەوێتە سەر هێڵی ناسنینی سانتاكروز بەرێكەوتین بەلام ئۆتۆمبیلە بارهەڵگرەكە(كە لەجۆری فۆردە)لەدوریی سێ كاتژمێر رێ لەئیسبینۆوە لەكاركەوت ئیدی هەموو بەیانیمان لەچاككردنەوەیدا بەسەربرد و هەر كە كەوتەوە جوڵە جارێكی دی پەكی كەوتەوەو ئەمجارە لەدوریی دوو كاتژمێرەوە بەتەواوی لەكاركەوت...پیاوانی پێشڕەو دەستیان بەسەر كێڵگەكەدا گرت و ئۆتۆمبیلی جیپەكە چوار سەفەری یەك لەدوای یەكی كرد تاوەكو هەموومانی گواستەوە.

بەرزایی:880 مەتر.

## 29ی ئایار

شارۆچكەی(ئیسبینۆ)تارادەیەك وەكی شارۆچكەیەكی تازە دەردەكەوێت چونكە شارۆچكە كۆنەكە لافاوی58 نغرۆی كرد. شارۆچكەیەكی هندییەو دانیشتوانەكەی شەرمنن و زمانی ئیسپانی نازانن یاخود خۆیان وا پیشان دەدەن كە نایزانن. لەنزیك خۆمانەوە چەند كرێكارێكی نەوتمان بینی سەرقاڵی كاركردن بوون، هەروەها بارهەڵگرێكی دیكەشمان بینی دەیتوانی هەموومان هەڵبگرێت بەلام دوای ئەوەی لەنێو قوڕولیتەدا چەقی و ریكاردۆ نەیتوانی دەریبهێنێتەوە، هەلەكەمان لەدەست دەرچوو. بەجۆرێك بێدەنگیی باڵی بەسەر ناوچەكەدا كێشابوو دەتگوت ئێمە لەنێو جیهانێكی دیكەدا دەژین. كۆكۆ راسپێردرا پرسیار دەربارەی رێگاكانی دەوروبەر بكات كاتێك

کە گەڕایەوە لەهەگبەکەیدا زانیاریگەلێکی جیاجیاو کەمی لەتەك خۆیدا هاوردبوو تەنانەت سەروەختێك ڕێیەکی ذیکەمان وەبەرگرت کە بەرەو نزیك ڕیۆگراندیمان دەبات ڕێگەکەمان لێتێکچوو و ڕێیەکی دیکەی بەرەو موشیریمان گرتە بەر کە لەوێندەر ئاوی لێیە. دواتر لەکاتژمێر سێونیوداو بەهۆی گیرگرفتی ڕێکخستنەوە ناوچەکەمان بەجێهێشتو، پێشڕەوەکە(کە بریتییە لەشەش کەسو حەوت لەتەك کۆکۆدا)بەسواری جیپ ڕۆیشتنو پاشماوەکەی تریش بەپێ ڕێیان کرد.

لەنێودەنگوباسەکانی ئێستگەدا هەواڵی ئەوە بڵاوکرایەوە کە لۆرۆ لەبەندیخانەکەی لەکامیری هەڵهاتووە.

## 30ی ئایار

لەرۆژدا گەیشتینە هێڵە ئاسنەکەو ئەوەمان بۆ دەرکەوت ئەو ڕێگایەی کە بەرەو موشیریمان دەبات بوونی نییە. لەکاتی پشکنینی ئەو ڕێیەشدا ڕەوتێکمان دۆزییەوە لەسەر راستەهێڵێكو لەدوریی500مەتر لەدووڕیانەکەوە بەنێو کێڵگەکانی نەوتدا دەڕوات، ئیدی پیاوانی پێشڕەو بەسواری جیپ ڕێگاکەیان گرتەبەر. لەکاتێکدا کە ئانتۆنیۆ سەرگەرمی کشانەوە بوو لەناکاو مێردمنداڵێك کە تفەنگێکی پێبوو و سەگێکیشی لەتەکدابوو هاتە ناوچەکە...ئانتۆنیۆش داوای ڕاوەستانی لێکرد بەڵام لاوەکە خێرا هەڵهات. دوابەدوای ئەم ڕووداوە ئانتۆنیۆ ڕاسپێردرا بۆسەیەك لەدەروازەی ڕێگاکەدا دابنێتو ئێمەش دەوروبەری500مەترێك دوورکەوتینەوە. کاتژمێرچارەکی دەویست بۆ دوانزە میگیل هاتەوەو وتی ماوەی12 کیلۆمەترم بەئاراستەی خۆرهەڵاتدا بڕیوەو هیچ کوخت یاخود ئاوێکم بەدی نەکردووە. هەموو ئەو شتەی کە دۆزیویەتییەوە ڕێگایەکە ڕووەو باکور دەڕوات. فەرمانم پێدا ئۆتۆمبیلی جیپەکە بەکاربهێنێتو لەتەك

سێ پیاودا بۆ پشکنینی ئەو ڕێگایە بڕوات و دەوروبەری دە کیلۆمەترێك ڕووەو باکور ڕێگاکە بپشکنێت و بەرلەوەی تاریك دابێت بگەڕێتەوە. لەنێو خەوێکی زۆر قوڵدا بووم کاتێك کە لەدەوروبەری کاتژمێر سێدا بەهۆی دەنگی چەند تەقەیەکەوە کە لەشوێنی بۆسەکەوە هات خەبەرم بوودوە. هەواڵەکان بەخێرایی گەیشتنە لام: سوپا پێشڕەویی کردووەو کەوتووەتە نێو ئەو بۆسەیەوە کە بۆی دانراوەو ئەنجامەکەشی بەمجۆرەیە: سێ کوژراو و زامدارێك. لەم بۆسەیەدا ئانتۆنیۆوئارتۆرۆوناتۆولویس وویلی ورائول بەشدارییان کرد بەڵام رائول لاواز بوو. بەپێ کشاینەوە دواوەو ماوەی12 کیلۆمەترمان تاوەکو شوێنی بەیەکگەیشتنی ڕێگاکان بڕی بێئەوەی میگیل بدۆزینەوەو دواتر زانیمان کە ئۆتۆمبیلی جیپەکە بەهۆی ئەوەی ئاوی لێبڕاوە نەیتوانیوە ڕێگاکە تەواوبکات. دواتر لەدوریی سێ کیلۆمەترەوە دۆزیمانەوەو هەمووومان میزمان کردە نێو رادێتەرەکەیەوەو بەهۆی(باراناو)ێکی زیادەوە توانیمان بەدوایین قۆناغ لەگەشتەکە رابگەین کە لەوێندەر جۆلیۆو پابلیتۆ لەچاوەڕوانیی هاتنماندا بوون. لەکاتژمێر سێدا هەمووان لەدەوری ئاگرێکی خۆش و گۆشتێکی برژاو کە لەسێ تاوس و گۆشتی بەراز پێکهاتبوو گردبوونەوە. بۆ وریابوونیش ئاژەڵێکمان هێشتەوە بۆ ئەوەی لەو ئاوە بخواتەوە کە لەڕێگا توشیان دەبین، نەبادا ژەهراوی کرابن. لەبەرزاییەکەمانەوە کە لەنێوان750 و 650مەتر دەبوو دەستمان بەدابەزین کرد. ئۆتۆمبیلی جیپەکە ئازایانە بەهۆی ئەو میزو ئاوەی کە لەنێو رادێتەرەکەیدا هەبوو لەسەر ڕێگابڕین بەردەوام بوو. بەڵام دوو ڕووداوی کتوپڕ نەخشەکانمانی تێکدا چونکە ڕێگای بەرەو باکور دوایی هات و میگیل ناچاربوو کەژاوەکە رابگرێت..جگە لەوە یەکێك لەگروپەکانی چاودێریی گریگۆریۆ فارگاسی جوتیاریان دەستبەسەر کرد کە بەپایسکیل هاتبوو هەندێك تەپکە بنێتەوەو پێدەچێت کارو پیشەی ئەو

هەر ئەوەبێت. کابرا بەهیچ جۆرێك هەڵوێستی ڕۆشن نەبوو بەڵام زانیاریگەلێکی بەنرخی دەربارەی شوێنی ئاوەکان داپێمان. وتی نزیکترین خاڵیان دەکەوێتە دیوی پشتمانەوە...بەسەرپەرشتی ڕێبەرەکە چەند پیاوێکم بۆ هاوردنی ئاو و ئامادەکردنی خواردن ڕەوانەکرد. کاتێك کە گەیشتنە شوێنی مەبەست دوو ئۆتۆمبیلی بارهەڵگری سوپایان بینی و هەر خێرا بۆسەیەکی بەپەلەیان بۆ دانان. وادیارە دوو سەربازیان کوشتووەو ناتۆ لەسەرەتادا گوللەیەك لەو گوللانەی تەقاندووە کە لەکاتی مەشقدا بەکاردەهێنرێن...هەڵبەت کەڵکی نەبووە ئیدی گۆڕیویەتی بەگوللەیەکی ڕاستەقینەو سەروەختێك تەقاندویەتی بۆمبە دەستییەکەی کە بۆمبی دژە تانکە لەبەردەمیدا تەقیوەتەوەو تفەنگەکەی تێکشکاندووە...بەڵام خۆی زیانی نەبووە. بێئەوەی فرۆکە ڕێگریمان بکات درێژەماندا بەکشانەوەو بەرلەوەی دووەمین خاڵی ئاو بدۆزینەوە ماوەی15 کیلۆمەترمان بڕی. دنیا تاریك داهاتبوو و شەو باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو و ئۆتۆمبیلەکەی سوپاش بەهۆی نەبوونی سوتەمەنییەوە بەتەواوی لەکارکەوت. ئێوارەمان بەنانخواردن بەسەربرد.

سوپا ڕاگەیاندنێکی دەرکردووەو تیایدا دان بەوەدا دەنێت کە دوێنێ ئێوارە مولازمێك و سەربازێك کوژراون و هێما بۆ ئەوە دەکات کە ژمارەیەك کوژراوی ئێمەش(بینراون) لەشەڕەکەدا بەرکەوتوون. نیازم وایە سبەینێ بۆ سۆراخی کەژوکێو لەهێڵە ئاسنینەکە بپەڕینەوە.

بەرزایی:620 مەتر.

# لێکدانەوەی مانگانە

خاڵی نێگەتیڤ وخەراپ ئەوەبوو، ئەگەرچی ڕێکردن و گەڕانمان بەچیاکاندا بەردەوامە،

بەڵام نەمانتوانی پەیوەندی بەجواکینەوە بگرین.

لەلایەنی سەربازییشەوە سێ پێکدادانی نوێ ڕوویانداوەو چەند زیانێکیان لەریزی سوپادا لێکەوتووەتەوە بێئەوەی ئێمە تاکە زیانێکمان لێبکەوێت...جگە لەوە چوونمان بۆ نێو بیریرنداو کاراگواترندا بەڵگەی پێشڕەویکردنمانەو سوپاش ئەوەی بۆ دەرکەوت کە سەگەکانی ناتوانن شوێنمان بکەون هەربۆیە لەشانۆی پرۆسەکان کشاندنییەوە.

ئەمانە گرنگترین تایبەتمەندییەکانن:

1)پچڕانی پەیوەندی بەمانێلاولاپازوجواکینەوە. ئەمەش وا دەکات ژمارەمان لە25 کەس کە هەموو گروپەکەیان پێکهێناوە، زیادنەکات.

2)نەبوونی پابەندبوون و پەیوەندیکردن لەلایەن جوتیارەکانەوە...ئەگەرچی ئەو ترسە زۆرەیان نەماوەو بووینەتە جێیسەرنج و مایەی سەرسوڕمانیان.

3)وادیارە حیزب لەڕێگای کۆلیەوە، بێ هیچ پارێزێك، یارمەتی خۆیمان بەردەست دەخات.

4)وروژاندنی مەسەلەکەی دۆبرێ، پتر لە دە پێکدادان و شەڕی سەرکەوتوو، بەهای جەنگیی بەجوڵانەوەکەمان بەخشیوە.

5)جەنگاوەران پەیتاپەیتا ورەی بەرزو دڵنیا پەیدادەکەن کە دواتر سەرکەوتنمان بۆ مسۆگەر دەکات ئەگەر بزانین باش بەکاریانبهێنین.

6)سوپا نەیتوانیوە خۆی ڕێکبخاتەوەو تەکنیکەکەشی بەشێوەیەکی بەرچاو چاك نەبووە.

هەواڵی ئەم مانگە دەستگیرکردنی لۆزۆو هەڵهاتنێتی لەبەندیخانەکەی و، دەبێت ئێستاکە بەرێگاوەبێت بەرەو لای ئێمە تاوەکو پەیوەندیمان پێوە بکاتەوە، یاخود بۆ رێکخستنەوەی پەیوەندییەکان رووەو لاپاز بڕوات. سوپا رایگەیاند سەرجەم ئەو جوتیارانەی دەستگیرکردووە کە لەمازیکۆری هاوکاری ئێمەیان کردووە، ئەمێستا ئەو قۆناغە دێت کە تیایدا لەیەك کاتدا لە هەردوو لاوە تیرۆرو تۆقاندن دژ بەجوتیاران پیادە دەکرێت ئەگەرچی بەشێوەی جیاوازیش بێت. سەرکەوتنمان دەبێتە ئەو گۆڕانکارییە چلۆنایەتییە، کە بۆ شێوە پەرەدانێکی باش پەرەدان بەجەنگی پارتیزانیی، پێویستە.

## 1ی حوزەیران 1967

پیاوانی پێشڕەوم نارد بۆ ئەوەی پێگەی خۆیان لەسەر ڕێگاکە دابمەزرێنن و تا خاڵی بەیەکگەیشتنی لەگەڵ ڕێگای بەرەو کێڵگەکانی نەوت...لەدوریی نزیکەی سێ کیلۆمەترەوە، بیپشکنن. فرۆکەکان دەستیانکردە جموجوڵ بەسەر ناوچەکەداو ئەمەش ڕاستیی ئەو هەواڵانە دەسەلمێنێت کە لەئێستگەکەدا سەبارەت خراپیی باری کەش وهەوا بڵاوکرایەوەو لەرۆژانی رابوردودا بوو بووە ڕێگر لەبەردەم چالاکیی هەڵفڕینیانداو وادیارە جارێکی دی دەست دەکەنەوە بەبۆردومانی پێگەکانمان. ڕاگەیاندنێکی سەربازیی نارۆشن دەربارەی کوژرانی دوو سەربازو زامداربوونی سیان بڵاوکرایەوە...نازانین ئەوانە لەکۆنەکانن یان تازەن. دوای ئەوەی لەکاتژمێر پێنجدا نانمان خوارد، ڕووەو ڕێگاکە درێژەماندا بەرێکردنەکەو ماوەی حەوت یاخود هەشت کیلۆمەترمان بێ هیچ ڕووداوێك کە شایانی باس بێت بڕی و پاشان کاتژمێرونیوێك ڕێمانکردو دواتر ڕەوتێکی بچوکی بەجێهێڵراومان وەبەرگرت بەرەو کێڵگەیەکمان دەبات کەوتووەتە دوریی حەوت کیلۆمەتر لێرەوە، بەڵام هەمووان شەکەت بوو بوون ئیدی لەنیوەی ڕێگاکەدا لێی نووستین. بەدرێژایی هەموو گەشتەکە تەنها گوێمان لەتەقەیەك بوو ئەویش لەدوورڕا هات.

## 2ی حوزەیران

بەرزایی:800 مەتر.

ئەو حەوت کیلۆمەترەمان بڕی کە گریگۆریۆ باسیکرد و گەیشتینە کێڵگەکەو لەوێندەر بەرازێکی گەوردمان گرت و سەرمانبڕی. کتومت لەم کاتەدا برۆلیۆ رۆبلزی گاوان و کوڕەکەی و دوو جوتیاری دی هاتن، دەرکەوت یەکێك

لەجوتیارەکان کوڕی ژنی خاوەن کێڵگەکەیەو ناوی سیمۆنی بوو. دەستمان بەسەر ئەسپەکانیاندا گرت بۆ بڕینی ئەو سێ کیلۆمەترەی کە لەجۆگەکەمان جیادەکاتەوە لەگەڵ گواستنەوەی بەرازەکەدا کە پارچە پارچەکراو، ماوەیەك ئەوانمان لەوێندەر هێشتەوە تاوەکو گریگۆریۆ لەبەرچاو دووربخەینەوە کە پێشان دەنگوباسی لەناوچەکەدا بڵاوبوبووەوە. هەر کە گرووپی ناوەراست گەیشتەجێ ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگری بارکراو بەسەربازان و بەرمیل بەو شوێنەدا تێپەڕی...نێچیرێکی ئاسان بوو بەڵام ئەمڕۆ رۆژی خوان و خواردنی گۆشتی بەرازەکەبوو. ئێوارەمان لەئامادەکردنی خواردندا بەسەربردو لەدەوروبەری کاتژمێر سێ‌ونیودا هەر چوار جوتیارەکەمان ئازادکرد دوای ئەوەی لەپای لەکیسچوونی ئەو رۆژەیان یەکی دە دۆلارمان پێدان. لەکاتژمێر چوارونیودا گریگۆریۆ پاش چاوەڕوانییخواردن و، داوای بێهودەی نوێکردنەوەی گرێبەستەکەی، رۆیشت و..بڕی100 دۆلارمان پێدا. ناوی جۆگەکە تاڵبوو.

## 3ی حوزەیران

لەکاتژمێر شەش‌ونیوی بەیانیدا بەتەنیشت بەری لای‌چەپی جۆگەکەدا رێمانکردو تا نیوەرۆ لەسەر رێکردن بەردەوام بووین و دواتر بینینیۆوریکاردۆمان بۆ پشکنینی رێگاکە ناردو شوێنێکی گونجاویان بۆ بۆسەکە دۆزییەوە. لەکاتژمێر یەکدا چووینە بنکەکانمانەوەومن و ریکاردۆ رێبەرایەتی دوو گرووپ لەناوەراستمان کردو پۆمبۆش لەیەکێك لەلاتەنیشتەکانەوە خۆی قایمکردو میگیلیش لەتەك سەرجەم پیاوانی پێشرەودا لەخاڵێکی نموونەییدا خۆی جێگیرکرد. لەکاتژمێر دوونیودا بارهەڵگرێکی بارکراو بەبەراز تێپەڕی‌و لاقەمان نەکرد، لەکاتژمێر چوارو بیست دەقیقەدا بارهەڵگرێکی بچوکی بارکراو بەبوتڵی خاڵیی تێپەڕی‌و

لەکاتــژمێر پێنجـدا بارهـەڵگرێکی سـەربازیی تێپـەڕی، ڕەنگـە هـەر هـەمان بارهەڵگرەکەی دوێنێ بووبێت، دوو سەربازی تیادابوو لەدواوە راکشابوون و خۆیان داپۆشیبوو. دڵم نەهات تەقە بکەم و ماوەیەکی کەم کاروبارەکانم لێ تێکـەڵاوبوو ئیدی ئۆتۆمبیلەکـەم رانـەگرت و بـەو هۆیەشـەوە بەسـەلامەتیی تێپـــەڕبوو. لەکاتـــژمێر شەشـــدا بۆســـەکەمان جێهێشـــت و جـــارێکی دی درێژەماندایەوە بەپرۆسەی دابەزین بۆ گـەڕان بەشـوێن جۆگـە ئـاودا. هـەر کـە گەیشتینە ئاوەکە چوار ئۆتۆمبیلی بارهـەڵگر یـەك لـەدوای یـەك بەناوچەکەدا تێپەڕین و دواتر سیانی دیکەش شوێنیان کەوتن.. وادیارە سـەربازیان تیـادا نەبوو.

# 4ی حوزەیران

بـەگوێ جۆگەکـەدا لەســەر ڕێکردنەکـە بـەردەوام بـووین و نیازمـان وابـوو بۆسـەیەکی دی دابنـێین ئەگـەر بـارودۆخ لـەباربوو. بـەڵام ڕێگایـەکی ڕووەو خۆرئاوامــان دۆزییــەوە ئیــدی وەبــەرمان گــرت و پاشــان بــەنێو ڕێــرەوی جۆگەیەکدا کە ئاوەکەی وشکیکردبوو ڕێمـانکرد کـە بەرەو باشـور دەچێت. لەکاتژمێر چارەك بۆ سێدا بۆ خواردنەوەی قـاوەو شـەربەتی شـۆفان لامانـداو بــۆ ئامــادەکردنی خواردنەوەکــەش پشــتمان بــەئاوی گــۆمێکی بۆگــەن ئەســـتورکرد بـــەڵام نیوەڕۆخەوەکـــە درێـــژەی کێشـــاو ئیـــدی بڕیارمانـــدا خێوەتەکـەمان لێـرەدا هەڵبـدەین. لـەئێوارەدا بـای باشـوری هـاوڕێ بەنەرمـە باران هەڵیکرد...بەدرێژایی شەو باران باری.

# 5ی حوزەیران

ڕێگاکــەمان جێهێشــت و لــەژێر گــەردی بــای باشــوردا ڕێیــەکمان بــەنێو دارســـتانەکاندا لێـــداو تـــا کاتـــژمێر پێنجـــی دواینیـــوەڕۆ ڕێمـــانکردو دوای

ئــەوەی توشــی دەوەن‌و گژوگیایــەکی چــڕبووین کــە بەتــەواوی ئــەملاولای بەرزترین چیای ئەم ناوچەیەی تەنیبوو، بەکردەوە ماوەی دوو کاتـژمێرو چارەکێك ڕێمانکرد. بەدرێژایی ئەم ڕۆژە...کە بەبێ خواردنێك کە شایانی باس بێت بەسەرمانبرد، ئاگر تەنها پشت‌وپەنامان بوو. تائێستاکە ئاوی بەکـەڵك بـۆ خواردنـەوەمان لـەنێو(مەتارەگـەل)ی بچـوك‌و بـۆ خواردنـەوەی بەیانیان ماوە.

بەرزایی:750 مەتر.

## 6ی حوزەیران

دوابـەدوای بەرچاییەکی کـەم میگیـل‌وبینینیـۆ‌وپـابلیتۆ بـۆ هـەموارکردنی ڕێگاکـەو پشـکنینی ناوچـەکە دەرچـوون. پـابلۆ لـەدوای نزیکـەی کاتـژمێر دوودا گەڕایەوەو هەواڵی ئەوەی لەتـەك خۆیدا هاوردبووەوە کە کێڵگەیەکی چـۆڵیان بەمێگەلەکەیـەوە دۆزیوەتـەوە، ئـەو دەمـە ڕێـرەوی جۆگەکـەمان وەبـەرگرت‌و دەسـتمانکردە ڕێکـردن‌و لەڕێگامانـدا بـەرەو ڕیۆگرانـدی لەکێڵگەکـە پەڕینـەوە. لەوێنـدەرەوە پیاوێکمـان بـۆ پشـکنین ڕەوانـەکردو فـەرمانی ئـەوەی پێیـە خانوویـەکی نزیـك‌و تـەنیا بدۆزێتـەوەو هـەر واش دەرچوو، ئەو زانیارییە سەرەتاییانەی کە خڕمان کردەوە ئەوەیان سەلماند کە ئێمە لەماوەی دوریی سێ کیلۆمەترین لەبۆیرتۆکاماشۆ کە لەوێندەر50 سـەرباز هـەن‌و، ڕێگـای بـەرەو ئـەو شـوێنەمان دۆزییـەوە. سـەرلەبەری دانیشـــتنی شـــەومان بـــەئامادەکردنی گۆشـــتی بـــەرازو شۆربای(لۆکرۆ)(26)بەسەربرد. ئەم ڕۆژە ئەو هەواڵانەی لەتەك خۆیدا بۆ نـەهاوردین کـە چـاوەڕوانیمان دەکـردن، ئیـدی بـەیانی لەگـەڵ هـەڵهاتنی خۆرداو بەماندویی، دەرچووین‌و دەستمانکرد بەڕێکردن.

## 7ی حوزەیران

بەوریایی ڕێمانکردو خۆمان لە لەوەڕگە جێهێڵراوەکان بەدوردەگرت تاوەکو ڕێبەرەکە کە یەکێکە لەکوڕی جوتیارەکان، ئەوەی پێراگەیاندین کە لەناوچەی لەوەڕگەکان تێپەڕبووین. لەسەر ڕێیەکی خۆڵ ولمین درێژەماندا بەرێکردنەکە تا گەیشتینە کێڵگەیەکی‌دی کە پێشان قسەی لەبارەوە کرابوو، کێڵگەیەکی بڕشتە بەکولەکەو قامیشی‌شەکرو درەختی مۆزو، فاسۆلیا. خێوەتەکەمان لەوێندەر هەڵدا. مێردمنداڵەکە کە ڕۆڵی ڕێبەری دەبینی...وا خۆی پیشاندا کە توشی ژانەسك بووە، نازانین ڕاست دەکات یان وا خۆی پیشاندەدات.

بەرزایی: 560 مەتر.

## 8ی حوزەیران

خێوەتەکەمان نزیکەی300مەتر دورخستەوە بۆ ئەوەی خۆمان لەچاوی خۆتێهەڵقورتێن، کە لەیەك کاتدا ناوچەیەکی لمین و چێنراویشە، دووربخەینەوە، دواتر زانیمان کە جوتیارەکە هیچ ڕۆژێك لەڕۆژان بەم ڕێیەدا گوزەری نەکردووە بەڵکو بەبەلەم هاتووە. بینینیۆ و پابلۆ و ئۆربانۆ و لیۆن بۆ لێدانی ڕێگایەك لەناوچەیەکی هەرددا دەرچوون بەڵام دوای‌نیوەڕۆ هاتنەوەو وتیان ئەوە کارێکی دژوارە. ناچاربووم بەهۆی بێئابڕووییەکەیەوە کە دووبارەی کردەوە، ئاگادارییەکی دیکەی ئۆربانۆ بکەمەوە. بڕیارماندا سبەینێ لەنزیك کەنارە هەردەکەوە کەڵەکێك دروست بکەین.

لەنێو دەنگوباسەکانی ئێستگەدا هەواڵی ئەوە بڵاوکرایەوە کە باری نائاسایی لەوڵاتدا ڕاگەیەندراوەو کرێکارانی کانەکان هەڕەشەی شۆڕش و یاخیبوون دەکەن..دواتر پاش کەمێك هەموو شتێك خامۆش کرایەوە.

## 11ی حوزەیران

رۆژێکــە لــەهێمنیی تــەواو. بۆســەیەکمان بــۆ ســوپا دانــا بــەڵام بــۆ ڕووبەڕووبوونــەوەمان پێشــڕەویی نــەکردو بــۆ مــاوەی چــەند دەقیقەیــەك فرۆکەیەکی بچوك بەسەر ناوچەکەدا کەوتە جموجوڵ. ڕەنگە ئەمێستا سوپا لەسەر ڕۆخی ڕۆزیتا چاوەڕوانمان بکات. ڕێگای سەر تەپۆلکەکە هەموارکرا کــە تارادەیــەك خەریکــە بەلوتکەکــە رادەگــات. بەهــەرحاڵ ســبەی درێــژە بەرێکردنەکە دەدەین و ئەوەنــدەمان خــواردن مــاوە کــە بەشــی پێــنج یــاخود شەش ڕۆژ دەکات.

## 12ی حوزەیران

سەرەتا وامانــدەزانی کە دەتوانین جارێکیدی بەرۆزیتا یاخود لایەنی کەم بــەریۆگرانــدی رابگەینــەوە..ئیــدی لەســـەر ئــەو بناغەیــە درێژەمانــدا بەرێکردنەکــەمان. بــەڵام کاتێــك کــە گەیشــتینە خــاڵێکی بچــوکی ئــاو بۆمــان دەرکــەوت مەســەلەکە بــەو جــۆرە ئاســان نییــە کــە پێمــان وا بــوو، ئیــدی لەوێندەرو لەچاوەڕوانیی دەنگوباسەکاندا خێوەتمان هەڵدا. لەکاتژمێر سێی دوای‌نیوەڕۆدا کەسێك هات و وتی خاڵێکی تری ئاوی گرنگتر لەوەی یەکەم هەیــە بــەڵام لــەکاتی ئەمێســتادا راگەیشــتن بــەو شــوێنە دژوارە، بڕیارمانــدا لەشوێنی خۆماندا بمێنینەوەو خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو و بای باشووریش هەڵی کردبوو و لەتەك خۆیدا گەردو سەرماکەی بۆ دەهاوردین.

ئێستگەکە لەزاری رۆژنامەی(بریزنسیا)وە هەواڵی کوژراوێك و زامدارێکی ســوپای بڵاوکــردەوە کــە لەپێکــدادانی ڕۆژی شــەممە کەوتونەتــەوە..ئەمــە ئامارەیــــەکی باشــــەو هەڵبــــەت هــــەواڵێکی دروستیشــــە...بــــەمجۆرە پێکدادانەکانمان لەتەك دوژمنــدا ڕانەوەســتاوە، جار لــەدوای جار دوچاری

زەرەرو زیانی دەکەن. لەنێو ڕاگەیاندنێکی تردا هەواڵی ئەوە بڵاوکرایەوە کە سوپا سێ جەنگاوەری ئێمەی کوشتووەو لەنێویاندا یەکێك لەپێشەوایانی جولانەوەکە هەیە کە بەئانتی ناسراوە، هەروەها ڕاگەیاندنەکە ئەم ئاوێتە سەیرەی لەمەڕ هێزەکانمان بڵاوکردەوە: 17 کوبایی، 14 بەرازیلی، 4 ئەرجەنتینی، 3 پیرۆڤی، ژمارەی کوباییەکان و پیرۆڤییەکان ڕاستەو پێویستە لێکۆڵینەوەیەك بکەم بۆ ئەوەی بزانم دوژمن چۆن بەم ژمارانەی زانیوە.

بەرزایی:900 مەتر.

## 13ی حوزەیران

تەنها کاتژمێرێك ڕێمانکرد..واتە ڕووەو دووەمین خاڵی ئاو چونکە پشکنەران نە بەرۆزیتا و نە بەریۆگراندی ڕاگەیشتن. کەشەکەی ئێجگار ساردوکرێوەیە. ڕەنگە سبەینێ بەئامانجەکەمان رابگەین و هێندەمان خواردن ماوە کە بەچەند ژەمێکی بەجێ بەشی پێنج ڕۆژمان دەکات.

ئەوەی کە سەرنجی ڕاکێشاوم ئەو وەرچەرخانە سیاسییەی وڵات و، ئەو برە بێشومارەی هاوپەیمانێتی و دژە هاوپەیمانێتییە...کە لەهەموو شوێن وجێیەك تەشەنەی سەندووە..لەهیچ شوێنێك بەئەندازەی بۆلیڤیا هەستمان بەرۆڵی بزوێنەری جەنگی پارتیزانیی نەکردووە.

## 14ی حوزەیران

**سیلیتا**(4 ؟)

ڕۆژمان لەنێو خێوەت لەنزیك سەرچاوەی ئاوە ساردەکەو..لەدەوری ئاگرێکی باش و لەچاوەڕوانیی هەواڵی میگیل وئۆربانۆدا بەسەربرد کە

خەریكی هەمواركردنی ڕێگاكە بوون. دەبوو لەكاتژمێر سێدا بگەڕێنەوە بەڵام ئۆربانۆ دوای ئەو كاتە هاتەوەو وتی جۆگە ئاوێكمان دۆزیوەتەوەو هەروەها هەندێك پۆلكەشیان بەدی كردووەو لەوەشەوە هاتونەتە سەر ئەو باوەڕەی كە(ریۆگراندی)زۆر لێمانەوە دورنییە. لەشوێنی خۆمانداماینەوەو دوایین شۆرباماڵ خواردو...تەنها ژەمێك خواردنمان ماوە كە لەبستەی كێڵگەو سێ ژەم لە(موت) پێكهاتووە.

ئەمرۆكە تەمەنم بووە سی ونۆ ساڵو پەیتاپەیتا بەدڵێكی پۆلاییینەوە رووەو ئەو تەمەنە وەردەچەرخێم كە تیایدا بەدووردرێژیی بیر لەداهاتووم دەكەمەوە وەكی جەنگاوەرێكی شۆڕشگێڕ. بەڵام هەنوكە هێشتا هەر(تەواو)م.

بەرزایی:840 مەتر.

## 15ی حوزەیران

كەمتر لەسێ كاتژمێر ڕێمانكرد تا گەیشتینە دەوروبەری ریۆگراندیو شوێنێك كە لامان بێگانە نییەو پێموابێت دوو كاتژمێر لەرۆزیتاوە دوورە. نیكۆلای جوتیار وتی ماوەی سێ كیلۆمەتر دوورە. بڕی150پیزۆسمان دابەجوتیارەكەو بوارماندا بڕوات. ئەویش بەوێنەی تیر تێیتەقاندو رۆیشت. خێوەتەكە لێرەدا هەڵدەدەینو ئانیسیتۆ چووە بۆ پشكنینو پاش كەمێك هاتەوەو وتی دەكرێت ودەتوانرێت لەرووبارەكە بدرێت. شۆربایەكی دروستكراو لەبستەی كێڵگەمان خواردو زگەكانمان بەكاكڵەی سورەوكراوی تۆتایو پاشان سورەوكراو بەرۆنو چەوریی ئاخنی. ئەوەندەمان(موت)ماوە كە بەشی تەنها سێ رۆژمان دەكات.

بەرزایی:610 مەتر.

## 16ی حوزەیران

پاش ئەوەی كیلۆمەترێكمان بڕی پیاوانی پێشڕەومان لەبەری دووەمی رووبارەكە بینی. پێشان پاچۆ لەرووبارەكە پەڕیبووەوە بۆ پشكنینی

ناوچەکەو خاڵی پەڕینەوەکەی دۆزیبویەوە. چووینە نێو ئاوە ئێجگار ساردەکەوە کە تا کەلەکە دەهات و..بەرەنگاریی تەوژمەکەیمان کرد کە بۆ خۆشبەختیی بەهێزنەبوو. دوای ئەوە بەکاتژمێرێك گەیشتینە رۆزیتا و لەوێندەر شوێنەواری پۆستاڵمان بینی بەڵام تازە نەبوو. بۆمان دەرکەوت کە رووباری رۆزیتا زیاد لەپێویست لێوانلێوە لەئاو و هیچ شوێنەوارێکی ئەو رێیەمان بەدی نەکرد کە لەسەر نەخشەکە هەیە. ماوەی کاتژمێرێك بەنێو ئاوە بەستووەکەدا رێمانکردو بڕیارماندا لەوێندەر خێوەت هەڵبدەین بۆ کەڵك وەرگرتن لەکاکڵەی تۆتای و لەپورەی هەنگێك کە میگیل لەپشکنینی پێشوتردا دۆزیبویەوە..بەڵام ئەمجارە پورەکەمان نەدۆزییەوەو خواردنەکەمان تەنها بریتی بوو لە(موت) و گوێزی هندیی سورەوکراو بەچەورریی. هێنددمان(موت)ماوە کە بەشی سبەینێ و دوو سبەی دەکات، ماوەی سێ کیلۆمەترمان بەئاراستەی رۆزیتا و سیانی دیکەشمان رووەو ریۆگراندی بڕی.

بەرزایی: 610 مەتر.

## 17ی حوزەیران

لەماوەی پێنج کاتژمێرونیودا 15 کیلۆمەتر بەدرێژایی رۆزیتا رێمانکرد. لەرێگاماندا لەچوار جۆگەماندا ئەگەرچی نەخشەکە تەنها هێما بۆ جۆگەیەك دەکات، ئەویش جۆگەی ئابا پۆسیتۆیە. شوێنەوارگەلێکمان دۆزییەوە بەڵگەی ئەوەن کە هەندێك کەس بەم زووانە لەناوچەکەوە تێپەڕیون. ریکاردۆ ئاژەڵێکی(هۆشی)راوکرد(کە ئاژەڵێکی کرتێنەرە) و بەدرێژایی رۆژ بە(موت)ەوە خوارمان. کەمێك(موت)مان بۆ سبەینێ ماوە..بەڵام ئومێدمان زۆرە کە خانوویەك بدۆزینەوە.

## 18ی حوزەیران

زۆرێکمان ڕێگای گەڕانەوەیان لەخۆیان گرت و پاشماوەی(موت)ی سەر خوانەکەیان خوارد. لەکاتژمێر یانزەو دوای دوو کاتژمێر لەرێکردن توشی کێڵگەیەکی ئاوەدان بەگەنمەشامی و یۆکاو قامیشیشەکرو برنج بووین کە هەروەها ئامێرێکی گوشەری قامیشیشەکریشی لێبوو. خواردنێکی‌خاڵیی لە(پرۆتین)مان ئامادەکرد و بینینیۆوپابلۆمان بۆ پشکنینی ناوچەکە نارد. پابلۆ لەکاتژمێر دوودا گەڕایەوەو هەواڵی ئەوەی لەتەك خۆیدا هاوردبوو کە چاویان بەجوتیارێك کەوتووە کێڵگەکەی دەوروبەری500 مەتر لەخێوەتەکەمانەوە دوورە، وادیارە چەند کێڵگەیەکی دیکەشیان دۆزیوەتەوەو هەندێك جوتیاریشیان دەستبەسەر کردووە. لەئێوارەدا خێوەتەکەمان بۆ شوێنێکی‌دی گواستەوەو لەکێڵگەیەکدا لێی خەوتین کە خاوەندارییەکەی بۆ هەندێك جوتیاری گەنج دەگەڕێتەوەو لەسەرەتای ڕێگای بەرەو ئاباپۆدایە لەدوریی حەوت کاتژمێرە ڕێ لێرەوە. خانوگەلی ئەو جوتیارانە لەدوریی نێوان10 و15 کیۆمەترێك لەو شوێنەوەیە کە تیایدا دوو لقەکەی مۆسکیراوئۆسکۆرا بەیەك دەگەن و لەسەر ڕۆخی لقی ئۆسکۆرادایە.

بەرزایی:680 مەتر.

## 19ی حوزەیران

ماوەی12 کیلۆمەتر بەشێنەیی ڕێمانکردو گەیشتینە گوندێکی بچوك لەسێ‌ماڵ و سێ‌خێزان پێکهاتبوو. لەدوریی دوو کیلۆمەتر لەگوندەکەو لەناوچەیەکی نزمدا خێزانی گالفیز نیشتەجێیە ..کتومت لەو جێیەدا کە تیایدا هەردوو ڕووباری مۆسکیراوئۆسکۆرۆ بەیەکدی رادەگەن. دەبوو ڕاوەدوی دانیشتوانەکەی بنێین بۆ ئەوەی بتوانین قسەیان لەتەکدا بکەین

چونکە لەهەڵسوکەوتیاندا هەر دەڵێی زیندەوەرگەلی بچوکن. بنەماڵەی گالفیز پێشوازییەکی گەرمی لێکردین بەلاّم کالیکستۆ کە بەهۆی کۆششی کۆمیتەیەکی سەربازیی کراوەتە موختاری ناوچەکە، بەناوچەکەدا دەهات‌ودەچوو، خۆی وەکی کەسێکی پارێز پیشانداو تەنانەت بەرهەڵستیی ئەوەشی کرد کە هەندێك شتگەلی بچوکمان پێبفرۆشێت، کاتێك کە شەو داهات سیان لەبەراز فرۆشان کە چەکێکی مۆزەریان پێبوو هاتن‌و دەستبەسەرمان کردن‌و داوامان لەئانتی کرد پرسیاریان لێبکات. ئانتی لەچەك داینەماڵین بەلاّم ریکاردۆ کە چاودێریی دەکردن ئەو دەستپێشخەرییە گەوجانەیەی کرد. کالیکستۆ وتی ئەوانە بازرگانی خەڵکی بۆسترەرڤالیێن من دەیانناسم.

بەرزایی:680 مەتر.

## 20ی حوزەیران

ڕووبارێکی‌دی هەیە لەبەری لاي چەپەوە دەرژێتە نێو رۆزیتاوەو ناوی سۆسپیرۆیەو وادیارە چۆڵەوانییەو بەدرێژایی رێرەوەکەی کەس لەگوێیەوە نیشتەجێ‌نییە. پۆلیتۆ کە یەکێکە لە لاوانی نیشتەجێی ئەو کێڵگەیە کە دەکەوێتە ناوچە نزمەکەوە، پێیراگەیاندین کە ئەو سێ کەسە بازرگان نین‌و یەکێکیان ئەفسەرە بەپلەی مولازم لەسوپادا. ئەم زانیارییانەشی لەکچەکەی کالیکستۆوە دەستگیربووە کە هاوسەرێتی. ئانتی دەسبەجێ ڕووەو کێڵگەکە رۆیشت‌و هەندێك لەپیاوانی لەتەك خۆیدا بردو ئاگاداری کردنەوە کە پێش کاتژمێر نۆ ئەفسەرەکەی بدەن بەدەستەوە دەنا هەموویان گوللەباران دەکرێن. کابرا بەپەلەو بەدەم پاڕانەوەوە هاتەدەرەوەو وتی ئەفسەری پۆلم لەریزی پۆلیسداو لەتەك قەناسێك‌و لەگەڵ مامۆستای بۆستریۆڤالیێ کە خۆی بۆ کارکردن بەخشیوە. بۆ پشکنینی ناوچەکە

هـاتووم. هـەروەها وتـی سـەرکردەکەمان ئەفسـەرێکە بەپلـەی کۆلۆنێـل و لەتـەک60 پیـاودا لەگونـدی نـاوبراو نیشـتەجێیەو کاریـان ئەنجامـدانی گەشـتێکی دوورودرێـژە لـەماوەی چـوارو رۆژدا بـۆ پشـکنینی ناوچـەگەلێکی بەرفراوان کە بەدرێژایی رووباری ئۆسکۆرا درێژ دەبێتەوە. یەکەمجار بیرمان لەکوشتنیان کردەوە بەڵام لەدواییداو، دوایئەوەی بەتوندی لەوە ئاگادارم کردنەوە کە پێویستە پابەندی یاساکانی جەنگبن، بڕیارمدا ئازادیان بکەم. سەرەوەختێك لێکۆڵینەوەیەکم بۆ زانینی ئەو رێگایە ئەنجامدا کە توانییان بەهۆیەوە بەنێوماندا تێپەڕن..بۆم دەرکەوت کە ئانیسیتۆ بۆ ماوەیەکی کەم پاسەوانییەکەی بۆ هـاوردنی جۆلیـۆ بەجێهێشـتووەو کتومـت لـەم کاتـەدا دزەیـان کـردووە..وێـڕای ئـەوە ئانیسـیتۆولـویس لەبنکـەی پاسـەوانییەکەدا نووسـتبوون. منـیش بـەوەی کـە بـۆ مـاوەی هەفتەیـەکی تـەواو کردمنـە یاریـدەدەری چێشـتلێنەرەکەو بەدرێـژایی رۆژ لەگۆشـتی بـەرازو هـەروەها لەگۆشتی برژاو و پەتاتەی سورەوکراو بێبەشم کـردن..سزامدانو..ئەو بڕە شـۆربایەم بـۆ دیـاریکردن کـە بۆیـان هەیـە بیخـۆن. هەرچـی دیلەکانیشـە بڕیارماندا لەهەموو پێویستییەکانیان دایانبماڵین.

## 21ی حوزەیران

پیرەمێردەکە

لـەدوای رۆژێکـی تـەواو لەهەڵکێشـانی ددانـی نەخۆشـان..کـە تیایـدا نـاوی فیرنانـدۆ سـاکا مـۆیلاس (ئـەلیاس) شـاکۆ نـەمر راگـیرا، دەرگـای ژووری عەیادەکـە داخـراو دوای نیـوەرۆ دەرچـووینو پـتر لەکاتـژمێرێکی تـەواو رێمـانکرد. لەوەتـەی هەڵگیرسـانی ئـەم شۆڕشـەوە بـۆ یەکـەمین جـار سـواری هێسـتر بـووم. هەرچـی دیلەکانیشـە پیاودکـان مـاوەی کاتـژمێرێکی تـەواو بـەرێگای مۆسـکیرا! پەلکێشـیان کـردنو لەهـەموو پێویسـتییەکانیان،

بەکاتژمێرەکانی دەستیانو سۆلە دێهاتییەکانیشیانەوە، دایانماڵین. نیازمان وابوو کالیکستۆی موختار وەکی رێبەرێك لەتەك بۆلینۆدا لەگەڵ خۆماندا ببەین بەڵام نەخۆش بوو یاخود وا خۆی پیشاندا کە نەخۆشە، ئیدی دوای ئەوەی بەتوندی ئاگادارمان کردەوەو لایەنی زۆر ئەم وریاکردنەوەیەش هیچ کەڵکی نابێت، لەوێندەر جێمانهێشت. بۆلینۆ خۆی بۆ چوون بۆ کۆشاپامباو بردنی نامەکەی من بەخشی. ئەم شتانەشی پیادا رەوانەدەکەین: نامەیەك بۆ هاوسەرەکەی ئانتیو، نامەیەکی کۆدکراو بۆ مانێلا، وێڕای چوار راگەیاندنەکەمان. دوایین راگەیاندن شیکاری پێکهاتی گروپەکەمان دەکاتو کوژرانی ئانتی بەدرۆدەخاتەوە، ئەوە( )(27). ئەمێستا بۆمان دەردەکەوێت کە دەتوانین پەیوەندییەکان بەشارەوە نوێ بکەینەوە یان نا. بۆلینۆ لەکێڵگەکە لەبەرچاوی ئەواندا وا خۆی پیشاندا کە بەزۆری زۆرداری لەتەك ئێمەدا هاتووەو وەکی دیلێك هاتووە.

بەرزایی:750 مەتر.

## 22ی حوزەیران

ماوەی چەند کاتژمێرێکی تەواو چالاکانە رێمانکردو ئۆسکۆرا یاخود مۆرۆکۆسمان لەپاش خۆمانەوە جێهێشت تا گەیشتینە خاڵێکی ئاو کە باسیۆنیسی پێدەڵێن. سەیری نەخشەکەمان کردو تەماشامانکرد بەڵگەکان هێما بۆ ئەوە دەکەن کە ماوەی شەش کاتژمێر رێکردنمان ماوە بۆ فلۆریدا یاخود بۆ یەکەمین شوێنی ئاوەدان، دیارە مەبەستم لەو شوێنەش(بیرای)ە کە زاواکەی بۆلینۆ لەوێندەر نیشتەجێیە بەڵام بۆلینۆ رێگای ماڵی خۆیان نازانێت. نیازمان وابوو لەژێر تریفەی مانگدا درێژە بەرێکردنەکەمان بدەین بەڵام تەماشامان کرد کە ئەو کارە، بەهۆی نزیکبوونەوەمان لەشوێنوجێ ئاوەدانەکانەوە، شایانی ئەوەنییە خۆمانی لەپێناودا بخەینە مەترسییەوە.

## 23ی حوزەیران

تـــەنها کاتـــژمێرێك ڕێمـــانکرد چـــونکە شـــوێنەواری ڕێگاکـــەمان بزرکـــردو سەرلەبەری بەیانیو بەشێك لەدوای نیوەڕۆمان لەسۆراخکردنیدا بەسەربرد، کـاتێکیش کـە دۆزیمانـەوە پاشمـاوەی کاتەکـەمان بـۆ هـەموارکردنی بـۆ ڕێکردنی بەیانی تەرخانکرد. شەوی سان ـ جان شەوێکی ساردنەبوو بەو چەشـنەی کـە پێشـبینیمان کـرد و، بـەو جـۆرەی کـە خـەڵکی بـاس لەسەرماوسۆڵەکەی دەکەن..

بەرزایی:1050 مەتر.

نەخۆشیی ڕەبۆ خەریکە بەشێوەیەکی مەترسیدار هەڕەشەم لێدەکاتو لەنێو هەگبەکەشمدا تەنها کەمێك داودەرمانم پێیە.

## 24ی حوزەیران

لەچوار کاتـژمێری تـەواودا مـاوەی12 کیلۆمـەترمان بـڕی. ڕێگاکـە هـەموارو لەهەنـدێك شوێنیشـدا ڕۆشـنبوو بـەڵام لـەناکاو بزردەبـوو و نـەدەما، ئیـدی کۆششـمان بـۆ سـۆراخکردنی دەکـرد. لـە سـەرەولێژییەکی ئێجگـار سـەخت دابەزاینـــە خـــوارەوەو شـــوێنپێی شـــوانگەلێکمان هـــەڵگرت کـــە لەتـــەك ماڵیاتەکانیانـدا پیایـدا گوزەریـان کردبـوو و، لـەنزیك سەرچاوەیەکی ئـاو کە لەچیای (دۆران)ەوە دێتەخوارەوە، خێوەتەکەمان هەڵدا. ئێستگەکان هەندێك دەنگوباسیان دەربارەی ئەو خەباتەی لەکانەکانـدا لەئارادایە باسـکرد. تینـی ئەو ڕەبۆیەی کە گیرۆدەی بووم، توندتربوو.

بەرزایی:1200 مەتر.

## 25ی حوزەیران

لەسـەر ئـەو ڕێگایـەی کـە شوانەکان لێیانـدابوو درێژەمانـدا بـەرێکردن بـەڵام نـــەمانتوانی بیانگرینـــەوە. لەچێشـــتەنگاودا مێرگێکمـــان بینـــی ئـــاگری

تێبەربوبوو و فرۆکەکانیش بەسەر ناوچەکەدا دەهاتن و دەچوون. لەخۆمان پرسی داخۆ چ پەیوەندییەك لەنێوان ئەم دوو رووداوەدا هەبێت. لەسەر رێکردنەکەمان بەردەوام بووین و گەیشتینە بیرای کە خوشکەکەی پۆلینۆ نیشتەجێیەتی. لەم شوێنەدا سێ خانومان بینی لەنێویاندا خانویەکی جێهێڵراو و یەکێکی دی خەڵکی تیادا نەبوو، هەرچی خانوی سێیەمیشیانە تایبەتبوو بەخوشکەکەی پۆلینۆو چوار منداڵەکەی و پیاوەکە لەماڵەوە نەبوو، چونکە لەتەك بانیاگای هاوسێیدا چوو بوو بۆ فلۆریدا. هەموو شتێك دڵنیاو ئارام دیاربوو. لەدوریی ماوەی کیلۆمەترێك لەم جێیەوە کچێکی بانیاگا نیشتەجێ بوو و ماڵەکەی ئەومان بەشوێنی شەو بەسەربردنمان هەڵبژارد. گوێرەکەیەکمان کڕی و دەسبەجێ سەرمانبڕی و ئەرکی چوون بۆ فلۆریدا بۆ کڕینی هەندێك پێویستیی بەکۆکۆ وجۆلیۆ وکامبا سپێردرا بەڵام سوپا بەنێو شارەکەدا بڵاوبوبووەوە. لەوێندەر50 سەرباز هەبوون و پێشبینی دەکرێت ئەم ژمارەیە بەرزبێتەوە تا دەگاتە120 ـ 130 سەرباز.

دەرکەوت خاوەنی ئەو ماڵەی کە ئێمە تیایدا نیشتەجێین پیرەمێردێکە ناوی فیلنیلۆن کۆکایە.

ئێستگەی ئەرجەنتین باسی لەکوژرانی87 سەرباز لەریزەکانی سوپادا کرد. هەرچی بۆلیڤییەکانیشە ژمارەی راستەقینەی کوژراوەکانیان دەشارنەوە(سیگلۆ**). تینی رەبۆکەم روو لەزیادبوونە و ئەمێستا ناهێڵێت خەو بچێتەچاوم.

بەرزایی:780 مەتر.

## 26ی حوزەیران

رۆژێکی رەشم بەسەربرد. ئارامیی باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشابوو و پێشان پێنج پیاوم ناردبوو بۆ ئەوەی شوێنی ئەو کەسانە بگرنەوە کە

لەبۆسەکەی سەر رێگای فلۆریدا دامەزرابوون کاتێك کە کتوپڕ دەنگی تەقە هاتەبەرگوێم. هەر خێرا بەسواری ئەسپ رووەو سەرچاوەکەی چووین و خۆمان لەبەردەم دیمەنێکی سەرسوڕهێندا بینییەوە: لاشەی چوار سەرباز لەسەر خۆڵ و لمی رووبارەکەو لەژێر تیشکی خۆرەتاو و لەنێوەندی هێمنییەکی تەواودا کەوتبوو. نەماندەتوانی چەکەکانیان لێدابماڵین چونکە نەماندەزانی پێگەی دوژمن لەکوێدایەو کاتژمێریش خەریکبوو دەبووە پێنج، هەربۆیە چاوەڕوانمانکرد تا شەودابێت بۆ ئەوەی کارەکە جێبەجێ بکەین لەناکاو میگیل وتی گوێم لەخشەی لق وپۆپی درەختە لای ژوورمەوە دەشکێنرێت. ئانتۆنیۆوپاچۆ بەرەو سەرچاوەی دیاریکراو بەرێکەوتن و فەرمانی ئەوەیان پێیە کە تەقە نەکەن تا لەبوونی دوژمن دڵنیادەبن. لەدوای چەند دەقیقەیەکی کەم لەهەردوو لاوەو، ئەمجارە بەشێوازێکی سەرتاپاگیر، تەقە دەستیپێکرد. فەرمانی کشانەوەمدا چونکە بڕوام وا بوو لەهەلومەرجێکی لەمجۆرەدا بەخت یاوەرمان نابێت. کشانەوەکە دواکەوت و هەواڵی کەوتنەوەی ئەم دوو زامدارەم پێراگەیشت: پۆمبۆوتۆما، پۆمبۆ لاقی پێکرابوو، تۆما سکی. دەسبەجێ بەرەو خانووەکە گواستماندنەوە بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو ئامێرانەوە کە هەمانە، گوللەکان لەلەشیاندا دەربهێنین. زامەکەی پۆمبۆ سوکبوو هیچ ترسێکی نەبوو تەنها ئەو دواخستنە نەبێت کە توشی کردین. هەرچی ئەو گوللەیەشە کە تۆمای پێکابوو، جگەری کەرتکردبوو و گەدەی بڕیبو و، ئیدی لەکاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکەدا گیانی لەدەستدا. بەگیانلەدەستدانی تۆما ئەو هاوڕێیەم لەدەستدا کە بەدرێژایی ئەم ساڵانە لەتەکمدابوو و دڵسۆزییەکەی بەرەنگاری هەموو ئەزمون و مەینەتییەکی بووەوەو هەست دەکەم رۆڵەیەکی خۆمم لەکیسچووە. سەروەختێك کە پێکراو لەخوێنیخۆیدا دەگەوزا داوای کرد کاتژمێرەکەی دەستی بدەنە من، لەبەرئەوەی هاوڕێیانیش سەرگەرمی فریاکەوتنیبوون و

دەسبەجێ داواکەیان جێبەجێ نەکرد، هەربۆیە بەدەستی خۆی لەمەچەکی خۆی داکەندو دایە دەست ئارتۆرۆ. ئەم ئاوڕدانەوەیە لەلایەن ئەوەوە بەرجەستەی خواستی شاراوەی دەکات بۆ ئەوەی کاتژمێرەکەی بۆ کوڕەکەی ڕەوانەبکەم، وەکی یادەوەریی باوکێك کە هێشتا ئاشنای نەبووە، بەوێنەی ئەو کارەی کە سەبارەت سەرجەم ئەو هاوڕێیانە کە لەگۆڕەپانی شەڕدا گیانیان لەدەستدا، دەمکرد. منیش بەدرێژایی شۆڕش دەیکەمە مەچەکم. دوو سیخوڕی تازەی سەر بەهێزی قەناسمان دەستگیرکرد یەکێکیان ئەفسەرە بەپلەی مولازمی یەك. بەتوندی ئاگادارمان کردنەوەو دواتر، دوای ئەوەی لەجلوبەرگەکانیان دامانمالین، ئازادمان کردن. .بەلاّم پیاوەکانمان زێدەڕۆییان لەراقەکردنی ئەو فەرمانەدا کرد کە پێیاندرابوو و تەنها شۆرتەکانیان لەبەریاندا هێشتەوە. ناوچەکەمان جێهێشت و7 ئەسپمان پێبوو.

## 27ی حوزەیران

دوای ئەوەی لەو ئەرکە بەسوێیە لێبووینەوە، دیارە مەبەستم لەناشتنی تۆمایە، ڕێکردنەکەمان دەستپێکردەوەو لەنیوەی ڕۆژدا بەتیجیریای ڕاستەقینە راگەیشتین. لەکاتژمێر دوودا پێشڕەوەکە بەقۆناغێك بۆ ماوەی15 کیلۆمەتر دەرچوو...ئێمەش لەکاتژمێر دوونیودا درێژەماندا بە ڕێکردنەکەمان. سەبارەت گرووپی کۆتایی گەشتەکە دوورودرێژبوو. چونکە شەویان بەسەردا هات و ناچاربوون چاوەڕوانی هەڵهاتنی مانگ بکەن و دواجار لەکاتژمێر دوونیودا گەیشتنە بالیزا کە لەوێندەر ڕێبەرەکانمان نیشتەجێن.

بەرزایی:850.

## 28ی حوزەیران

دوو ئەسپمان بۆ خاوەنی خانووەکە لەتیجیریا گەڕاندەوە بۆ ئەوەی بیانگەیێنێتە بانیاگا دوای ئەوەی کە بۆمان دەرکەوت کوڕەزای پیرەمێردەکەیە. لەبەرامبەر40 دۆلاردا ڕێبەرێکمان دۆزییەوەو پێشنیاری ئەوەی بۆ کردین رووەو سەرەولێژیی ئەو رێیەمان ببات کە بەرەو ماڵی دۆن لۆکاس دەچێت بەڵام بەرلەوە لەبەردەم ماڵێکدا کە ئاوی تیادایە لاماندا. لەکاتێکی درەنگدا دەرچووین بەڵام مۆرۆوریکاردۆ زۆر دواکەوتن و نەمتوانی گوێ لەدەنگوباس بگرم. لەکاتژمێرێکدا ماوەی کیلۆمەترێکمان بڕی. لەنێو هەواڵەکاندا دەنگوباسی ئەوە بڵاوکرایەوە کە سوپا(یاخود یەکێك لەئێستگەکانی)پەردەی لەسەر کەوتنەوەی سێ کوژراو و دوو بریندار لەکاتی پێکداداندا لەتەك جەنگاوەران لەناوچەی مۆسکیرادا هەڵداوەتەوە. هەڵبەت ئەم ڕاگەیاندنە ئاماژە بۆ ئەم شەڕەی دواییمان دەکات بەڵام ئێمە بەچاوی خۆمان لاشەی چوار سەربازمان بینی...مەگەر یەکێك لەو سەربازانە، بەشێوازێکی دروست سەرسوڕهێن، خۆی کردبێتە مردو.

خانوی جێهێڵراوی پیاوێکمان دۆزییەوە کە ناوی زیایە بەڵام هەندێك گاوگۆل لەدەوروبەرییەوە دەلەوەڕان و گوێرەکەکەشی لەنێو گەوڕەکەدا بوو.

بەرزایی:1150 مەتر.

## 29ی حوزەیران

بەهۆی دواکەوتنیانەوە گفتوگۆیەکی جدیم لەتەك مۆرۆوریکاردۆدا کردو بەشی هەرە زۆری بەر ریکاردۆ کەوت. کۆکۆوداریۆ کە لەپیاوانی پێشڕەون، هاوڕێی مۆرۆ، بەسواری ئەسپ چوون بۆ گواستنەوەی کەلوپەلەکان. ناتۆ کەلوپەلەکانی خۆی هێشتەوە چونکە لەسەرجەم وڵاخەکان بەرپرسیارە. دواتر کەلوپەلەکانی من و کەلوپەلەکانی پۆمبۆی بەهێستریك

گواستەوەوپۆمبۆ توانی بەئاسانی بەسواری ماینێکی ماڵیی و دەستەمۆ بگاتەجێ و شەوی لەماڵی دۆن لۆکاس کردەوە کە لەبەرزایی چیاکە لەبەرزایی1800 مەترو لەتەك دوو کیژەکەیدا کە یەکێکیان چەقەلو(28)ی دوچاری هەڵئاوسان بووە، نیشتەجێیە. هەروەها خانوگەلی دیکەش هەبوون یەکێکیان تارادەیەك چۆڵەو خاوەنداریيەکەی بۆ وەرزە کرێکارێك دەگەڕێتەوەو دووەمیشیان ناومالی باشی تیادایە. شەوەکەی باراناوی وساردبوو...ئەگەر ئەو زانیارییانەش کە گردمانکردونەتەوە دروست بن دەتوانین بەنیو رۆژ بەبارشیلۆن رابگەین. بەلاّم جوتیارگەلێك کە بەم دواییانە لەو رێیەوە هاتن وتیان زۆر خراپە. هەرچی خاوەن خانووەکەشە بۆچوونی پێچەوانەی هەیەو دەڵێت دەتوانرێت بەئاسانی هەمواربکرێت. جوتیارەکان بۆ بینینی ئەو زەلامە هاتن کە چووەتە خانووەکەی‌دی هەربۆیە وەکی گومانلێکراو دەستگیرکران.

لەرێگادا قسەم بۆ گروپە بچوکەکەمان کرد کە ئەمێستا لە24 جەنگاوەر پێکدێت و نموونەیەکی دیکەم بۆ پیاوەکان باسکرد، دیارە مەبەستم لەنموونەی چینۆیە، هەروەها مانای ئەو زیانانەو مانای گیانلەدەستدانی تۆما سەبارەت خۆمم بۆ راڤەکردن کە وەکی رۆڵەیەکی خۆم وا بوو. رەخنەم لەپێشێلکردنی دیسپلین و بەخاویی رێکردن گرت و بەڵێنی ئەوەم پێدان کە بەزانیاری زیاتر تەیاریان بکەم بۆ ئەوەی ئەوە دووبارە نەبێتەوە کە لەبۆسەکانی رابوردودا روویدا، هەڵبەت مەبەستم لەگیانبەختکردنی بێ‌بەهانەیە چونکە رەچاوی رێساکانی شەڕ نەکرا.

## 30ی حوزەیران

لۆکاسی پیرەمێرد هەندێك زانیاری دەربارەی هاوسێکانی پێداین و دەرکەوت کە سوپا بۆ هەمووارکردنی هەلومەرج لەم ناوچەیەوە تێپەڕیوە.

وتـی یـەکێکیان کـە نـاوی ئانـدۆڵفۆ دیـازە سـکرتێری گشـتی سـەندیکای جوتیـارانی ناوچـەکەیە کـە سـەندیکایەکی دڵسۆزی باریـانتۆسە.. هەرچـی ئەوی دیکەشیانە پیرەپیـاوێکی هەڵـەوەڕە دوای ئـەوەی توشـی ئیفلیجیی‌بوو بـەرەڵاکرا.. هـەروەها هاوسـێیەکی سـێیەمیش هەیـە، بەوتـەی هاوڕێکـانی کابرایەکی ترسنۆکەو، رەنگە بۆ ئـەوەی خـۆی دوچاری کێشە نـەکات(قسـە بکـات). پیرەمێردەکـە گفتـی ئەوەیـدا هـاوڕێ لەتەکمانـدا بێـت و یارمـەتیمان بـدات لەکردنـەوەی رێیەکـدا بـەرەو بارشـیلۆن، هەرچـی دوو جوتیارەکـەی دیکەشـــە دواتـــر شـــوێنمان دەکـــەون و دەمانگرنـــەوە. ئـــەمڕۆمان بەپشـــوو بەسەربردو، کەشەکەی باراناوی و رەشەبا بوو.

لەسـەر ئاسـتی سیاسـییش، لێدوانەکـەی ئۆڤانـدۆ کـە هێمـا بـۆ بـوونی مـن دەکـــات لێـــرە، گـــرنگترین رووداوە لەئێســـتادا. وتـــی ســـوپا روبـــەروی جەنگاوەرگـەلی مەشـقپێکراو لەسـەر جـەنگی پـارتیزانیی دەبێتـەوە کـە لـەنێو ریزەکانیاندا سەرانی ڤیتکۆنگ دەسازێنن کە تاڵاوی شکستیان دەرخواردی باشـترین لیواکـانی سـوپای ئەمـەریکای بـاکور داوە. لـەم قسـانەیدا پشـتی بەلێدوانـەکانی دۆبـرێ ئەسـتورکردووە کـە وادیـارە زیـاد لەپێویسـت قسـەی کردووە، ئەگەرچی ناتوانین نە بەهاونرخی ئەم لێدوانانەو نە ئەو هەلومەرجە بخـەملێنین کـە پاڵیـان پێـوە نـاوە ئـەو قسـانە بکـات کـە لەسـەر زاری ئـەو باسکران. پڕوپاگەندەیەك بڵاوبووەوە دەڵێت لۆرۆ کوژراوەو دەڵێن من هـانی کرێکـــارانی کانـــەکانم داوە بـــۆ یـــاخیبوون، ئـــەوە هـــەمووی بەشـــێکی جیانـــەبووەوە بـــووە لەنەخشـــەیەك کـــە بـــەوردی لەتـــەك ئـــەو جەنگـــە کـــە لـــەنانکـــاهوازو لەگۆڕێدایـــە دارێـــژراوە. کاروبارەکـــان لێـــرە بەباشـــی رێدەکەن و(فیرناندۆ ساکا مۆیلاس)لەجێبەجێکردنی کارەکەی تەواوبوو.

نامەیەکمان لەکوباوە پێراگەیشت تیایدا باس لەئاست و ئەندازەی لاوازیی جوڵانـەوەی شۆڕشـگێڕیی چـەکداریی لـەپیرۆ و هـەژاریی لـەربارەی چـەك و

پیــاوەوە دەكــەن ئەگەرچــی ســەروەت‌و ســامانێكی زۆریشــی بــۆ خەرجكراوە..هەروەها لەنامەكەدا باس لەرێكخراوێك دەكەن كە دەوترێت رێكخراوێكی شۆڕشگێڕییەو باز ئیستانسوروكۆلۆنێل سیۆن كە بەرۆبن جۆلیۆ ناسراوەو دەوڵەمەندێكی گەورەو هاندەرێكی سەر بەناوچەی باندۆیە، رێبەرایەتی دەكات. وادیارە ئێستاكە لەگوابامیرین(    )ن، ئەو( ).

## لێكدانەوەی مانگانە

خاڵە خراپەكان ئەمانەن: دژواریی پەیوەندیگرتن لەتەك جواكین‌و زیانی بەردەوام لەپیاوگەلدا... چونكە هەر پیاوێك كە گیان لەدەست دەدات وەكی شكستێك وایە بۆ ئێمە، ئەگەرچی سوپا ئاگای لەم راستییەش نییە. لەماوەی مانگی پێشودا چەند شەڕێكی بچوكمان كردو بەگوێرەی راگەیاندنە فەرمییەكانی سوپا چوار كوژراو و سێ بریندارمان لەریزەكانیدا خستەوە.

ئەمانەی خوارەوەش گرنگترین تایبەتمەندییەكانن:

1)نەبوونی پەیوەندی هێشتا سەرتاپاگیرەو ئەمەش مانای ئەوە دەگەیێنێت كە نەمانتوانیوە لەژمارەی هێزەكانمان كە24 پیاوە، زیاد بكەین، لەكاتێكدا كە كەسێكمان(واتە، پۆمبۆ) زامدارەو گیرۆدەی بەخاویی رێكردنیشین.

2)هەڵوێستی پابەندنەبوون‌و پەیوەندینەكردنی جوتیاران هێشتا هەر بەردەوامە. ئێمە لەنێو بازنەیەكی بۆشدا دەخولێینەوەو، بۆ ئەوەی بتوانین رووەو پابەندبوون بەجەنگی شۆڕشگێڕییەوە پاڵیان پێوەبنێین دەبێت بەشێوەیەكی بەردەوام چالاكییەكانمان لەناوچە ئاوەدانەكاندا ئەنجام بدەین‌و ئەمەش پێویستیی بەژمارەیەكی زۆرتر لەپیاوگەلی جەنگاوەر هەیە.

3)ئەفسانەی جەنگی پارتیزانیی رەهەندگەلێکی ئەندێشەیی بەخۆوە دەگرێت چونکە بووینەتە پیاوگەلێکی لەسەرو ئاستی مرۆڤەوە کە ناتوانرێت ببەزێنرێن.
4)کەمترین پەیوەندیمان بەحیزبەوە نییە ئەگەرچی بەهۆی پۆلینۆوە هەوڵێکمان داوەو رەنگە بەروبومی گەیوی خۆی بدات.
5)لەنێو دەنگوباسەکاندا هێشتا دۆبرێ لەریزی پێشی پێشەوەدایە بەلام دۆزەکەی وایەستەی کەسی من کراوەو لەروانگەی جیهاندا بوومەتە رابەری ئەم جولانەوەیە. دواتر لەرێگای کاردانەوەکانی حکومەتەوە: ئایا کاردانەوەگەلێکی سەبارەت ئێمە باش دەبن یاخود خراپ، دەرەنجامەکانی ئەم مانۆڕەمان بۆ دەردەکەوێت.
6)ورەگەلی پیاوەکان بەرزەو پێداگریی خەباتکردنیان رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر دەبێت و کوباییەکان لەگۆڕەپانی شەڕدا هەموویان سەرمەشقن بۆ ئەوانی دیو، تەنها دووان یاخود سێ بۆلیڤیی لاواز هەن.
7)سوپا هێشتا لەبارەی جێبەجێکردنی کارە سەربازییەکەیەوە کەنەفتە بەلام لەنێوەندی جوتیاراندا دەستیکردووەتە چالاکییەکی بەردەوام کە دەبێت تەواو وریای بین چونکە چ بەکاریگەریی ترساندن بێت یاخود فریودان و چەواشەکردنیان لەئامانجە راستەقینەکانی ئێمە، تێکڕای ئەندامانی میللەت دەکاتە سیخوڕ.
8)ئەو کۆمەڵکوژییانەی کە لەکانەکاندا بەرپاکران بیرۆکەیەکی رۆشنمان سەبارەت هەلومەرجی باو پێدەدات کە ئەگەر بتوانین ئەو بەیاننامەیە کە ئاراستەی میللەتمان کردووە بلاوبکەینەوە، ئەوە بەشدارییەکی زۆر لەرۆشنکردنەوەی هەڵوێستدا دەکات.

ئەرکی بەپەلەمان بریتییە لەسەرلەنوێ پەیوەندیگرتنەوە لەتەك لاپازو نوێکردنەوەی کەلوپەلە سەربازیی و پزیشکییەکانمان و ئامادەکردنی50 تا 100پیاو لەنێو شاردا، ئەگەرچی ژمارەی ئەو جەنگاوەرانەی کە بەکردەوە بەشداری لەشۆڕشدا دەکەن لە10 تا 25 کەس تێناپەڕێت.

## 1ی تەمموز 1967

بەرلەوەی خۆر بەتەواوی سەربکەوێت رووەو بارشیلۆن یاخود بارسیلۆنا بەو چەشنەی کە لەنەخشەکەدا هاتووە، دەرچووین و لۆکاس ی پیرەمێرد یارمەتیداین لەهەمووارکردنی ئەو رێگایەدا کە وێڕای ئەوە هەر بەسەخت و خز مایەوە. لەبەیانیدا پیاوانی پێشڕەو دەرچوون و ئێمەش لەکاتی نیوەڕۆدا شوێنیان کەوتین و سەرلەبەری دوای نیوەڕۆمان لەدابەزین لەدۆڵەکەو سەرکەوتن بەسەریدا لەلایەنەکەی ترەوە، بەسەربرد. لەیەکەمین کێڵگەدا کە لەرێگا توشی بووین لێی خەوتین و پیاوانی پێشڕەویش لەسەر رێکردن بەردەوام بوون. لەکێڵگەکە چاومان بەسێ مندالی زۆر شەرمن کەوت کە وادیارە مندالی بنەماڵەی ییبێزن.

باریانتۆس لەوتوێژێکی رۆژنامەوانیدا پێی‌نا لەبوونی من لەبۆلیڤیا بەلام پێشبینی کرد لەچەند رۆژی داهاتوودا بکوژرێم. ئەم بۆنەیەشی قۆستەوە بۆ ئەوەی وەکی جاری جاران دەست بکاتەوە بەهەڵەوەڕیی و ئەو قسە قۆڕانەی کە پێی ناسراوە. ئیدی بەمشک‌ومار ناوی بردین و جارێکی دیکەش سوربوونی خۆی لەسەر بەتوندی سزادانی دۆبرێ راگەیاندەوە.

بەرزایی: 1550 مەتر.

جوتیارێکمان دەستگیرکرد ناوی ئاندریاس کۆکایەو لەرێگا توشمان بوو بەتوشییەوە، هەروەها ئەم دوو جوتیارەی دیکەشمان پێش خۆمان خست: رۆک‌وپیدرۆی کوڕی.

## 2ی تەمموز

لەبەیانیدا پەیوەندیمان بەپیاوانی پێشڕەو کردەوە کە لەبەرزایی تەپۆلکەکەدا خێوەتیان هەڵدابوو، چوو بوونە ماڵی دۆن نیکۆمیدیس ئۆتاجا

کە لەوێندەر درەختێکی پرتەقاڵ هەیە. لەوێندەر هەندێك جگەرەمان کڕی و خانووە سەرەکییەکە لەلای خوارو لەسەر(بیۆجیرا)دروست کرابوو ئیدی رووەو ئەویَ رێمانکردو زگە برسییەکانمان تێرکرد. بیۆجیرا بەنێو چەمێکی ئەملاو ئەولا سەختدا رێدەکات و تەنها لەلای خوارووەکەیەوە و رووەو ئانگۆستۆرا دەتوانرێت بەپێ بەشوێنیدا ریَ بکرێت. دەروازەی دۆڵەکە لەگۆنتایە کە شوێنێکی دیکەیە لەسەر هەمان رووبار بەڵام بۆ راگەیشتن بەو جێیە پێویستە لەتەپۆلکەیەکی نیمچە بەرز بپەڕدرێتەوە. ئەم شوێنە بەشوێنێکی گرنگ دادەنرێت چونکە خاڵی بەیەکگەیشتنی چەند رێیەکەو بەرزاییەکەشی لە950مەتر تێناپەڕێت و کەش و هەواکەشی نێجگار مامناوەندە...لەم جێیەدا گەنەی ماڵیات نامێنێت و(ماریگی)شوێنی دەگرێتەوە. گوند لێرەدا لەماڵی(ئاتیگا)و خانووی هەندێك لەمنداڵەکانی پێکدێت کە خاوەنی کێڵگەیەکی بچکۆلەن درەختی قاوەی تیادا چێنراوەو ناوبەناو هەندێك لەناسیارەکانیان کە نیشتەجێی دەوروبەرن کاری تیادا دەکەن. ئەو دەمە شەش جوتیاری دەوروبەری سان جوان کاریان تیادا دەکرد.

لاقی پۆمبۆ بەخێرایی پێویست چاك نەبووەوەو هۆکاری ئەمەش بۆ ئەو گەشت و گەڕانە بەردەوامانە دەگەڕێتەوە کە بەسواری ئەسپ کردنی..بەڵام سوپاس بۆ خوا لەئێستادا هیچ جۆرە ماکێکیخراپی نییە.

## 3ی تەمموز

بەدرێژایی رۆژ لەخێوەتەکەدا ماینەوە بۆ ئەوەی زۆرترین ماوە لەپشوو کە لەتوانادابێت بۆ لاقی پۆمبۆ برەخسێنین، لەنرخی ئەو کەلوپەلانەدا کە کڕیمانن پارەوپولێکی زۆرماندا و ئەمەش بووە هۆی کێشکردنی جوتیاران لەنێوان ترس و بەرژەوەندیدا هەرچییەکمان پێویست بێت پێشکەشمانی

بکەن. هەندێك وێنەم گرت سەرنجی سەرجەم هاوڕێیانی بەرەو لای خۆی ڕاکێشا. دواتر هەوڵی ئەوە دەدەین بیانشۆینەوەو گەورەیان بکەین و بڵاویان بکەینەوە: ئەمەش سێ گرفتی تازەن. دوای نیوەڕۆ فڕۆکەیەك بەسەر ناوچەکەدا هات و لەئێوارەدا هاوڕێیەك باسی لەمەترسی بۆردومانی شەو کردو ئەمەش وای لەتێکڕای دانیشتوانەکە کرد کە هەمان شەو ناوچەکە جێبهێڵن بەڵام دوای ئەوەی شرۆڤەی ئەوەمان بۆ کردن کە ڕووبەڕووی هیچ مەترسییەك نابنەوە، لەنیازەکەیان پاشگەزمان کردنەوە. ڕەبۆکە هێشتا لەگەمارۆدانم بەردەوامە.

## 6ی تەمموز

لەکاتێکی زوودا ڕووەو بینا کۆلۆرادۆ دەرچووین و لەڕێگامانــدا بەناوچەیەکی ئاوەدان بەو دانیشتوانە کە بەترس ولەرزێکی زۆرەوە پێشوازییان لێکردین، تێپەڕین. لەئێوارەدا گەیشتینە ناوچەیەك بەسەر بالیرمۆدا دەڕوانێت و تێکڕا1600 مەتر بەرزە، دواتر ڕووەو گوندەکە دابەزاین و لەوێندەر پێویستییەکانمان لەکۆگایەکی بچوك کڕی. سەروەختێك دواجار گەیشتینە ڕێگاکە شەو تاریك داهاتبوو و لەوێندەر خانویەکی تەنیای پیرەژنێکمان هاتەرێ. پێشڕەوە دودڵەکە نەیتوانی دەستی بەسەردابگرێت و نەخشەکەش بەوجۆرەبوو دەست بەسەر یەکێك لەو ئۆتۆمبیلانەدا بگیرێت کە لەسۆمایباتاوە دێن و پرسیار دەربارەی بارودۆخ لەوێندەر بکرێت و لەتەك خاوەن ئۆتۆمبیلەکەدا بگەنە ئەوێندەر. دواتر بەگوێرەی نەخشەکە دەبێت پەلاماری(دیکۆ) بدرێت و هەندێك داودەرمان لەدەرمانخانەکە بکڕدرێت و دەست بەسەر نەخۆشخانەکەدا بگیرێت و هەندێك خواردەمەنی قوتوو و شیرەمەنی بکڕدرێت و پاشان دەسبەجێ ناوچەکە جێبهێڵرێت.

لەبەرئەوەی هیچ ئۆتۆمبیلێك لەسۆمایباتاوە نەهات و لەبەرئەوەی زانیاری ئەوەمان دەستگیربوو کە ئۆتۆمبیلەکان لەوێندەر راناوەستن، یاخود بەدەستەواژەیەکی دی رێکە کراوەبوو، ناچاربووین نەخشەکەمان بگۆڕین. ئەرکی جێبەجێکردنی پرۆسەکەم بەریکاردۆوکۆکۆوپاچۆو ئانیسیتۆ سپارد..ئەوانیش بەبێ دژوارییەکی ئەوتۆ کە شایانی باس بێت دەستیان بەسەر ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگردا گرت کە لەسانتاکروزەوە دەهات، بەڵام ئەوەی کە روویدا ئەوەبوو بارهەڵگرێکی دی گەیشتبووە ئەو جێیەو بۆ هاوکاری بارهەڵگری یەکەم راوەستابوو ئیدی ئەویش دەستی بەسەرداگیرا. وادیارە هاورێیان ناچاربوون ماوەیەکی دورودرێژ لەتەك خانمێکدا کەلەتەك کچەکەیدا لەنێو بارهەڵگرەکەدا بوون، خەریکی دانوستان بن چونکە قایل نەبوو کچەکەی لەئۆتۆمبیلەکە دابگرێت. بارهەڵگری سێیەمیش راوەستابوو تاوەکو بزانێت چی روویداوەو بەدوای ئەویشدا بارهەڵگری چوارەم لەبەردەم دودڵیی هاورێیاندا راوەستاو...رێگاکەی قەپات کرد. دواتر سەرە هاتە سەر رێکخستنی کاروبارەکان: هەر چوار ئۆتۆمبیلەکە لەگوێ رێگاکە ریزبوون و یەکێك لەشۆفێرەکان بەوە وەڵامی پرسیاری خەڵکانی خۆتێهەڵقورتێنی دایەوەو وتی بەمەبەستی کەمێك پشوو لێرە لاماندا وە. هاورێیانمان بەسواری یەکێك لەئۆتۆمبیلەکان دەرچوون و گەیشتنە سۆمایباتا و دووان لەسەربازانی قەناس و دواتر فاکافلۆری ئەفسەری مولازمی سەرۆکی پاسگە(مخفر)کەیان دیلکرد. بەهۆی ناوبراویشەوە واژەی نهێنییان دەستگیر بوو و بەهۆی پەلامارێکی کتوپڕەوەو دوای ئاڵوگۆڕی تەقە لەتەك سەربازێکدا کە سوربوو لەسەر بەرگریکردن، پاسگەکەیان داگیرکرد کە دە سەربازی تیادابوو. دواتر توانییان5 تفەنگ لەجۆری مۆزەرو دۆشکەیەکی عەیار زب ـ 30 بفرۆشن و هەروەها لەتەك خۆشیاندا دە دیلیان هاوردو لەدواییدا لەدوریی کیلۆمەترێك لەسۆمایباتاوە بەروت وقوتی

جێیانهێشتن. پرۆسەکە لەلایەنی ئازوخەوە پرۆسەیەکی سەرنەکەوتوبوو چونکە چینۆ بەقسەی پاچۆوجۆلیۆ فریوی خواردو هیچ شتێکی بەکەڵکی نەکڕی. لەنێو ئەو داودەرمانانەشدا کە لەتەك خۆیاندا هاوردیان هیچ پێویستییەکی خۆمم تیادا نەدۆزییەوەو ئەم دەرمانانەش بۆ جەنگاوەران پێویست نین چونکە دەرمانگەلی لەوان پێویستتر هەیە. پرۆسەکە بەبەرچاوی سەرجەم دانیشتوانی ناوچەکەو تێکڕای ڕێبوارانەوە ئەنجامدرا هەربۆیە دەنگوباسەکەی، وەکی ئاگری نێو پەلاش، بەخێرایی بلاوبووەوە. کاتێك کە کاتژمێر دەبووە دوو ئێمە لەدەستکەوتەکانمان دوور کەوتبووینەوە.

## 7ی تەمموز

بەبێ‌راوەستان ڕێمانکرد تا گەیشتینە کێڵگەیەکی چێنراو بەقامیشی‌شەکرو کە جاری پێشوو لەوێندەر لەدوریی کاتژمێرە ڕێیەك لەماڵی رامونەوە یەکێك لەپیاوەکان بەگەرمیی پێشوازیی لێکردین. ترس بەروخساری دانیشتوانەکەوە دیاربوو و کابرا بەوپەڕی نیانی بەوە قایلبوو بەرازێکمان پێ‌بفرۆشێت بەڵام لەبوونی200 سەرباز لەلۆس ئاگۆس‌و100 سەربازی دی لەسان جوان ئاگاداری کردینەوەو ئەم زانیارییانەشی لەبراکەیەوە دەستگیربووە کە بەم دواییانە سەردانی سان جوانی کردووە. حەزم کرد هەندێك لەددانەکانی کە ئازاریان هەبوو بۆی هەڵبکێشم بەڵام ئەو نەیویست. تینی ئازاری ڕەبۆکەم ڕوو لەزیادبوونە.

## 8ی تەمووز

لەو خانووەوە کە لەنێو کێڵگەکانی قامیشی‌شەکردا دروستکراوە زۆر بەوریایی ڕووەو بیۆجیرا ڕێمانکرد بەڵام بێدەنگیی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو و هیچ شوێنەوارێکی سەربازمان بەدی نەکردو ئەو پیاوانەی کە لەسان جوانەوە دەهاتنەوە وتیان شار لەسەربازان خاڵییە. هەڵبەت ئەمە فێڵێکی ئەو کابرایە خۆی بوو بۆ ئەوەی لەناوچەکە دورمانبخاتەوە. بەدرێژایی ڕووبارەکە ماوەی دوو کاتژمێر ڕێمان بڕی تا گەیشتینە بیرای‌و لەوێندەرەوە ماوەی کاتژمێرێکی دی ڕێمانکرد تا لەتەك داهاتنی تاریکی‌دا گەیشتینە ئەشکەوتەکەو بەو هۆیەشەوە لەفیلۆ نزیکبووینەوە.

پزیشکەکە چەند جارێك دەرزیی بۆ کردم بۆ ئەوەی بتوانم درێژە بەرێکردنەکە بدەم، دواجار ناچاربووم ئاوێتەی ئەدرینالین بەکاربهێنم کە ڕێژەی کولێر تیایدا گەیشتە 1/900. ئەگەر پۆلینۆ لەجێبەجێکردنی

ئەرکەکــەی ســەرکەوتوبوو...دەبێــت بــەرەو نانکــاهوازو بگەڕێینــەوەو داودەرمانی گونجاو بۆ ئەو ڕەبۆیە کە گیرۆدەی بووم، بهێنین.
سوپا ڕاگەیاندنێکی دەربارەی ئەم پرۆسەیەی دوایی دەرکردو تیایدا پێی‌نا لــەکوژرانی ســەربازێك..هەڵبــەت لــەکاتی ئــاڵوگۆڕی تەقــەو داگیرکردنــی پاسگەکە لەلایەن ریکاردۆ وکۆکۆو پاچۆوە، کوژراوە.
لەســـــەرەتای گەشـــتەکەدا ڕێگاکـــەمان بزرکـــردو هـــەموو بـــەیانیمان لەسـۆراخکردنیدا بەسـەربرد. لـەنیوەڕۆدا ڕێیـەکمان وەبـەرگرت کـە تـەواو ڕۆشن نییەو بەرەو بەرزترین بەرزایی کە تائێستا پێیراگەیشتووین بردینـی، بەرزایی1840 مەتر...لەپاش ماوەیەکی کەم گەیشتینە کوختێکی جێهێڵراو و شـەومان لەوێنـدەر بەسـەربرد. هـیچ گرەنتییـەکمان دەربارەی سـەلامەتیی ڕێگا بەرەو فیلۆ دەستگیرنەبوو.
ئێسـتگەکە ڕێکـەوتنێکی لەتـەك کرێکـارانی کاتـاڤی و سـیگلۆ** و لـەنێوان کۆمیسول کـە لـە14 خاڵ پێکهاتووە، ڕاگەیانـد...ئـەم ڕێکەوتنـە شکسـتێکی تەواوە بۆ ڕەنجدەران.

## 10ی تەمموز

لـەکاتێکی درەنگـداو، دوای ئـەوەی ماوەیـەکی بـەیانیمان لەگـەڕان بەشـوێن ئەسـپێکی بزربـوودا بەسـەربردو دواتـر دۆزیمانـەوە، دەرچـووین. ڕێیـەکی لێنـەدراو لەبـەرزایی1900 مـەترمان وەبـەرگرت. لەکاتـژمێر سـێ‌ونیودا گەیشـتینە کـوختێکی جێهێڵـراو و بڕیارمانـدا شـەو لـەو کوختـەدا بکەینـەوە بـەڵام لەدواییـدا کتـوپڕ ڕێگاکـە بزربـوو. دواتـر سـەبارەت ڕەوتگـەلی لاوەکـی ناوچەکەمان پشکنی بەڵام کەڵکی نەبوو...لەبەرامبەرماندا کێڵگەگەلێك هەن وا بڕوا دەکرێت کێڵگەکانی فیلۆبن.

ئێستگەکە باسی لەڕوودانی پێکدادانێك لەنێوان سوپا و جەنگاوەران لەناوچەی ئیلدۆرادۆدا کرد کە لەسەر نەخشەکە بوونی نییەو لەنێوان سۆمایباتا وریۆگراندیدایە. .لەنێو ڕاگەیاندنە سەربازییەکەدا هەواڵی ئەوە بڵاوکرایەوە کە سوپا سەربازێکی زامداربووەو ئێمەش دووانمان کوژراوە. لەلایەکی دیکەوە پێناچێت لێدوانەکانی دۆبریۆ وبیلادۆ باشبن چونکە بەتایبەت دانیان بەوەدا ناوە کە جەنگە پارتیزانییەکە ئامانجگەلی لەسەر ئاستی سەرجەم کیشوەرەکەدا هەیە...نەدەبوو قسەی لەو جۆرە بکەن.

## 11ی تەمموز

ڕۆژێکی بارانـاوی و تەمومژیچڕە: لەرێگای گەڕانەوەماندا شوێنەواری هەموو ڕەوتەکانمان شوێن بزرکردو دواجار لەپیاوانی پێشڕەو جودابووینەوە کە ڕێیەکیان بۆ خۆیان لێدا کە پێشتر گوزەری پیاداکرابوو. گوێرەکەیەکیشمان سەربڕی.

## 12ی تەمموز

بەدرێژایی‌ئەمڕۆ چاوەڕوانی دەنگوباسی میگیل بووین. بەڵام کاتێك کە شەو داهات جۆلیۆ بەتەنیا هاتەوەو وتی جۆگەیەکم دۆزیوەتەوە ڕووەو باشور دەچێت. لەشوێنی خۆماندا ماینەوەو، ئێش‌وئازاری ڕەبۆ هاڕیومی.
ئێستگەکە هەواڵێکی دیکەی بڵاوکردەوە کە پێدەچێت گرنگترین خاڵ کە تیایدا هات ڕاست بێت: چونکە باسی لەپێکدادانێك کرد لەئیکیرا کە تیایدا هاوڕێیەکی ئێمە کوژراو سەربازەکان لەتەك خۆیاندا بەرەو لاگۆنیلاس بردیان. ئەو شادییە زۆرەی کە بەهۆیەوە پێشوازی لەم لاشەیە کرا بەڵگەیە بۆ ڕوودانی شتێکی لەمجۆرە.

## 13ی تەمموز

لەبەیانیدا بەهۆی خراپیی باری کەش‌وهەواوە لەتەپۆلکەیەکی ئێجگار سەخت‌وخز دابەزاینە خوارەوە..لەکاتژمێر یانزەونیودا چاومان بەمیگیل کەوت. پێشان کامباوپاچۆم ناردبوو بۆ پشکنینی رێیەك کە لەرێگای تەنیشت رێرەوی جۆگەکە لادەدات‌و لەپاش کاتژمێرێك گەڕانەوەو وتیان کێڵگەگەل‌و خانووگەلمان بینیوەوخانوویەکی‌جێهێڵراویشمان دۆزیوەتەوە. رووەو رێگا تازەکە گواستمانەوەو دوای ئەوەی شوێن رێرەوی جۆگەیەکی بچوك کەوتین گەیشتینە خانوویەکی تەنیاو شەومان تیادا کردەوە. دواتر کابرای خاوەن ماڵ هات‌و وتی ژنێك(دایکی موختاری ناوچەکە)بینیونی‌و لای ئەو سەربازانە خەبەری لێداون کە لەگوندی فیلۆ لەدووریی ماوەی کاتژمێرێك لێرەوە دانیشتوون. بەدرێژایی شەو سەرگەرمی پاسەوانیی بووین.

## 14ی تەمموز

بەدرێژایی شەوی رابوردو بەشێنەیی باران باری‌و بەدرێژایی ئەمشەویش هەر بەردەوامبوو بەڵام لەنیوەرۆدا بڕیارماندا درێژە بەرێکردنەکە بدەین‌و بۆ ئەوەش پشتمان بەدوو رێبەر قایمکرد ئەگەرچی‌هاوسەرەکانیان هات‌وهاوارێکی زۆریان کردو ناڕازیش بوون، رێبەرەکانیش ئەمانەن: پابلۆی زاوای موختارەکەو ئۆریلیۆمانسیلیای‌خاوەنی ئەوخانووەی کە دوێنێ میواندارییی کردین. دوو رێبەرەکە پێشنیاری ئەوەیان بۆ کردین رێگای پامبا وەبەربگرین کە لەوێندەر دەتوانین رێیەکی تازە هەموارکراو تا رووباری مۆسکیرا وەبەربگرین‌و ئێمەش بەپێشنیارەکەیان قایلبووین. هەر نزیکەی500 مەترێکمان بڕی سەربازێکی گەنج‌و جوتیارێکمان بینی ئەسپێکی بارکراو بەئاردیان بەشوێن خۆیاند! کێش دەکردو نامەیەکیان بۆ

ئەفسەری پۆل لەفیلۆ پێ‌بوو کە لەلایەن هاوڕێکەیەوە لەپامبا کە لەوێندەر30 سەرباز هەن، بۆی نێردرابوو. ئەو دەمە بڕیارماندا ئاراستەمان بگۆڕین و بەکردەوە رووەو ڕێگای فلۆریدا ڕێمانکردو، دوای ئەوە بەماوەیەکی‌کەم خێوەتەکەمان هەڵدا.

لەنێو دەنگوباسەکاندا ئەم هەواڵە بڵاوکرایەوە: هەردوو پارتی شۆڕشگێڕی جوتیاران و سۆشیالیستی بۆلیڤیا لەبەرەی شۆڕش کشاونەتەوەو جوتیاران ئەمێستا هەڕەشەی ئەوە لەباریانتۆس دەکەن کە هاوپەیمانێتی لەتەك بەتالیۆنەکاندا دەبەستن.....حکومەت زوو هەرەسی دەهاورد.. ئەگەر ئەمێستا100 پیاوی دیکەمان لەتەکدا بووایە.

## 15ی تەمموز

بەهۆی نالەباریی ئەو ڕێیەوە کە چەند ساڵێکە گوزەری پیادانەکراوە، ماوەیەکی کەممان بڕی. لەسەر داوای ئۆریلیۆ مانگایەکی موختارەکەمان سەربڕی و خواردنێکی‌خۆشمان خوارد. تینی ڕەبۆکە خەریکە کەم دەبێتەوە. باریانتۆس وتی نەخشەیەکم داناوە بۆ لەناوبردنیان لەچەند کاتژمێرێکی کەمدا:(نەخشەی سنتیا).

## 16ی تەمموز

ئەمرۆکە، بەهۆی سەختیی ڕێگاکەو ئەو کۆششەی کە هەمواركردنی ویستی، زۆر بەخاویی هەنگاومان هەڵگرت. ولاخەکان زۆر ماندوبوون بەلام دواجار لەتەك خۆرئاوابووندا گەیشتینە دۆڵێکی تەنگەبەرو ئەسپەکانمان ناتوانن بەبارەکانیانەوە پیایدا گوزەربکەن. میگیل لەتەك چوار لەپیاوەکانیدا درێژەیدا بەرێکردن و بەجیا لەئێمە لێی‌نووستن.

ئێستگەکە هەواڵێکی وای پەخش نەکرد کە شایانی باس بێت. ئەمێستا چووینەتە بەرزایی 1600مەتر لەنزیك(دۆران)ەوە کە هەنوکە کەوتووەتە لای باکورمانەوە.

## 17ی تەمموز

ڕێگاکەمان بزرکردو بەخاویی درێژەماندا بەرێکردنەکەو ئومێدمان وا بوو بەبێستانێك رابگەین کە پڕ لەدرەختی پرتەقاڵەو..کە ڕێبەرەکەمان باسی‌کرد بەڵام سەروەختێك گەیشتینە شوێنەکە دارو درەختی وشکمان چاوپێکەوت. خێوەتەکەمان لەدەوری سەرچاوەیەکی بچوکی ئاودا هەڵداو بەکردەوە تەنها ماوەی سێ‌کاتژمێر ڕێمانکرد. دوای ئەوەی زۆربەی نیشانەکانی رەبۆ لەناوچوون‌ونەمان، تەندروستیم زۆر باش بوو..پێویستە ئەو ڕێیە بدۆزینەوە کە پێشان بۆ راگەیشتن بەبیرای پیایدا گوزەرمان کردبوو. هەنوکە ئەوەتاین لەتەنیشت(دۆران)ەوە.

بەرزایی:1560 مەتر.

## 18ی تەمموز

لەدوای چەند کاتژمێرێك لەرێکردن، ڕێبەرەکە شوێنەواری ڕێگاکەی بزرکردو وتی لێم تێکچووە، دواجار رەوتێکی کۆنمان دۆزییەوەو ئەوەش میگیلی ناچارکرد بیپشکنێت، دوای ئەوەی ڕێرەوێکی بۆخۆی کردەوەو لەکۆتاییدا گەیشتە خاڵی بەیەکگەیشتنی لەتەك ڕێگای بیرای‌دا. سەروەختێك بەمەبەستی هەڵدانی خێوەت گەیشتینە جۆگەیەکی بچوك هەرسێ جوتیارەکەو سەربازە لاوەکەمان، هەڵبەت لەدوای وریاکردنەوەیان، ئازادکرد. کۆکۆ لەتەك پابلیتۆوپاچۆدا بەرەو حەشارگەکە دەرچوون بەو ئومێدەی کە پۆلینۆ شتگەلی پێویستی لەو جێیەدا شاردبێتەوە. سبەی

ئێـواره دەگەڕێنـەوه ئەگـەر كاروبارەكـان بـەو جـۆره رێبكـەن كـە ئێمـە دەمانەوێت. سەربازە لاوەكە وتی واز لەسوپا دەهێنم.
بەرزایی:1300 مەتر.

## 19ی تەمموز

گەشتێكی كورتمـان بـەرەو خێوەتگـە كۆنەكـەمان ئەنجامـداو دوای ئـەوەی پاڵپشتیی پاسەوانیمان كرد لەوێندەر لەچاوەڕوانیی كۆكۆدا ماینەوە. دواتر لەكاتـژمێر شەشـدا هـاتو وتـی نـە هیچـم دۆزیوەتـەوەو نـە شـوێنەواری پۆلینۆشم بەدیكردووەو تفەنگەكەش تائێستا هەر لەشوێنی خۆیدا ماوە. بەپێچـەوانەی ئەوەشـەوە شـوێنەوارگەلی سـەربازانی دۆزییـەوە كـە لـەو ناوچەیەوە تێپەڕبوون، هەروەها لەبەشێك لەو رێیەشدا كە ئەمێستا ئێمەی لەسەرین، شوێنەواریانی بەدیكردبوو.
هەواڵە سیاسییەكان هێما بۆ بەرپابوونی قەیرانێكی توند لەوڵاتدا دەكەن كە كـەس نازانێـت بـەرەو كـوێ هـەنگاو هەڵـدەگرێت. لـەكاتی ئێسـتادا سەندیكاكانی جوتیاران لەكۆشاپمبا پارتێكی سیاسی (خاوەن ئاقارێكی مەسـیحیی)یـان بـۆ پشـتگیری باریـانتۆس پێكهێنـاوەو باریـانتۆس داوایكـردووه بـواری پێبـدرێت(مـاوەی چـوار سـاڵ فـەرمانڕەوایی وڵات بكـات)..ئـەم داوایـەی وەكـی جۆرێـك لەپاڕانـەوه وایـە. هەرچـی سـیلیس سـالیناس‌یشـە بـەوە هەڕەشـەی لەئۆپۆزیسـیۆن كـردو وتـی هاتنـە سـەر دەسـەڵاتی جەنگاوەران سـەری هـەمووتان دەخـوات، نـاوبراو داوای یـەكێتی نیشـتیمانییو ئامـادەكردنی سـەرجەم وڵات بـۆ شـەڕ دەكـات. نـاوبراو وەكـی كەسـێكی لەلایـەك تكاكـارو لەلایـەكی دی وەكـی دیماگۆجییـەك دێتەپێشچاو...رەنگە خۆی بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات ئامادەبكات.

# 20ی تەمموز

بەوریایی رووەوخانووەکەی یەکەم رێمانکردو لەوێندەر کوڕێکی بانیاگاو زاواکەی پۆلینۆمان بینی. وتیان هیچ زانیارییەکمان سەبارەت شوێن وجێی پۆلینۆ نییەو هەموو ئەو شتەی دەیزانین ئەوەیە کە سوپا تەقەللا دەکات بۆ دۆزینەوەی چونکە لەتەك ئێوەدا کاری رێبەریی کردووە. ئەو زانیارییانەی کە کۆمانکردنەوە هێما بۆ ئەوە دەکەن گروپێك کە لە100کەس پێکهاتووە لەدوای هەفتەیەك لەرۆیشتنی ئێمە لەم ناوچەیەوە تێپەڕیوەو بەرێگاوەیە بەرەو فلۆریدا. وادیارە سوپا سێ کوژراو و دوو بریندار هەیە لەبۆسەکەدا. هاورێ لەتەك کامبا ولیۆن وجۆلیۆدا کۆکۆمان رەوانەی فلۆریدا کرد بۆ ئەوەی بزانن لەوێندەر چ باسەو هەندێك پێویستییش بکڕن. لەکاتژمێر چواردا کۆکۆ بەهەندێك ئازوخەوە هاتەوەو پیاوێکی لەتەك خۆیدا هاوردبوو ناوی میلگارەو خاوەنی دووان لەئەسپەکانی ئێمەیە، دەسبەجێ خۆی خستە پێناومان و راپۆرتێکی تێرو تەسەل و کەمێك خەیاڵیی بەردەستمان خست. لەنێو ئەو بابەتانەدا کە لەنێو راپۆرتەکەدا هاتبوو باس لەوە کرابوو لاشەکەی تۆما لەپاش چوار رۆژ لەسەفەری ئێمە دۆزراوەتەوەو سەگ وگورگ بەگاز پچڕیویانە. سوپا تەنها لەرۆژی دواتری دوای شەڕەکەو دوابەدوای گەڕانەوەی ئەفسەرەکە بەروتی و بێ جلوبەرگ، ئەوجا پێشڕەویی کردووە. هەروەها وادیارە پرۆسەکەی سۆمایباتا بەهەموو وردەکارییەکانییەوە بەناوچەکەدا بڵاوبووەتەوەو گەورەکراوەو بووەتە مایەی تەشقەڵەی جوتیارەکان. پایپەکەی تۆماو هەندێك پێویستیمان دۆزییەوە کە ئەو دەمە شاردرابوونەوە. هاوکات ئاشنای ئەفسەرێك بووین بەپلەی مێجۆر کە ناوی سوبیرنایەو وەکی کەسێکی هاوسۆز یاخود سەراسیمەی ئێمە دەرکەوت و وتی سوپاخانووەکەی کۆکای پشکنیوە کە لەوێندەر تۆما کوژراو لەوێندەرەوە بەرەو تیجیریا رۆیشتووەو دواتر رووەو فلۆریدا گەڕاوەتەوە.

کۆکۆ بیری لەوە کردەوە پەیامێك کە لامان گرنگە بەم پیاوەدا رەوانە بکات بەڵام من وام پێ باش بوو سەرەتا بەمەبەستی وریابوون تاقیبکەمەوەو بینێرم هەندێك داودەرمان بکڕێت. میلگار باسی گروپێکی بۆ کردین کە بەردەوام سەردانی ناوچەکە دەکات و لەنێو ریزەکانیدا ئافرەتێك هەیەو..وتی ئەم زانیارییەم لەرێگای نامەیەکەوە وەرگرتووە کە موختاری ریۆگراندی بۆ موختاری ئەم ناوچەیەی نووسیوە. لەبەرئەوەی موختاری ئەم ناوچەیەش لەسەر رێگای فلۆریدا نیشتەجێیە هەربۆیە ئانتی وکۆکۆ وجۆلیۆمان نارد بۆ ئەوەی قسەی لەتەکدا بکەن..ئەویش وتی هیچ هەواڵێکم دەربارەی گروپگەلی دی نییە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی جەختی لەسەر دروستیی قسەکانی میلگار کردەوە. بەهۆی بێئاوییەوە شەوێکی ئێجگار خەراپمان بەسەربرد. لەنێو دەنگوباسەکانی ئێستگەدا هەواڵی ئەوە بلاوکرایەوە کە دەسەڵاتدارانی بەرپرس لاشەی ئەو جەنگاوەرەیان ناسیوەتەوە کە کوژراوەو لاشەی موازیس گیڤارایە، بەڵام ئۆفاندۆ لەلێدوانە رۆژنامەوانییەکەیدا هۆشدارییەکی توندی دەرکردو بەرپرسیارێتی ئەم هەواڵەشی خستە ئەستۆی وەزارەتیدەرەوە. دوورنییە تەنها پڕوپاگەندەو دروستکراوی خەیاڵێك لەخەیاڵەکان بێت.

بەرزایی:680 مەتر.

## 21ی تەمموز

رۆژێکی هێمنمان بەسەربردو، دەربارەی ئەو مانگایەی کە پێی فرۆشتین لەکاتێکدا مولکی کەسێکی دیکەبوو، قسەمان لەتەك کۆکای بەساڵاچوودا کرد. وتی نرخەکەیم وەرنەگرتووە بەڵام بەتوندی نارەزاییدەربڕی و ئەوەی رەتکردەوە پێ لەوە بنێت کە مولکی کەسێکی دیکەیە، ئێمەش داوامان لێکرد نرخەکەی بداتەوە بەخاوەنە رەسەنەکەی. لەئێوارەدا بەرەو تیجیریا

دەرچــــووین و لەوێنـــــدەر بـــــەرازێك و شــــەکرلەمەمان کـــــڕی. وادیـــــارە ئـانتی وبینینیـۆوئانیسـیتۆ کـە شـتەکانیان کـڕی...پێشـوازییەکی باشـیان لێکراوە.

## 22ی تەمموز

بـــەیانیزوو دەرچـــووین و بـــارێکی گرانمـــان لەپیاوگـــەل و وڵاخ پـــێبوو و ئامانجمـان چەواشـەکردنی سـەرجەم خـەڵکی بـوو لەراسـتیی بوونمـان. ئـەو رێیـەمان بەجێهێشـت کـە بـەرەو مۆرۆکـۆ دەچـێت و رێگـای دەریاچـەکەمان بەئاراسـتەی کیلۆمـەترێك یـاخود دوو کیلۆمـەتر بـەرەو باشـوردا وەبـەرگرت. بەڵام مـەخابن پاشمـاوەی رێگاکـە بەڵەدنـەبووین هەربۆیـە ناچاربووین چـەند پیاوێك بنێرین بۆ پشکنین و...لەو ماوەیەشدا لەلای دەریاچەکە توشمان بـوو بەتوشـی مانسـیلاوبانیاگـای منداڵـەوە کـەماڵیاتـەکانیان بـەرەو لەوەڕگـەکان دەبـرد. پێشـان پێمـان وتبـوون کـە بێـدەنگ بـن بـەڵام ئەمێسـتا هـەڵوێسـتەکە گـۆڕاوە. نزیکـەی دوو کاتـژمێر رێمـانکردو لـەنزیك جۆگـەیـەکی بچـوکەوە کـە ئەم دوو لقەی لێدەبێتەوە نووستین: یەکەمیان بەرەو باشوری خۆرهەڵات..کە بەتەنیشـت رووبارەکەوەیـەو. دووەمـیش رووەو باشـورو پێناچـێت وەکـی یەکەم رۆشن بێت.

لەنێودەنگوباسـەکانی ئێسـتگەدا هـەواڵی ئـەوە بڵاوکرایـەوە هاوسـەرەکەی بۆستۆس(بیلاو)جـەخت لـەوە دەکاتـەوە کـە منـی لێرە بینیـوە بـەڵام دەڵێـت بەمەبەستی دیکەی جگە لەشوێن پێهەڵگرتنی ئەو هاتووم.

بەرزایی:640 مەتر.

## 23ی تەمموز

ئێمە لەخێوەتەکەدا ماینـەوەو دووان لـەپیاوەکانمان بۆ پشـکنینی دوو رێگـا چـاوەڕوانکراوەکە دەرچـوون. رێگـای یەکـەمیان بـەرەو ریۆسـیکۆو رووەو

شوێنێك دەچێت كە ئاوی بیرای لەوێندەر كۆتاییدێت كە لەوێندەریش هێشتا لمو خۆڵ هەڵینامژێت..واتە بەرەو ناوچەیەك كە دەكەوێتە نێوان فلۆریداو ئەو بۆسەیەوە كە نامانەوە..رێگای دووەمیش بەرەو كوختێكی جێهێڵراو لەدوریی دوو كاتژمێر یاخود سێ‌كاتژمێر رێكردن لێرەوە دەڕوات و دەتوانرێت لەرێگایەوە رووەو رۆزیتا هەنگاو هەڵبگیرێت(ئەمە بەوتەی میگیل)، سبەینێ ئەم رێیە وەبەردەگرین، رەنگە یەكێك بێت لەو رێگایانەی كە میلگار بۆ كۆكۆوجۆلیۆی باسكرد.

## 24ی تەمموز

ماوەی نزیكەی سێ‌كاتژمێر لەسەر رێگای پشكنراوی سەر بەرزایی940مەتر رێمانكردو، خێوەتەكەمان لەنزیك جۆگە ئاوێكەوە هەڵدا. هەموو رێگاكان لێرەدا رادەوەستن و پێویستە رۆژی سبەینێ بۆ سۆراخی باشترین دەروازە بۆ دەرچوونمان تەرخانبكرێت. لەوێندەر چەند كێڵگەیەكی چڕ هەن و ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە كە وابەستەی فلۆریدان و..رەنگە ئەم شوێنە ئەو جێیە بێت كە پێیدەوترێت: كانالۆنیس. هەوڵدەدەین كۆدی نامەیەكی دوورودرێژ بكەینەوە كە لەمانێلاوە بەدەستمان راگەیشتووە.

رائول باسی لەدەرچوونی پۆلێك لەئەفسەر لەقوتابخانەی ماكسیمۆمیز كردو هەروەها بەرپەرچی لێدوانەكانی چیكییەكانی دایەوە سەبارەت وتارەكەی من لەمەڕ(چەند ڤێتنامێك). دۆستان بەباكۆنین(29)ی نوێ ناوم دەبەن و شیوەن بۆ خوێنی رژێنراوو ئەو خوێنە دەكەن كە لەبارێكدا ئەگەر سێ یاخود چوار بەرەی وەكی ڤێتنام هەبێت دەرژێندرێت.

## 25ی تەمموز

ئەمرۆكە پشوماندا و سێ دەستە كە هەریەكەیان لەدوو پیاو پێكهاتووە ناردمانن بۆ پشكنینی ناوچەكە. هەریەك لەكۆكۆوبینینیۆومیگیل ئەركی جێبەجێكردنی ئەم كارەیان پێسپێردرا. كۆكۆوبینینیۆ هەر بەهەمان جێگە راگەیشتن، پێدەچێت بتوانین لەوێندەرەوە رێگای مۆرۆكۆ وەبەربگرین. میگیل وتی لەوە دڵنیام كە جۆگەكە بەرەو رۆزیتا دەچێتو دەتوانین بەتەنیشتیدا رێبكەین ئەگەرچی ناچاردەبین كە جاروبار هەمواریشی بكەین.

ئێستگەكە هێمای بۆ ئەم دوو پرۆسە نوێیە كرد: یەكەمیان لەتاپیراسو دووەمیان لەسان جوان دیل بۆتریرۆ..دژوارە هەمان گروپ بتوانێت ئەم دوو پرۆسەیە ئەنجامبدات..ئەو پرسیارەی كە لێرەشدا دێتەپێشەوە، ئەمەیە: ئایا ئەم گروپە بوونی هەیە یان رووداوەكان ناراستن؟

ئێستگە بیانییەكان بەدوورودرێژی باسیان لەهەواڵی پرۆسەكەی سان جوان دیل بۆتریرۆ كردو ژمارەیەك وردەكارییان بڵاوكردەوە: دیلكردنی15سەربازو ئەفسەرێك بەپلەی كۆلۆنێل كە لەدوای داماڵینیان لەجلوبەرگەكانیان ئازادكران: ئەمە هەر هەمان تەكنیكەكەی ئێمەیە. شوێنەكەش لە بەرەكەی دی رێگای قیرتاوی كۆشاپمبا ـ سانتاكروزە.

لەئێوارەدا كورتە لێكچەرێكم دەربارەی واتای بیستوشەشی تەمموز پێشكەشكرد..لەمەڕ شۆرش دژ بەحكومەتە ستەمگەرەكانو ئایدیۆلۆجیا شۆڕشگێرییە دۆگماكان. فیدڵ لەگوتارەكەیدا هێمایەكی راگوزارانەی بۆ بۆلیڤیا كرد.

## 27ی تەمموز

هەموو شتێك سازوئامادەبوو بۆ سەفەركردنو پێشان پیاوانی بۆسەكەش فەرمانی ئەوەیان پێدرابوو لەكاتژمێر یانزەدا بەشێوازێكی میكانیكیانە

بکشێنەوە کاتێك ویلی پێش ئەو کارە هات و ئەوەی پێراگەیاندین کە سوپا لەوێندەرە. خودی ویلی خۆی و هەروەها ریکاردۆوئانتی و لیۆن وئۆستاکیۆ چوون بۆ زانینی شوێنی دوژمن و پاشان بەهاوبەشی لەتەك ئانتۆنیۆوئارتۆرۆو شاباکۆدا پلانی پرۆسەکەیان جێبەجێکرد. پرۆسەکە بەمجۆرە بەرێوەچوو: هەشت سەرباز لەسەر لوتکەکە دەرکەوتن و بەرەو باشورو بەسەر رەوتێکی بچوك وکۆندا بەرێکەوتن و پاشان دەستیانکردەوە بەرێکردن وچەند گوللەیەکیان بەتۆپی مۆرتەرەکە تەقاندو بەهۆی پارچە قوماشێکەوە هەندێك ئاماژەیان کرد. ناوی میلگار بیسترا کە هەندێك جار دووبارە دەکرایەوە، رەنگە ناوبراو ئەو کەسە بێت کە لەفلۆریدا ئاشنای بووین. لەپاش کەمێك وچان هەشت سەربازەکە بەرەو بۆسەکە پێشرەوییانکردو دەسبەجێ چواریان پێکران چونکە ئەوانی دی کەمێك دوربوون. لەکوژرانی سیانیان دڵنیابووین و هەرچی چوارەمیشە نەکوژرابوو و بەهەرحاڵ زامدارە..بێئەوەی لەچەکەکانیان یاخود کەلوپەلەکانیان دایانبماڵین، چونکە ئەو کارەمان بەلاوە دژواربوو و هەندێك مەترسی تیادابوو، لەوێندەر کشاینەوەو رووەو لای خواروی جۆگەکە رۆیشتین و گەیشتینە دۆڵێکی بچوکی دیکەو لەوێندەر بۆسەیەکی ترمان دانا.
ئەسپەکان تا ئەو جێیە پێشرەوییان کرد کە لەوێندەر رێگاکان دوایی دێن.
ئێش وئازارەکانی رەبۆم توش بووەوەو تەنها برێکی زۆر کەم لەهێورکەرەوەم پێماوە.
بەرزایی:800 مەتر.

## 28ی تەمموز

کۆکۆوپاچۆورائول وئانیسیتۆم نارد بۆ پشکنینی سەرچاوەی ئەو رووبارە کە وا باوەڕ دەکرێت رووباری سۆسیێرۆیە. بەدەم برینی رێگاکەمانەوە بەنێو

دۆڵێکــی تەنگەبــەردا کــەمێك ڕێمــانکرد. خێوەتەکــەمان دوور لــەپیاوانی پێشڕەو هەڵدا چونکە میگیل لەو ئەسپانە زۆر دوورکەوتبووەوە کە قاچیان لەسەر لم دانابوو و ڕێکردن لەسەر بەردوچەویان بەلاوە دژواربوو.
بەرزایی:760 مەتر.

## 29ی تەمموز

بەنێو دۆڵێکدا کە ڕووەو باشور لێژدەبێتەوەو بەبەری ئەمبەرو ئەوبەرییەوەو لەناوچــەیەکی پــڕ لــەئاودا حەشــارگەی گونجــاوی تیادایــە، درێژەمانــدا بەرێکردنەکــە. لەدەوروبــەری کاتــژمێر چــواردا توشمــان بــوو بەتوشــی پــابلیتۆوەو وتــی ئەمێســتا گەیشــتوینەتە نزیــك سەرچــاوەی سۆســیپرۆو کاروبارەکان سروشتیین و هیچ ڕووداوێکی تازە نییە. لەسەرەتادا پێم وا بوو ئەم دۆڵە دۆڵی سۆسیپرۆ نییە چونکە بەردەوام ڕووەو باشور دەچێت..بەڵام لەدوایین چەمانەوەدا پێچی کردەوەو ڕووەو خۆرئاوا ڕۆیشت کە لەوێنـدەر دەرژێتـە نێـو ڕۆزیتـاوە. پیـاوانی دواوە لەدەوروبـەری کاتـژمێر چـوارونیودا گەیشــتن و ئــەو دەمــە بڕیارمــدا درێــژە بەرێکردنەکــە بــدەین و تــادەتوانین لەسەرچاوەی ڕووبارەکە دوربکەوینەوە بەڵام دڵم نەهات هاوڕێیان ناچاربکەم تەقەللایــەکی زیــاتر بکــەن و لەکێڵگەکــەی پۆلینــۆ تێپــەڕین، هەربۆیــە خێوەتەکەمان لەگوێ ڕێگاو لەدوریی کاتژمێرێك لەسەرچاوەی سۆسـیپرۆوە هەڵــدا. لــەئێوارەدا بــواری قســەکردن بــەچــینۆ درا تــاوەکو دەربــارەی سەربەخۆیی وڵاتەکەی لەبیست وهەشتی تەممورزدا بدوێت، دواتـر پێم وتـن شـوێنی خێوەتەکە لەبارنییــە و هۆکارەکانیشــم بــۆ ڕوونکردنــەوەو فــەرمانم دەرکـرد لەکاتـژمێر پێنجی بەیانیـدا هەڵبستن و ڕووەوکێڵگەکـەی پۆلینۆ بـۆ داگیرکردنی بەرێ بکەون.

لــەنێو هەواڵــەکانی ئێســتگەی کوبــادا دەنگوباســی ئــەوە بڵاوکرایــەوە کــە بۆســـەیەك بــۆ ســـوپا دانـــدراوەو هەنـــدێك لەســـەربازەکانی کـــوژراون و

بەهیلیکۆپتـــەر لەناوچـــەکە گواســـتراونەتەوە..بـــەهۆی تونـــدیی ئـــەو هانیهانییەوە کە لەسەر ئێستگەکە بوو هیچی زیاترم گوێ لێنەبوو.

## 30ی تەمموز

ئێش‌وئازاری رەبۆ زۆریان بۆ هاوردمو بەدرێـژایی شـەو چاوم نەچووە خـەو و، ســەروەختێکیش مــۆرۆ لەکاتژمێرچـوارونیودا بــۆ ئامــادەکردنی قــاوە هەستا، ئاگری چرایەکی بینی لای رووبارەکەوە دەدرەوشـایەوە. میگیـل کـە بـــۆ نـــۆرەی چـــاودێرییەکەی بێـــداربووبووەوە بەهاوڕێیـــەتیمـــۆرۆ بـــۆ دەستبەســـەرکردنی پێشـــڕەوان دەرچـــوو. لەچێشـــتخانەکەوە گـــوێم لـــەم گفتوگۆیە بوو:

ـ ئەوە کێیە؟

ـ پەلی ترینیداد.

دەسـبەجێ تەقـە دەسـتیپێکرد. میگیـل لـەپاش ماوەیـەکی کـەم گەڕایـەوەو تفـەنگێکی جـۆری م ـ 1و هەگبەیـەکی پـڕ لەگوللـەی سـەربازێکی زامـداری پێبـوو و پێیـوتین21 پیـاو هـەن رووەو ئابـابۆ دەچـنو ژمـارەی سـەربازان لـەمۆرۆکـۆخـۆی دەدات لـە150پیـاو. چـەند زیـانێکی دیکـەشمان بەسـوپا گەیانـد کـە لەنێوەنـدی ئـەو بـارگرژیو پاشـاگەردانییەدا کـە باڵادەسـت بـوو نـەمانتوانی بەباشـی بیـانبینین. بـۆ بـارکردنی ئەسـپەکان ماوەیـەکی زۆرمـان پێچـوو و نیگـرۆش بـەو تـەورو تـۆپی مۆرتـەرەوە کـە لەسـەربازانی دوژمنـی دەسـتگیرکردبوو رێگـای لێ بزربـوو. کاتـژمێر خـەریکبوودەبووە شـەش‌و.. دەبـــوو رێکردنەکـــە دەســـتپێبکەین کاتێـــك کـــە بـــاری هەنـــدێك ئەســـپ کەوتنەخوارەوەو بەوهۆیەشەوە کـاتێکی بـەنرخمان لـەکیس چـوو و تەنانـەت لـــەدوایین رێرەوەکانیشـــدا لەلایـــەن دوژمنـــەوە بەگـــەرمیی تەقـــەمان لێکـــرا. خوشکەکەی پۆلینـۆمـان لەخانووەکـەدا دۆزییـەوەو زۆر بـەهێمنیی پێشوازی

لێکردین و وتی: سەرجەم پیاوەکانی مۆرۆکۆ دەستگیرکراون و ئەمێستا هەموویان ئەوەتان لەلاپاز.

داوام لەپیاوەکان کرد پەلەبکەن و لەتەك پۆمبۆدا وجارێکی دی لەژێر بارانی گوللەدا بەرەو دۆڵی رووبارەکە دەرچووینە دەرەوە کە لەوێندەر رێگاکە رادەوەستێت و دەتوانرێت بەرگری رێکبخرێت. میگیل وکۆکۆ وجۆلیۆم نارد بۆ داگیرکردنی پێگەکانی پێشەوەوخۆشم ئەسپەکانم کێشکرد. بۆ تەواوکردنی کشانەوەکە حەوت پیاوم لەپیاوانی پێشڕەو و4 لەبەشی دواوەو هەروەها ریکاردۆشم ماوە کە بۆ پاڵپشتیی بەرگری لەدواوەدا مایەوە. بینینیۆ لەبەری لای راستدا چووە پێگەوەوداریۆ وپابلۆ وکامبای لەتەکدابوو، هەرچی ئەوانی دیکەشە لەبەری لای چەپدا چوونە پێگەکانیانەوە. پێشان فەرمانم دەرکردبوو لەیەکەمین شوێنی گونجاودا رابووەستین کاتێك کە کامبا هات و وتی ریکاردۆ وئانیسیتۆ لەکاتی پەڕینەوەیاندا لەرووبارەکە پێکراون. ئۆربانۆ و ناتۆولیۆنم لەتەك دوو ئەسپدا رەوانەکردو ناردم بەشوێن میگیل وجۆلیۆدا وکۆکۆشم بۆ پاسەوانیی پێشەوە بەجێهێشت. میگیل وجۆلیۆ بەبێ رێنمایی پێشوەختە لەرووبارەکە پەڕیبونەوەو کامبا پاش کەمێك هاتەوەو وتی لەتەك میگیل وجۆلیۆدا توشمان بووە بەتوشی سەربازانەوە کە زۆریان پێشڕەویی کردووەو میگیل کشاوەتەوە دواوەو چاوەڕوانی رێنماییە. کامبام هاوڕێ لەتەك ئۆستاکیۆدا رەوانەکردومن وئانتی وپۆمبۆ وچینۆ ماینەوە. لەکاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆدا ناردم بەشوێن میگیل دا وجۆلیۆم بۆ پاسەوانیی بەجێهێشت و لەتەك گرووپی پیاوان و ئەسپەکاندا کشامەوە. کاتێك کە گەیشتینە ئەو جێیە کە کۆکۆ تیایدا پاسەوانیی دەکات هەواڵی ئەوەمانزانی کە سەرجەم رزگاربووان دەرکەوتون و رائول کوژراوەو ریکاردۆ وپاچۆ پێکراون.

کاروبارەکانیش بەمجۆرە بەرێوەچوون: ریکاردۆ وئانیسیتۆ بەبێ هیچ

وریاییەك و بەشێوەیەكی ئاشكرا لەرووبارەكە پەڕیونەتەوە، ئیدی یەكەمیان زامداربووە. ئارتۆرۆ و ئانیسیتۆوپاچۆ بۆ گواستنەوەی دەرچوون و ئانتۆنیۆش بەهۆی تەقەكردنی زۆرەوە چەترێكی بۆ دەرچوون بۆ دروستكردون. بەڵام پاچۆ زامداربووە ورائول یش گوللەیەكی كوشندە دەمی پێكاوە. پرۆسەی كشانەوەكە بەدژواریی ئەنجامدراوەو دوو برینداریان بەشوێن خۆیاندا كێش كردووە. ویلی و بەتایبەت شاباكۆ(30)هیچ یارمەتییەكی نەداون. دواتر ئۆربانۆو پیاوانی گروپەكەی لەتەك ئەسپەكانداو هەروەها بینینیۆو پیاوەكانی بەشێوەیەك شوێنیان كەوتون كە بەرەكەی دیكە چۆڵ بووەو ئەمەش دەرفەتی ئەوەی بۆ سەربازەكان رەخساندووە كە پێشڕەویی بكەن و بدەن بەسەر میگیلدا. پیاوەكانمان لەدوای رێكردنێكی تاقەتپروكێن و بەنێو دڕك ودالّ و گژوگیادا گەیشتنەجێ و پەیوەندییان پێوەكردین. هەرچی پاچۆشە بەسواری ئەسپ هات و ریكاردۆ نەیتوانی لەتەكیدا بێت هەربۆیە پیاوەكان ناچاربوون بەدەستەبەرەیەك بیگوازنەوە. میگیل و پابلیتۆوداریۆوكۆكۆوئانیسیتۆم نارد بۆ داگیركردنی سەرچاوەی جۆگەی یەكەم لەبەری لای راست و ئێمەش چووین بەلای فریاكەوتنی زامدارەكانەوە. پاچۆ لەچەند شوێنێكەوە بەسوكی زامداربوبووچونكە گوللە هەردوو ران و پێستی گونی بڕیبوو. هەرچی ریكاردۆشە لەچەند جێیەكەوە بەسەختی پێكرابوو و ئەو پلازمایەی كە پێمان مابوو بەهۆی بزربوونی هەگبەكەی ویلی یەوە لەكیسمانچوو. ریكاردۆ لەكاتژمێر دەدا گیانی لەدەستداو لەنزیك رووبارەكەو لەشوێنێكی دوور لەچاو بۆ ئەوەی سەربازەكان نەیدۆزنەوە، كردمان بەژێر خاكەوە.

## 31ی تەمموز

لەكاتژمێر چواردا بەگوێ رووبارەكەدا رێمانكردو دوای ئەوەی رێگایەكی كورتكراوەمان بڕی بەرەو لای خوارو لێژبووینەوە بێئەوەی هیچ

شوێنەوارێك لەپاش خۆمانەوە جێبهێڵین. لەبەیانیدا گەیشتینە جۆگەكە كە میگیل لەوێندەر بۆسەكەی دانابوو. وادیارە لەو رێنماییانە كە پێی دراون حاڵیی نەبووەو هەندێك شوێنەواری لەپاش خۆیەوە جێهێشتووە. نزیكەی چوار كیلۆمەترمان بەئاراستەی لای سەروی رووبارەكەدا بڕی و دوای ئەوەی شوێنەوارمان نەهێشت چووینە نێو دارستانەكانەوەو دواتر خێوەتەكەمان لەنزیك زێیەكی جۆگەكەوە هەڵدا. لەئێوارەدا چەوتییەكانی پرۆسەكەم شیكردەوە:

1)خێوەتەكە لەجێیەكی نالەباردابوو. 2)كاتمان بەخراپیی بەكارهێناو ئەمەش دەرفەتی ئەوەی بۆ ئەوان رەخساند كە تەقەمان لێبكەن. 3)متمانە بەخۆكردنی زۆر بووە هۆی زامداربوونی ریكاردۆو هەروەها رائول كە چوو بەهانایەوە. 4)بڕیارنەدان دەربارەی فریاكەوتنی سەرجەم شتەكان، كارێك كە بووە هۆی لەكیس چوونی 11 كیس و داودەرمان ودووربین وهەندێك شتگەلی دیكە كە سەرنجراكێشن، لەنموونەی ئەو تەسجیلە كە لەنێو كاسێتەكانیدا نامەگەل بۆ مانێلا هەیە، هەروەها كتێبەكەی دۆبرێ كە بەدەستخەتی خۆم سەرنجم تیایدا تۆماركردووە لەتەك كتێبێكی ترۆتسكیدا..نامەوێت باس لەو بایەخە سیاسییەش بكەم كە حكومەت بەم دەستكەوتەی دەدات وئەو متمانەیەی كە سەربازان لەم شەڕەوە بەخۆیانی پەیدادەكەن. مەزەندەی ئەوەمان كرد كە زیانی ئەوان بریتییە لەدوو كوژراو و پێنج زامدار بەڵام گێڕانەوە جۆربەجۆرەكان ژمارەگەلی دی بەردەستدەخەن، بۆ نموونە گێڕانەوەی سوپا كە باس لەچوار كوژراو و چوار بریندار دەكات كە لەبەرواری بیست وهەشتی ئەم مانگەدا كەوتونەتەوە..بەڵام گێڕانەوەیەكی دی لەچیللییەوە باس لەشەش كوژراو و سێ بریندار دەكات كە لەبەرواری سیمانگدا كەوتونەتەوە. هەروەها سوپا راگەیاندنێكی دیكەی بڵاوكردەوەو

تیایـدا دەڵێـت: هێزەکانمـان لاشـەی پیاوێـك لـەپیاوەکانیانی دۆزیوەتـەوەو ئەمێستا ئەفسەرێك لەئەفسەرەکانمان لەمەترسی دورکەوتووەتەوە.
لـەبارەی رائـولەوە نـاتوانم هـیچ بڵـێم چـونکە کەسـێکی داخراوبـوو و ئەندامێکی جەنگاوەر یاخود چالاك نەبوو لەکارەکەیدا بەڵام وادیارە هەمیشە خـەریکی گرنگیـدان بـوو بەگیروگرفتـە سیاسـییەکان ئەگەرچـی هـەرگیز پرسیاریشـی نـەدەکرد. هەرچـی ریکـاردۆیـە لەسـەرجەم کوبایـیـەکان زیـاتر لەدیسـپلینەوە دوربـوو لەهەمووشـیان کـەم توانـاتربوو دەربـارەی بڕیـاردانی گونجاو لەژیانی رۆژانەماندا..بەڵام جەنگاوەرێکی سەرسوڕهێنو هاورێیەکی دێرین بوو لەتەکمدا سەرکێشیی ژیـانی لـەماوەی شکسـتی سـەرەتا لەبـەرەی دووەم لـەکۆنگـۆو لێـرە گـوزەران کـرد. گیانلەدەسـتدانی ئـەو بـەهۆی ئـەو تایبەتمەندییانەیەوە کە هەیبوو زیانێکی گەورەی دیکەیە..
ئەمێستا بووینەتە22پیاو لەنێوماندا ئەم دوو زامدارە هەیە: پاچۆوپۆمبۆ، هەرچی خودی خۆیشمە نەخۆشیی رەبۆ خەریکە پەکی جوڵەکردنم دەخات.

## لێکدانەوەی مانگانە

تائێسـتا خاڵـە نێگەتیڤـەکانی مـانگی رابـوردو هـەر وەکـی خۆیـان مـاون، هەڵبـەت مەبەسـتم لـەو خاڵانـەش ئەمانەیـە: دژواریـی پەیوەنـدیکردن بـــەجواکینو دەرەوەڕاو لەکیسچـــوونی ژمارەیـــەك پیـــاو، ئەمێســتا22جـەنگاوەرین لەنێویانـدا سـێ کەنـەفتو بێتوانـا هـەن(مـن یەکێکیانم)ئەمـەش توانـای جوڵـەکردنمان سسـت دەکات. سێجار لەتـەك سوپادا روبەروبوینەتەوە لەنێویاندا دەستگرتن بەسەر سۆمایباتا هەیە کە بـووە هـۆی کـوژرانی حـەوت سـەربازو زامـداربوونی دە سـەربازی دی، ئـەم

ژمارانەش لەبەر دڕدۆنگیی ڕاگەیاندنەکان ژمارەگەلی مەزەندەیین. هەرچی سەبارەت خۆیشمانە دوو پیاومان لەدەستداو یەکێکیشمان برینداربوو: ئەمانەی خوارەوەش گرنگترین تایبەتمەندییەکانن:

1)پچڕانی پەیوەندی بەشێوەیەکی بەردەوام و پچڕانێکی تەواو.

2)نەبوونی خۆبەخش لەریزی جوتیاراندا ئەگەرچی هەندێك نیشانەگەلی هاندەر لەناوچەکەدا دەرکەوتووە وەکی ئەو پێشوازییە گەرمەی کە لەلایەن جوتیارە ناسراوەکانەوە پێشوازیمان لێدەکرێت.

3)ئەفسانەی جەنگیپارتیزانیی ڕەهەندگەلێك لەسەر ئاستی کیشوەرەکە بەخۆوە دەگرێت: بۆ نموونە ئۆنجانیا(31) سنور دادەخات و پیرۆش ڕێوشوێنی توند وەبەردەگرێت.

4)هەوڵی پەیوەندیکردن لەرێگای پۆلینۆوە دوچاری شکست بوو.

5)ورەگەل و ئەزمونگەلی خەباتی جەنگاوەران لەدوای هەر شەڕو پێکدادانێك بەرزترو زیاتر دەبێت بەڵام کامبا وشاکۆ هێشتا لاوازن.

6)سوپا هێشتا هەر لەسەر چەوتییەکانی بەردەوامە بەڵام چەند یەکەیەکی هەن خاوەنی گیانێکی بەرزی شەڕکردنن.

7)قەیرانی سیاسی لەنێوەندی حکومەتدا ڕوو لەتوندیی دەکات بەڵام ویلایەتە یەکگرتووەکان قەرزگەلی پچوکی پێدەدات کە لەراستیدا یارمەتییەکی گەورەن بۆ بۆلیڤیا و زەمینە بۆ هێورکردنەوەی نارەزایی توندی میللی دەرەخسێنێت.

ئەرکە بەپەلەودەستوبردەکانی قۆناغیداهاتوو ئەمانەن: پەیوەندیگرتنەوەوخڕکردنەوەی جەنگاوەرگەلی تازەو پەیداکردنی داودەرمانی پێویست.

## 1ی ئاب1967

ڕۆژێکی ئارامە. میگیل وکامیبا بۆ هەموارکردنی ڕێگاکە دەرچوون و بەهۆی سەختیی خاکەکەو چڕیی گژوگیا وڕووەکەوە تەنها کیلۆمەتریکیان لێدا. گوێدرێژێکی کێویمان کوشت و بڕیاردرا گۆشتەکەی بەسەر پێنج یاخود شەش ڕۆژدا دابەش بکرێت، هەروەها بۆ دانانی بۆسەیەك بۆ سوپاش ئەگەر لەم لایەوە پێشڕەویی‌کرد، خەنکگەلمان هەڵکەند. نەخشەکە بەو جۆرەیە کە ئاسانکاری بۆ تێپەڕبونی بکرێت ئەگەر سبەی یاخود دوو سبەی هات وخێوەتەکەی نەدۆزییەوە، ئینجا ئێمە دەست دەکەینە گوللەبارانکردنی.

بەرزایی:650 مەتر.

## 2ی ئاب

وادیارە زۆربەی ڕێگاکە بەهۆی تەقەللاکانی بینینیۆ وپابلۆوە هەموارکراوەو، مەودای نێوان خێوەتەکەو ئەوشوێنە کە پێیراگەیشتین لەماوەی نزیکەی دوو کاتژمێردا بڕییان. لەوەتەی دەرچوونی ڕاگەیاندنە سەربازییەکەوە سەبارەت گواستنەوەی لاشەیەکی(دوژمنی کۆمەڵگا) ئێستگەکان باسیان لەهەواڵ و دەنگوباسمان نەکردووە. ئێش وئازاری ڕەبۆ شەکەتی کردوم و دواین هێورکەرەوەم بەکارهێنا و تەنها چەند دەنکەحەپێکم پێماوە ئەویش بەشی تەنها دە ڕۆژ دەکات.

## 3ی ئاب

دەرکەوت کە ڕێگاکە زۆر خراپەو میگیل وئۆربانۆ لەم ڕۆژەدا 57 دەقیقەیان بۆ گەڕانەوە بەرەو خێوەتەکە پێچوو. پێشڕەویکردن ئێجگار خاوە. هیچ

هەواڵێكی تازە نییە. پاچۆخەریكە چاك دەبێتەوەومنیش تەندروستیم خراپتر دەبێت: رۆژوشەوی دوێنێ ئێش وئازارێكی زۆرم هەبوو. لەهەمووی دژوارتر ئەوەیە كە هیچ دەروازەیەك بۆ دەرچوون لەم قەیرانە شك نابەم ودەرزی نۆڤۆكاییینم بەدەمار بەكارهێنا وهیچ ئەنجامێكی نەبوو.

## 4ی ئاب

پیاوەكان گەیشتنە دۆڵێكی تەنگەبەر رووەو باشووریخۆرئاوا دەچێت و وا بڕوا دەكرێت بەرەو ئەو جۆگانە بڕوات كە دەرژێنە نێو ریۆگراندیەوە. بڕیاردرا سبەینێ چوار پیاو بەدوو جار بچن بۆ هەمواركردنی رێگاكەو لەولاشەوە میگیل خەریكی سەركەوتن دەبێت بەسەر بەرزاییەكدا كە لەتەنیشتمانەوەیە، بۆ ئەوەی هەندێك لەو خاڵە دوورانە بپشكنێت كە وەكی كێڵگەگەلی جێهێڵراو پێشچاودەكەون. تەندروستیم باش بووەو ئێش وئازاری رەبۆكە كەمێك هێوربووەوە.

## 5ی ئاب

بینینیۆوكامبا وئۆربانۆولیۆن بەمەبەستی پێشڕەویكردن بوونە دوو دەستە بەلام گەیشتنە جۆگەیەك كە دەرژێتە نێو رۆزیتاوەو ئەمرۆكە بەنێو كێڵگەكاندا درێژەیاندا بەپشكنینەكەیان. میگیل بەمەبەستی بەسەركردنەوەی كێڵگەكە دەرچوو و بۆی نەدۆزرایەوە. ئەمرۆكە دوایین ژەم لەگۆشتی گوێدرێژە كێوییەكەمان خواردو هەوڵدەدەین سبەینێ هەندێك ماسی راوبكەین و دوو سبەییش ولاخێكی دیكە سەردەبڕین. بڕیارماندا سبەینێ بەرەو یەكەمین خاڵی ئاو درێژە بەرێكردنەكەمان بدەین. ئێش وئازارەكانی رەبۆ بەتوندی بەرۆكی گرتمەوەو ئەگەرچی لە دابەشبوونی هاورێیانیش زۆر تورەم، هەست دەكەم ناچارم گرووپێك بنێرم

پێشــڕەوییمان بکــەن و بینینیــۆوجــۆلی خۆیــان بــۆ ئەنجامــدانی ئــەم ئەرکــە بەخشی و، پێویستە لەئامادەگیی ناتۆ دڵنیابم.

## 6ی ئاب

خێوەتەکــەمان گواســـتەوە بـــەڵام ئـــەو ســـێ کاتـــژمێرە ڕێمـــان نـــەکرد کـــە مەزەندەمان کردبوو، بەڵکو کاتژمێرێك ڕێمانکردو ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە هێشتا لەئامانجەکەمانەوە دورین. بینینیۆو ئۆربانۆوکامباولیۆن لەسەر هــەموارکردنی ڕێگاکــە بــەردەوام بــوون و لەولاشــەوە میگیــل وئانیســیتۆ بــۆ پشکنینی جۆگە تازەکە لەنزیك ئەو شوێنەوە کە تیایدا دەرژێتە ڕۆزیتاوە، دەرچــوون. ئێــوارە داهـــات و نەگەڕانـــەوە، بـــەمجۆرە مـــن وئـــانتی وشـــاباکۆ گردبوینـــەوەو کـــەمێك باســـی ئـــەم ڕۆژەمـــان کـــرد کـــە ڕێکـــەوتی یـــادی سەربەخۆبوونی بۆلیڤیایە.

بەرزایی: 720 مەتر.

## 7ی ئاب

کاتژمێر یانزە: هێشتا نەگەڕاونەتەوەو بڕوام وا بوو ڕێگایان بزرکردووە هەربۆیە فەرمانمدا بەبینینیۆ بۆ ئەوەی زۆر بەوریایی ڕووەو ئەو جێیە پێشرەویی بکات کە تیایدا ئاوی جۆگەکە دەرژێتە نێو ڕۆزیتاوەو لەوێندەرەوە هەوڵبدات ئەو ئاراستەیە بدۆزێتەوە کە وەبەریان گرتووە... ئەمە لەبارێکدا کە ئەگەر بەو ناوچەیە ڕاگەیشتبن. بەڵام(دوو سەرگەردانەکە)لەکاتژمێر یەکدا دەرکەوتن و وادیارە لەڕێگا توشیان بووە بەتوشی هەندێك ئاستەنگەوەو شەویان لەوێندەر بەسەربردووەو نەیانتوانیوە بەڕۆزیتا ڕابگەن. لەڕاستیدا لەبەرئەوەی بەهۆی دیارنەبوونیانەوە نیگەران بووم، ماوەیەکی دژوارم گوزەران کرد. شوێنی خۆمان بەجێنەهێشت بەڵام ئەو پیاوانەی کە ڕێگاکە هەمواردەکەن جۆگەیەکی دیکەیان دۆزییەوە سبەینێ بەرەو ئەوێندەر دەگوازینەوە. ئەمرۆکە ئانسیلمۆ، ئەسپە بەساڵاچووەکە، مرداربووەوەو، هەنوکە تەنها ئەسپێکمان ماوە بۆ بارهەڵگرتن. تەندروستییم باش نەبوو و دەرمانەکانیش خەریکە تەواودەبن. سبەی سەبارەت ناردنی گروپێك لەپیاوان بۆ نانکاهوازو بڕیاری خۆم دەدەم.

ئەمرۆکە نۆ مانگ بەسەر گەیشتنمان بۆ بۆلیڤیا و دەستپێکردنی جەنگیپارتیزانییدا تێپەڕی.. لەنێو ئەو شەش پیاوەی یەکەمجاردا دووانیان کوژران و دووانیان پێکران و یەکێکیش شوێن بزربووە. تەنها هەر خۆم ماوم بەدەست ئێش وئازاری توندی ڕەبۆوە گیرۆدەم و نازانم چۆن بەسەریدا زاڵبم.

## 8ی ئاب

نزیکەی کاتژمێرێك ڕێمانکرد بەڵام سەبارەت من دوو کاتژمێربوو چونکە جوانووەکە ماندوێتی شەکەتی کردبوو منیش لەساتێکی دیاریکراودا

چەقۆیەکم دا لەملی و بەسەختیی بریندارم کرد. خێوەتە تازەکەمان دوایین خێوەت دەبێت لەنزیك ئاوەوە تا بەرۆزیتا یاخود ریۆگراندی رادەگەین. ئەو پیاوانەی کە ریگا هەمواردەکەن ئەمێستا چل دەقیقە لەشوێنی ئێمەوە دوورن(3.2کیلۆمەتر). فەرمانم بۆ گروپێك کە لەهەشت پیاو پێکهاتووە بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە دەرکرد: سبەینێ بەیانی زوو دەردەچن و بەدرێژایی رۆژ رێدەکەن. بۆ رۆژی دواتر کامبا بەو هەوالانەی کە لای خڕبوونەتەوە دەگەڕێتەوەو بۆ رۆژی سێیەمیش پابلیتۆ داریۆ بەو دەنگوباسانەی کە گردیان کردووەتەوە دەگەڕێنەوە..لەولاشەوە ئەو پێنج پیاوەی کە ماون درێژە بەرێکردنیان بەرەو فارگاس دەدەن و لەوێندەرەوە کۆکۆ وئانیسیتۆش دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ئەو شتانە بگێڕنەوە کە بینیویانەو ئەو رووداوانە باس بکەن کە بەدییان کردووە. هەرچی بینینیۆ وجۆلیۆ وناتۆشە لەسەر رێکردن بەرەو نانکاهوازو بۆ هاوردنی دەرمانی پێویست بۆ من بەردەوام دەبن. داوام لەهەمووشیان کرد بەوریایی پێشرەویی بکەن بۆ ئەوەی خۆیان لەکەوتنە نێو بۆسەوە بەدوربگرن، سەبارەت ئێمەیش دواتر پەیوەندییان پێوەدەکەین و ئەم خالانەم بۆ بەیەکگەیشتن دیاریکرد: مالی فارگاس یاخود جێیەکی دوورتر ـ ئەمەش بەندە بەئاستی خێراییمانەوە ـ کە دەکەوێتە نزیك ئەو جۆگەیەی بەرامبەر ئەشکەوتەکەیە، لەسەر رووباری ریۆگراندی یاخود مازیکۆری (هۆنۆراتۆ) یاخود نانکاهوازو. هەندێك دەنگوباسمان سەبارەت جموجولەکانی سوپا پێراگەیشت و هەوالی ئەوەشمان بیست کە هەندێك سەرباز حەشارگەیەکی چەکیان لەیەکێك لەخێوەتگەکانماندا دۆزیوەتەوە. لەئێوارەدا هەموو پیاوەکانم کۆکردەوەو راستیی هەلوێستی خۆمانم بۆ شیکردنەوە. پێموتن لەهەلوێستێکی دژوارداین، پاچۆ خەریکە چاك دەبێتەوە من بوومەتە تەنها پاشەرۆکێکی مرۆیی، لەهەندێك ساتگەلدا دەسەلاتم بەسەر خۆمدا

نامێنێت‌و باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە جوانووەکەیە کە چەقۆیەکم دا لەملی..هەروەها پێموتن کاروبارەکان رەنگە یەکلایی ببنەوە بەڵام ئەرکە گران‌و مەترسییەکان سەبارەت هەمووان وەك یەکەو..ئەوانەی کە هەست دەکەن کەنەفتن‌و ناتوانن بەردەوام بن قسەبکەن. هاوکات پێموتن: هەنوکە ئێمە لەساتێکداین کە پێویستیی بەبڕیاردانی یەکلاکەرەوە هەیەو ئەم چەشنە لەخەبات دەرفەتی بوون بەشۆڕشگێرمان بۆ دەڕەخسێنێت، بەو هۆیەشەوە بەبەرزترین ئاستی رەگەزی مرۆیی رادەگەین، بەڵام هەروەها زەمینەی بوون بەپیاوگەلیشمان بۆ هەمواردەکات. هەربۆیە ئەو کەسانەی کە هەست دەکەن ناتوانن بەم دوو قۆناغە رابگەن قسەبکەن‌و دەستبەرداری خەبات‌و تێکۆشان بن. کوباییەکان هەموویان‌و هەروەها هەندێك لەبۆلیڤییەکان‌یش وتیان تاکۆتایی بەردەوام دەبین، ئۆستاکیۆش شوێن پێی ئەوانی هەڵگرت بەڵام رەخنەی لەمۆگانگا گرت کە لەجیاتی‌ئەوەی چیلکەودار باری هێسترەکە بکات کەلوپەلەکانی خۆی دەنێتە سەرپشتی، مۆگانگاش بەتوندی وەڵامی ئەم قسانەی ئۆستاکیۆی دایەوە. جۆلیۆش لەبەر هۆگەلێکی هاوشێوە رەخنەی لەمۆرۆو پاچۆ گرت کە لەلایەن پاچۆوە بەهەمان شێوە بەرەقی وەڵامدرایەوە. مشتومڕەکەم بەوە دوایی پێ‌هاوردو وتم ئێمە لێرەدا بۆ لێکۆڵینەوە لەکێشەیەکی ئێجگار مەترسیدار خڕبووینەتەوە کە ئەمەیە: ئایا پیاوەکان ئامادەن تاکۆتایی درێژە بەشەڕەکە بدەن یان ئەوەیان پێ‌باشە لەسەری بەردەوام نەبن؟..بۆ ئەوە کۆنەبووینەتەوە تاوەکو بەیانی ناکۆکیگەلی بچوك یاخود گرفتگەلی ناوخۆیی بکرێت کە مەزنیی جەنگی‌پارتیزانیی لەکاتی‌یەکلاکردنەوەدا خراپ دەکات. نە سەرنجەکانی ئۆستاکیۆوجۆلیۆو نە وەڵامەکانی‌مۆرۆوپاچۆم پێ‌قوتچوو...بەدەربڕینێکی‌دی پێویستە شۆڕشگێرترین‌و سەرمەشق بین بۆ کەسانی‌دیکە.

## 9ی ئاب

ئەم بەیانییە هەر هەشت پشکنەرەکە دەرچوون و ئەو پیاوانەش کە سەرگەرمی هەموارکردنی ڕێگاکەن لەخێوەتەکە دورکەوتنەوەو، لەپاش ئەوە بەپەنجا دەقیقە نەشتەرگەرییەك بۆ پاژنەی پێم کرا کە دواتر توانیم بینێمە سەر ئەرز بەڵام هێشتا ئازاری زۆرەو ئەو تایەش کە توشی بووم بەرۆکی بەرنەدام. وادیارە هەنوکە پاچۆ لەتەندروستییەکی باشدایە.
بەرزایی:780مەتر.

## 10ی ئاب

ئانتۆنیۆوشاباکۆ بۆ شکار لەدواوە دەرچوون و دواتر بەئاسکێك و تاوسێکی کێوییەوە گەڕانەوە، وادیارە بەخێوەتگەی یەکەم ڕاگەیشتون کە لەوێندەر هیچ ڕووداوێکی تازە ڕووینەدواوە بەڵام بارێك لەپرتەقاڵیشیان لەتەك خۆیاندا هاوردەوە. دوو پرتەقاڵم خواردو بەو هۆیەشەوە توشی سوکە نۆبەیەکیرەبۆ بووم و لەکاتژمێر یەك ونیودا کامبا کە یەکێکە لەو هەشت پیاوەی کە ڕەوانەم کردبوون، هاتەوەو ئەم دەنگوباسانەی لەتەك خۆیدا هاوردبووەوە: دوێنێ بەبێ ئاو سەریان ناوەتەوەو نووستون و ئەمرۆکە تاکاتژمێر نۆ لەسەر ڕێکردنەکەیان بەردەوام بوون و... هیچ شوێنەوارێکی ئاویان نەدۆزیوەتەوەو بینینیۆ ناوچەکەی ناسیوەتەوەو دواتر بۆ سۆراخی ئاو ڕووەو ڕۆزیتا دەچێت. هەرچی داریۆوپابلۆشە کە ئاویان دۆزییەوە ئەوجا دەگەڕێنەوە.
گوێم بۆ گوتارەکەی فیدڵ شلکرد کە تیایدا هێرش دەکاتە سەر پارتە باوەکان بەتایبەت پارتی ڤەنزەوێللا..وادیارە لەپشت پەردەوە پێکدادانی توندوتیژ ڕوویانداوە. پزیشکەکە سارێژێکی پێمی کردەوەو تەندروستیم

روو لەباشبوون دەکات بەلام هێشتا توانای ڕێکردنم نییە. بەلام وێڕای ئەوە دەبێت سبەینێ بەرێبکەوین بۆ ئەوەی بنکەکەمان لەو پیاوانەوە نزیک بکەینەوە کە ڕێگاکە هەمواردەکەن و بەدرێژایی ڕۆژ 35 دەقیقە پتر پێشڕەوییان کرد.

## 11ی ئاب

پیاوەکان زۆر بەخاویی ڕێی خۆیان کرد. پابلۆوداریۆ کە یاداشتێکی بینینیۆیان پێبوو هاتنەوەو بینینیۆ لەیاداشتەکەیدا دەڵێت لەرۆژیتا نزیک بوومەتەوەو پێویست بەسێ ڕۆژی تر دەکات بۆ ڕاگەیشتن بەماڵی فارگاس. پابلیتۆ لەکاتژمێر هەشت وچارەکدا بەرەو ئەو خاڵی ئاوە دەرچوو کە شەویان لەگوێیدا بەسەربردو لەدەوروبەری کاتژمێر سێدا توشی بوو بەتوشی میگیلەوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە لەراگەیشتن بەئامانجەکەمانەوە دورین. وادیارە گۆشتی تاوس بۆ ڕەبۆ باش نییە..چونکە دوچاری نۆبەیەکی بچوکی کردم و دەسبەجێ بەشەکەی خۆمدا بەپاچۆ. دواتر خێوەتەکەمان دەگۆڕین بۆ ئەوەی لەنزیک جۆگەیەکی بچوکەوە نیشتەجێبین کە ئاوەکەی بەنیوەڕوان وشك دەکات و لەنیوەشەودا دەست دەکاتەوە بەهەڵقولان. باران باری بەلام کەش وهەوا ساردنییەو..مێشولەی(ماریگی)لەناوچەکەدا زۆرە.
بەرزایی:740مەتر.

## 12ی ئاب

ڕۆژێکی ڕەشە. ئەو پیاوانەی کە ڕێگا خۆش دەکەن بەخاویی هەنگاویان هەڵگرت. هیچ ڕووداوێکی تازە لامان ڕووینەداو، ئازوخە خەریکە نامێنێت. بۆ سبەینێ ئەسپێکی دیکە سەردەبڕین و بەو هۆیەشەوە گۆشتی شەش ڕۆژ

هەڵدەگرین. رەبۆكەم بەپلەیەكی پەسەند هێشتا هەر وەكی خۆیەتی. باریانتۆس وتی جولانەوە شۆڕشگێڕییەكە لەسەرەتای هەرەسیدایەو بایدایەوە سەر بای بەرەكۆن و هەرەشەكردنی دەستوەردان لەدژی كوبا و وەكی جاری جاران بێ ئەقڵ بوو. ئێستگەكە باسی لەشەڕێك كرد كە لەمۆنتیگۆ دۆدار روویداوەو بووەتە هۆی كوژرانی یەكێك لەپیاوەكانی ئێمە كە ناوی: ئانتۆنیۆ فیرناندیزەوخەڵكی تاراتایە. ئەم ناوە لەتەك ناوی راستەقینەی پیدرۆدا نایەتەوە كە ئەویش هەر خەڵكی تاراتایە.

## 13ی ئاب

میگیل وئۆربانۆولیۆن وكامبا بۆ هەڵدانی خێوەتەكەیان لەو خاڵی ئاوەدا كە بینینیۆ دۆزییەوەو دواتر بۆ ئەوەی لەوێندەرەوە درێژە بەرێگاكەیان بدەن، دەرچوون. لەتەك خۆیاندا خواردنێكی ئەوتۆیان برد كە بەشی سێ رۆژیان دەكات و لەبڕێك لەگۆشتی ئەسپەكەی پاچۆ پێكهاتووە..كە ئەمرۆكە سەرمانبڕی. ئەمێستا چوار ولاخمان ماوەو هەموو بەڵگەكان هێما بۆ ئەوە دەكەن، پێش ئەوەی بەو ناوچە ئاوەدانانە رابگەین كە خواردنیان تیادا هەیە، ناچاردەبین ولاخێكی دیكەش سەرببڕین. سبەی ئەگەر كاروبار بەباشی رێبكات كۆكۆوئانیسیتۆ دەگەڕێنەوە. ئارتۆرۆ دوو تاوسی راوكردو دوای ئەوەی ئازوخەی گەنمەشامیمان نەما، پیاوەكان بڕیاری ئەوەیان پێدام كە بیخۆم. شاباكۆ رۆژ لەدوای رۆژ دەیسەلمێنێت كە ئەقڵی تێكچووە...هەرچی پاچۆیە تەندروستیی باش بووەو بەتەواوی چاك بووەتەوەو، منیش لەلایەنی خۆمەوە لەوەتەی دوێنێوە ئێش وئازاری رەبۆكەم زیادی كردووەو بۆ ئارامكردنەوەی پەنا بۆ حەبی هێوركەرەوە دەبەم و رۆژانە سێ دەنكی لێدەخۆم. سەبارەت پێشم خەریكە چاك دەبێتەوە.

## 14ی ئاب

ڕۆژێکی ڕەشە. ڕۆژێکی نوتەکیشە سەبارەت چالاکییەکانمان چونکە هیچ شتێکی تازە ڕووی نەدا. بەڵام لەئێوارەداو لەکاتێکدا کە گوێمان بۆ هەواڵەکانی ئێستگە شل کردبوو، دەنگوباسی دەستگرتن بەسەر ئەو ئەشکەوتەمان بیست کە پیاوەکان ڕووەو ئەوێندەر ڕۆیشتبون، ئێستگەکە هێندە بەتێروتەسەلی باسی لەو ئەشکەوتە کرد کە هیچ گومانێکم لەڕاستیی هەواڵەکە لا دروست نەبوو. ئەمرۆکە بەهۆی خراپیی باری کەش وهەواوە توشی ئێش وئازارێکی زۆری(ڕەبۆ)بووم. وادیارە لەنێو ئەشکەوتەکەدا بەڵگەنامەگەلی هەمەجۆرو وێنەگەلیشیان دۆزیوەتەوە. لەوەتەی دەستپێکردنی شەڕوپێکدادانەوە ئەمە توندترین گورزە کە ئاراستەمان کراوە. دەبێت یەکێك قسەی کردبێت و ئەو شوێنەی ئاشکراکردبێت، ئەو کەسە کێیە؟

ئەمە نهێنییەکەیە.

## 15ی ئاب

لەوەتەی بەیانی زووەوە پابلۆم نارد بۆ ئەوەی لەتەك خۆیدا نامەیەك بۆ میگیل ببات تیایدا داوای ئەوەی لێدەکەم دوو پیاو بنێرێت بۆ سۆراخی بینینیۆ لەبارێکدا کە ئەگەر کۆکۆوئانیسیتۆ لەسەفەر نەگەڕانەوە...بەڵام لەڕێگا توشیان بوو بەتوشییەوەو لەتەك خۆیدا هاوردنییەوە. میگیل پێیراگەیاندم کە ناچارە لەو شوێنەدا بمێنێتەوە کە لەشەودا پێیرادەگات و داوای ئەوەی لێکردم کە هەندێك ئاوی بۆ ڕەوانەبکەم. داریۆم ناردە لای و ئاگاداریی ئەوەی لەتەك خۆیدا پێیە کە سبەینێ بارودۆخ هەرچۆنێك بێت لەکاتێکی زوودا دەردەچین. بەڵام لەڕێگا توشی لیۆن بوو کە بۆ ئەوە هاتبوو تاوەکو زانیاری ئەوەمان پێبدات کە ڕێگاکە هەموارکراوە.

لەهەواڵێکی راگوزاری ئێستگەی سانتاکروزدا ئەوە بڵاوکرایەوە کە سوپا دوو پیاوی سەر بەگروپەکەی میۆپامبای دیلکردووە...چیدی گومان لەوە نەما کە گروپی ناوبراو گروپەکەی جواکینەو پێدەچێت جواکین لەلایەن سوپاوە روبەروی راوەدونانێکی توند ببێتەوە بەتایبەت لەپاش ئەوەی دوو دیلەکە قسەیان درکاندووە. کەشەکەی ساردبوو بەلام وێرای ئەوە شەوێکی خۆش بەسەربرا، بەلام هێشتا پێم ئازاری هەیەو پێویستە دومەڵێکی دیکەشی بقڵیشێنرێت. پاچۆ بەتەواوی چاك بووەوە. ئێستگەکان باسیان لەپێکدادانێکی‌دی کرد لەشیویاکۆ روویداوەو تیایدا سوپا هیچ زیانێکی لێنەکەوتووە.

## 16ی ئاب

سێ‌کاتژمێرو چل دەقیقەی تەواو رێمانکردو دواتر لەسەر رێیەکی تارادەیەك باش کاتژمێرێك وچانماندا. هێسترەکە سەروەختێك تەلاشی دارێك چوو بەلاقیدا لەسەر پشتی فرێی دامە خوارەوە بەلام توشی ئازار نەبووم..پێم خەریکە چاك دەبێتەوە. میگیل‌وئۆربانۆوکامبا لەسەر هەموارکردنی رێگاکە بەردەوام بوون‌و گەیشتنە رۆزیتا. دەبوو ئەمرۆکە بینینیۆو هاورێکانی بگەنە ئەشکەوتەکە، فرۆکەکان چەند جارێك بەسەر ناوچەکەدا هاتن‌و چوون. نازانم بۆچی دەگەرێن بەلام رەنگە شوێنەوارگەلێکیان ئاشکراکردبێت کە پێدەچێت هاورێیانمان لەنزیك ماڵی فارگاس جێیانهێشتبێت یاخود شوێنەواری گروپێکیان بەدی‌کردبێت کە بەدرێژایی رۆزیتا یاخود ریۆگراندی رێدەکەن.

لەئێوارەدا هاورێکانم لەمەترسیی پەرینەوە وریاکردەوەو رێ‌وشوێنی پێویستمان بۆ سبەینێ وەبەرگرت.

بەرزایی:600مەتر.

## 17ی ئاب

لەکاتێکی‌زوودا دەرچووین و لەکاتژمێر نۆدا گەیشتینە رۆزیتا. لەوێندەر کۆکۆ وتی پێموابێت گوێم لەدەنگی دوو تەقە بوو، ئیدی بۆسەیەکمان داناو چاوەڕوانمان کرد بێئەوەی هیچ رووداوێکی‌تازە رووبدات. دوای ئەوەی چەند جارێك رێگاکەمان بزرکرد، پاشماوەی رێگاکەمان بەخاویی بڕی‌و دواجار لەکاتژمێرچوارونیودا گەیشتینە ریۆگراندی‌و لەوێندەر خێوەتەکەمان هەڵدا. نیازم وا بوو پشتئەستور بەتریفەی مانگ درێژە بەرێکردنەکە بدەم بەڵام پیاوەکان تەواو ماندوبوون، ئەوەندەمان لەگۆشتی ئەسپەکە ماوە کە ئەگەر بەباشی بیخۆین بەشی دوو رۆژمان دەکات. سەبارەت خۆیشم ئەو(موت)ەی کە ماومە تەنها بەشی رۆژێکم دەکات. وادیارە ناچار دەبین ولاخێکی دیکەش سەربِبڕین. ئێستگەکە لەهەواڵەکانیدا ئەوەی بلاوکردەوە کە بەڵگەنامەگەل‌و دۆکیۆمێنت سەبارەت چوار ئەشکەوتەکە لەنانکاهوازو بلاودەکاتەوە، ئەمەش مانای ئەوە دەگەیێنێت کە ئەشکەوتی‌مەیمونەکانیش ئاشکراکراوەو کەوتووەتە دەست سوپا. بەهۆی ئەو هەلومەرجە باوەوە کە هەموو کاتم دەبات، زۆر هەستم بەئێش‌وئازاری رەبۆ نەکرد.

بەرزایی:640مەتر(ئەمەش سەبارەت دوێنێ کە بەرزاییمان گەیشتە:600مەتر، نالۆژیکیی پێشچاودەکەوێت).

## 18ی ئاب

لەجاران زووتر دەرچووین بەلام ناچاربووین لەچوار خاڵی ئاو بپەڕینەوە کە یەکێکیان تارادەیەك قوڵبوو..هەروەها جاروباریش ناچاربووین رێگا لێبدەین. لەبەر ئەم هۆکارانە لەکاتژمێردوودا گەیشتینەجۆگەکەو لەوێندەر

پیاوە ماندووەکان کەمێك پشوویاندا. دواتر هیچ چالاکییەکی ئەوتۆمان نەکرد کە شایانی باس بێت، لەوێندەر پۆلە مێشولە لەناوچەکەدا بەربڵاوبوو و لەشەودا پلەی گەرما پەیتاپەیتا رووی لەدابەزین و ساردبوون کرد.
ئانتی پێیوتم کامبا دەیەوێت بڕوات چونکە باری تەندروستیی بواری بەردەوامبوون لەتەك ئێمەی نادات و وێڕای ئەوەش سیماکانی خەبات لەداهاتوودا بەدی ناکات. هەڵبەت ئەمە بارێکی نموونەییەو ترسنۆکیی و خوێڕێتیمان بۆ دەردەخات و پێموابێت رێگای کشانەوەپێدانی کردەیەکی باشەو لەباریدایە خوێن و گیانێکی تازە بەبەری گروپەکەماندا بکاتەوە. بەڵام لەئێستادا ناتوانم مۆڵەتی کشانەوەی پێبدەم چونکە دەزانێت رووەو کوێ دەچین و ئەو رێیانە کامانەن کە بۆ پەیوەندیکردن بەجواکینەوە وەبەریان دەگرین. سبەی قسە لەتەك ئەو و هەروەها لەگەڵ شاباکۆشدا دەکەم.
بەرزایی: 680.

## 19ی ئاب

میگیل وکۆکۆوئانتی وئانیسیتۆ بۆ پشکنینی ناوچەکەو سۆراخی باشترین رێگا بەرەوماڵی فارگاس دەرچوون کە وادیارە لەوێندەر پەلێك دامەزراوە. پیاوەکان هیچ شتێکی تازەیان نەدۆزییەوەو ناچاربووین بەشوێنەواری رێگا کۆنەکەدا بڕۆین. ئارتۆرۆوشاباکۆ چوون بۆ شکارو ئاسکێکیان کوشت، هەروەها ئارتۆرۆ لەکاتی پاسەوانیدا لەتەك ئۆربانۆ ئاژەڵێکی(تاپیر)ی راوکرد بەڵام حەوت گوللەی نا پێوەی و بەو هۆیەشەوە بارگرژییەکی لەنێو خێوەتەکەدا دروستکرد. ئاژەڵەکە گۆشتی زۆربوو و هێندەی گۆشت هەبوو کە بەشی چوار رۆژمان دەکات. هەرچی ئاسکەکەشە بەشی رۆژێکی دەکرد و وێڕای ئەوە هەندێك لەخواردنی یەدەگیشمان لەفاسۆلیا و سەردین هەبوو. بەشێوەیەکی گشتی کۆی ئازوخەکە بەشی شەش رۆژی دەکرد.. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیێنێت ئەو ئەسپە بازووەی کە ناوی خرابووە نێو لیستی

سەربڕینەوە، ڕەنگە گەردنی لەچەقۆ ڕزگاری بێت. قسەم لەتەك كامبادا كردو ئـەوەم پێراگەیانـد كـە لـەپاش كۆتاییهـاتنی قۆنـاغی داهاتوومـان، واتـە پەیوەندیگرتن بەجواكینەوە، ئەوجا دەتوانێت بكشێتەوەو بڕوات. هەرچی شاباكۆشە وتی ناكشێمەوەو نارۆم چونكە ئەوە ترسنۆكیی پێدەڵێن، بەڵام ئومێدی وایە لەدوای شەش مانگ یاخود ماوەی ساڵێكیدی بتوانێت ئەو كارە بكات.. منیش لەو ئومێدە بێبەشم نەكردو گفتی ئەوەم پێدا داواكەی بەجێبهێنم، نـاوبراو لـەكاتی گفتوگۆكەمانـدا قسـەگەلێكی لێكـدژی كـرد. پێناچێت ڕەوشی باش بێت. هەواڵەكان پڕن لەقسەوباس دەربارەی دۆبریێ و هیچ باسێك سەبارەت تۆمەتبارانیدی نییە. هیچ دەنگوباسێكم لەبینینیۆوە پێرانەگەیشت و پێموابێت ئەمێستا گەیشتووە.

میگیـلوئۆربـانۆ كـە بـەكاری هــەمواركردنی ڕێگاكـە راسـپێردراون زۆر پێشڕەوییان نەكرد، هەمان شتیش سەبارەت ویلیوداریۆ كە لە(كاروبارە گشـتییەكان)بەرپرسـیارن، هەربۆیـە بڕیارمانــدا ڕۆژێكـی دیكـەش لێـرە بمێنینەوە. كۆكۆوئانتی لەگەشتی شكار بەدەستی خاڵیی گەڕانەوە بەڵام شاباكۆ ئاسكێكومەیمونێكی ڕاوكرد. لەگۆشتی ئاسكەكەم خواردو لەشەودا توشی نۆبەیەكی توندی ڕەبۆ بووم. پزیشكەكە هێشتا نەخۆشەو وادیارە دوچاری لۆمباگۆ(پشت ئێشە)بووە كە گەیشتە ئەوپەڕیو بەرەو مرۆڤێكی كەنەفت وەریچەرخاند. هیچ دەنگوباسێكم لەبینینیۆوە پێرانەگەیشت و كەوتمە گومانەوە، پێویستە لەم ساتە بەدواوە گرنگیی پێبدرێت.

ئێستگەكە باسی لەهەواڵی بوونی گرووپێك لەجەنگاوەران لەدووریی85 كیلۆمەتر لە(سوكەر)ەوە كرد.

## 21ی ئاب

ڕۆژێكی دیكەشمان لەهەمان شوێندا بەسەربرد بێئەوەی هیچ هەواڵێكمان لەبینینیۆو هاوڕێكانییەوە پێرابگات. پێنج مەیمونمان شكاركرد، ئۆستاكیۆ

چواریانی لەراودا کوشت و مۆرۆش پێنجەمی لەرێرەوەکەدا راوکرد..مۆرۆ هێشتا گیرۆدەی ئازاری لۆمباگۆیە هەربۆیە دەرزییەکی میبیریدینمان بۆ کرد. ناتوانم لەگۆشتی ئاسکەکە بخۆم چونکە بۆ رەبۆ باش نییە.

## 22ی ئاب

دواجار رۆیشتین بەڵام لەپاش رووداوێك كە بووە مایەی شپرزەیی نانەوە لەخێوەتەکەدا ...پیاوانیچاودێریی کەسێکیان لەسەر رۆخە لمینەکە بینی کە پێدەچێت هەوڵیهەڵهاتن بدات هەربۆیە تێکڕای گروپەکەیان ئاگادارکردەوەو دواتر دەرکەوت ئەو کەسە ئۆربانۆبوو رێگای لێ بزربوبوو. بەنجێکی لۆکاڵیی پزیشکەکەم کرد تاوەکو بتوانێت سەفەربکات، ئیدی وێڕای ئێش و ئازارەکانی توانیسوار پشتی ماینەکە ببێت و وادیارە تەندروستیی کەمێك باش بووە..هەرچی باشۆیە بەپێ رێیکرد.
لەبەری لای راستدا خێوەتەکەمان هەڵداو زۆربەی رێگاکە هەموارکرابوو تەنها کەمێك مابوو تاوەکو بەماڵیفارگاس رادەگەین. هێشتا ئەوەندەمان گۆشتی تاپیر ماوە کە بەشی سبەینێ و دوو سبەی دەکات..کارەساتەکە لەوەدایە لەسبەینێ بەدواوە ناتوانین راوبکەین.
بینینیۆ هیچ هەواڵێکی نییە..ماوەی دە رۆژ بەسەر جیابوونەوەیدا لەکۆکۆ تێپەڕی.
بەرزایی:580مەتر.

## 23ی ئاب

رۆژێکی ئێجگار تاقەتپڕوکێنمان بەسەربرد چونکە ناچاربووین بەگوێ رێرەوێکی بەردینی یەکجار سەختدا رێبکەین و ئەسپە چەرمووەکەش مانیگرت و ئیدی دوای ئەوەی قاچەکانی لەنێو قوڕولیتەدا چەقین و هیچ

کەڵك وسوودێکمان لێنەبینی، جێمانهێشت و وازمان لێهاورد. گەیشتینە کوختی بچوکی راوچییان و لەوێندەر شوێنەوارگەلێمان دۆزییەوە بەڵگەی ئەوەن کە خەڵکی تیادا نیشتەجێیەو دەسبەجێ بۆسەیەکمان داناو هێندەی نەبرد دوو پیاو کەوتنە نێو بۆسەکەوە. وتیان بۆ ئەوە هاتوین تەپکەکانمان بەسەربکەینەوە کە ژمارەیان دە تەپکەیەو لەم دەوروبەرەن. هەروەها وتیان سوپا لەماڵی فارگاس و لەتاتارنداوکاراگواترنداوئیبیتاویۆمۆن دامەزراوەو پێش دوو رۆژ لەمەوبەر لەکاراگواترندا پێکدادانێك روویداو بەوهۆیەشەوە سەربازێك بریندداربوو. دەسبەجێ گومانم لەبینینیۆ کردو پێم وا بوو برسێتی تەنگیان پێهەڵچنیوەو سەربازەکان گەمارۆیانداوە. دوو پیاوەکە وتیان سوپا عادەتی وایە بەیانیان و بەشێوەی گروپ کە هەر گروپێکی لەنێوان دە تا بیست پیاودا دەبێت، راوە ماسیی دەکات. خواردنی ئێوارە لەگۆشتی تاپیرو هەندێك لەو ماسییانە پێکهات کە بەهۆی دینامیتەوە راوکران. منیش لەلایەنی خۆمەوە برنجم خواردو وادیارە زۆر باش بوو بۆم. تەندروستیی پزیشکەکە کەمێك باشتر بوو. لەنێو دەنگوباسەکانی ئێستگەدا هەواڵی ئەوە بلاوکرایەوە کە دادگاییکردنەکەی دۆبرێ بۆ مانگی ئەیلول دواخراوە.

بەرزایی: 580 مەتر.

## 24ی ئاب

پیاوەکان لەکاتژمێر پێنج ونیوی بەیانیدا لەخەو هەستان و هەمووان بەمەبەستی شوێنپێ هەڵگرتنی شوێنەواری دۆڵەکە، بەرەو دۆڵەکە بەرێکەوتین. پیاوانی پێشرەو لەپێشەوە دەرچوون و هێشتا چەند مەترێك رێیان کردبوو لەبەرەکەی ترەوە سێ جوتیار دەرکەوتن. میگیلم بانگکردو دوام لەهەموو هاورێیان کرد لەپێگەی خۆیاندا لەبۆسەکەدا دابمەزرێن. دوابەدوای ئەوە هەشت سەرباز بەرەو روومان هاتن. فەرمانمدا هێمنیی

بپـارێزن تـاوەکو لـەخاڵی ئـاوی بەرامبـەر تێدەپـەڕن و هـەر کـە لێشـمان نزیکبوونـەوە تەقـەیان لێبکرێـت بـەڵام سـەربازەکان لەئاوەکـە نەپەڕینـەوەو تەنها بەکورتە گەشتێك بەسیان کردو دواتر لەشوێنی هاتنیانـەوە گەڕانـەوە، لـەئاگری چـەکەکانمانەوە نزیکبـوون بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا گوللـەبارانمان نـەکردن. دیلـە مەدەنییـەکان وتیـان گوایـە شکارچـی سـادەو هـەژارین. میگیل‌وئۆریـانۆ کـە کامبـا وداریـۆوهۆگـۆ گۆزمـانی راوچییان لەتەکدابوو رەوانەی دۆزینەوەو پشکنینی رێیەکمان کردن کە رووەو خۆرئاوا دەچێت و نازانین بـەکوێ رادەگـات. ئێمـەش بەدرێـژایی رۆژگـار لەبۆسـەکەدا ماینـەوە. سـەروەختێك کـە شـەو داهـات، ئـەو پیاوانـە گەڕانـەوە کـە رێگاکـە هەمواردەکەن و ئەو ئاژەڵانەیان لەتەك خۆیاندا هاوردەوە کە کەوتبوونـە نێـو تەپکەکـەوە، لەنێویشـیاندا کۆنـدۆر(جۆرێکـە لـەداڵ) و پشـیلەیەکی کێـوی بۆگەن هەبوو ئیدی هەموو شتێکی بەپاشماوەی تاپیرەکەشەوە لوش لێداو خواردی. هێشتا هەندێك فاسۆلیامان ماوەو لـەوەش بترازێـت هـیچ چارێکی ترمان نییە تەنها راوکردن نەبێت.

کۆمبـا لەرێگادایـە بـەرەو راگەیشـتن بەئەوپـەڕی سـنورەکانی ورە داڕوخـان..هـەر کـە نـاوی-سـەرباز دێتـە بـەرگوێی لـەرز بەگیانیـدا دێـت. پزیشکەکە هێشتا بەدەست ئازارەکانییەوە دەناڵێنێت و بەهۆی تالامۆنالـەوە چارەسـەری خـۆی دەکـات. منـیش لەلایەنی‌خۆمـەوە وادیـارە تەندروسـتیم باشە بەڵام تارادەیەکی ترسناك برسیمە.

سـوپا راگەیانـدنێکی دەرکـرد تیایـدا ئاشـکراکردنی ئەشـکەوتێکی دیکـە رادەگەیێنێت، هەروەها لەراگەیاندنەکەدا باس لەبەسوکی برینداربوونی دوو سـەربازو(زیانگـەل لـەریزی جەنگاوەرانـدا) دەکـات. لەهـەواڵێکی رادیـۆی هاڤانـاشـدا ئـەوە بڵاوکرایـەوە کـە شـەڕێك لـەتـاپیریلاس روویـداوەو تیایـدا

سەربازێکی سوپا زامداربووە بەڵام جەخت لەسەر راستیی ئەم هەواڵە ناکاتەوە.

## 25ی ئاب

ئەمرۆکە بەبێ هیچ رووداوێکی تازە تێپەڕیو لەکاتژمێر پێنجدا کەرەنا لێدراو بەیانیزوو پیاوەکان بۆ هەموارکردنی رێگا دەرچوون..حەوت سەرباز گەیشتنە دوریی چەند مەترێك لەپێگەکانمانەوە بەڵام هەوڵی پەڕینەوە لەئاوەکەیان نەداو تەنها بەتەقاندنی چەند گوللەیەك بەئاسماندا، وادیارە ئەویش بۆ بانگکردنی راوچییەکان، بەسیان کرد، سبەینێ ئەگەر دەرفەت هەبوو پەلاماریان دەدەین. رێگاکە پێشڕەویینەکردو میگیلوئۆربانۆ بۆ وەرگرتنی رێنماییەکانمان رەوانەکران بەڵام ئۆربانۆ بەباشی تێینەگەیاندینو لەکاتێکیشدا گەیشت کە ئەنجامدانی هەر کارێك لەو کاتەدا دژوارو ئەستەمە. ئێستگەکە هەواڵی پێکدادانێکی باسکرد کە لەچیاکانی هۆرادۆدا روویداوەو وادیارە لەئامادەسازیی جواکینە، هەروەها باسی لەبوونی جەنگاوەرگەل لەدوریی سێکیلۆمەتر لەکامیرییەوە کرد.

## 26ی ئاب

کاروبارەکان بەپێچەوانەی خواستی ئێمەوە رێیانکرد چونکە حەوت پیاوەکە گەیشتنەجێ بەڵام بەسەر دوو دەستەدا دابەش بوون، پێنج کەسیان بەئاراستەی لای خوارووی رووبارەکەدا رۆیشتن. دوو سەربازی دیکەشیان خۆیان بۆ پەڕینەوە لەئاوەکە ئامادەکرد...ئانتۆنیۆ کە لەئەنجامدانی بۆسەکە بەرپرسیارە، پێشوەخت تەقەی کردو ئامانجەکەی نەپێکا، ئیدی ئەوە هەلی بۆ دوو سەربازەکە رەخساند کە بەخێرایی هەڵبێنو بچن داوای فریاکەوتن بکەن، پێنج پیاوەکەی تریش هەر بەخێرایی بەرەو دواوە

کشـــانەوەو لـــەکاتی کشـــانەوەیاندا قەڵـــەمبازیان دەدا ئیـــدی هەریـــەك لـــەئـانتی وکۆکـۆ پەلاماریانـدان بـەڵام ئـەوان دەسـبەجێ لەپشـت تاشـە بەردەکانـەوە خۆیـان شـاردەوەو توانییـان پـەلاماردەران بـەرەو دواوە پاشەکشێ پێبکەن. لەکاتێکدا کە چاودێریی پرۆسەی راوەدونانەکەم دەکرد تەماشام کرد لەلایەنی پیاوەکانی خۆمانەوە بەئاراستەی ئانتی وکۆکـۆدا گوللە دەبارێت، دەسبەجێ بەرەو لێکۆڵینەوە لەراستیی مەسەلەکە هەنگاوی خێرام هەڵگرت و بۆم دەرکەوت ئەوە ئۆستاکیۆیە کە تەقە دەکات و ئانتۆنیۆ هـیچ ئاگـاداری نەکردووەتـەوە. هێنـدە تورەبـووم دەسـەڵاتم بەسـەر خۆمـدا نـەماو بەهـەموو هێزێکـەوە سەرزەنشـتی ئـانتۆنیۆم کـرد. بـەهۆی بـاری تەندروستیی پزیشکەکەوە بەخاویی هەنگاومان هەڵگرت و لەولاشەوە سوپا جڵـەوی هەڵوێسـتەکەی کـردەوەو پاڵپشـت بەبیسـت یـاخود سـێ سـەرباز لەدورگەکەی بەرامبەرمان نزیك بووەوە..هیچ کەڵکێکم لەبەرەنگاربوونەوەیدا بـەدی نـەکرد، رەنگـە لایـەنی زۆر دوو سـەربازی پێکـراین..دەرکـەوت کۆکـۆوئـانتی، لەسـاتەوەختی یەکلاکـەرەوەدا، خـاوەنی توانـای بڕیـاردانی گونجاون. کاروبارەکان بەباشی رێیانکرد تا ئەو دەمەی پزیشـکەکە لـەهۆش خـۆی چـوو و ئـەوەش بـووە مایـەی خلیچـك کردنـی رێکردنەکـە. لەکاتـژمێر شـەش ونیودا راوەسـتاین بێئـەوەی میگیل بگرینـەوە ئەگەرچـی تـەنها چـەند مـەترێکی دیـاریکراویش لێمانـەوە دوورە. دواتـر دەسـبەجێ پەیوەنـدی پێـوەگرتین. هەرچـیمۆرۆشـە، دوای ئـەوەی نـەیتوانی بەسـەر دوایین بەشـی دۆڵەکەدا سەربکەوێت، لەیەکێك لەدۆڵەکاندا مایەوەو بـەمجۆرە بەشێوەیەکی لەیەکـدی جـوداو دابەشـبوو بەسـەر سێ دەسـتەدا لێی خـەوتین. هـیچ شوێنەوارێکی ئەوەمان بەدی نەکرد کە بەڵگەبێت بۆ ئـەوەی سـوپا شـوێنمان کەوتووەو راوەدومان دەنێت.

بەرزایی: 900مەتر.

# 27ی ئاب

رۆژمان لەگەڕانی بێهودە بەشوێن رێیەکدا کە وەبەری بگرین بەسەربردو تائێستا بەهیچ ئەنجامێکی دڵنیا رانەگەیشتوین. ئێمە لەم ساتەدا لەنزیك ریۆگراندیەوەین و لە(یۆمۆن) پەڕیوینەتەوەو بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی کە کۆمانکردونەتەوە هیچ خاڵگەلێکی نوێی پەڕینەوە بوونی نییەو ناچاردەبین بگەڕێینەوەو بەتەنیشت تاشە بەردەکەی میگیلدا درێژە بەرێگاکە بدەین بەڵام هێسترەکان ناتوانن لەم رێرەوەوە بپەڕنەوە. ئەگەرێکی دیکەمان لەپێشدا ماوە ئەویش پەڕینەوەیە لەزنجیرە چیایەکی بچوك و ئینجا درێژەدان بەرێگا رووەو ریۆگراندی ـ مازیکۆری، بەڵام لەم رێگاچارەیە دڵنیانین و پێویستە سبەینێ لێی بکۆڵینەوە. لەبەرزاییگەلێکی 1300مەتریی پەڕینەوە کە بەرزترین بەرزایی ناوچەکەیەو شەومان لەسەر بەرزایی1240مەتردا بەسەربردو کەشەکەی مەیلەوساردبوو. تەندروستیم باشە بەڵام مۆرۆ ئێش وئازارێکی زۆری هەیەو ئاومان پێنەماوە تەنها کەمێك بۆ پزیشکەکە ماوە.

هەواڵی باش یاخود رووداوی خۆش هاتنەوەی بینینیۆوناتۆوجۆلیۆبوو. سەرکێشییەکی تەواویان گوزەرانکرد چونکە سەربازەکان لەفارگاس ویۆمۆن دامەزراون و، لەسەرەتادا روبەرویان بوونەتەوەو دواتر شوێن پێی فیرقەیەکی بچوکیان هەڵگرتووە کە لەسالادیۆ لایدەداو پاشان بەرەو نانکاهوازو سەرکەوتووەو ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە کە رووباری کۆنگری سێ رەوتی چیایی هەیە وادیارە سەربازەکان لێیانداوە. لەبەرواری هەژدەی مانگدا گەیشتونەتە خێوەتگەی ورچەکەو تەماشایان کردووە بووەتە سەربازگەیەکی تۆکمە دژ بەئێمەو نزیکەی150سەرباز تیایدا دامەزراوە. ئەم گۆڕانە دوچاری سەرسوڕمانی کردون بەڵام توانیویانە بێنەوەی کەس

بیانبینێــت بــەرەو دواوە بكشــێنەوە. لەدواییــدا بــەرەو كێڵگــەی بــاپیرە بەرێكـەوتون لەوێنـدەر تـەنها كولەكـەیان دەسـتگیربووە چـونكەخاوەنەكەی جێیانهێشـتووە، دواتـر جـارێكیدی بـەنێو سـەربازەكاندا رێیـان كـردووەو گوێیـان لەچـەند تەقەیـەك بـووەو بەمەبەسـتی هـەڵگرتنی شـوێنپێی ئێمـەو پەیوەندی كردنەوە پێمان شەویان لەدەوروبەردا بەسەربردووە. وادیارە نـاتۆ ژیرانـە هەڵسـوكەوتی كـردووە، وەكـی بینینیـۆ دەڵێـت، بـەڵام جۆلیـۆ دوو كــەڕەت رێگــای بزركــردووەو كــەمێك لەســەربازانیش ســڵی كردووەتــەوە. بینینیـۆ بـڕوای وایـە هەنـدێك لـەپیاوەكانی جـواكین پـێش چـەند رۆژێـك لەمەوبەر لەناوچەكەوە تێپەڕیون.

## 28ی ئاب

رۆژێكـیرەش و بەسـوێیە. تینوێتیمـان بەهەنـدێك بـەری وشـكی كـاراكۆی شـكاندو ئەمـەش وەكـی ئـەوە وا بـوو تینوێتییەكـە چەواشـە بكـەین. میگیل، پابلیتۆی بەتاقی تەنها لەتەك یەكێك لەراوچییەكاندا بۆ گەڕان بەشوێن ئـاودا رەوانـەكرد كـە تـەنها دەمانچـەیەكی بێكـەڵكی پێبـوو. كاتـژمێر چواروئیوبوو هێشـتا نەگـەڕابووەوە. كۆكـۆوئانیسـیتۆم بـۆ سـۆراخكردنی نـارد و ئـەوانیش بەدرێژاییشـەو هـەر نەهاتنەوە. پیـاوانی دواوە لەشـوێنی سـەرەولێژییەكەدا مانــەوەو نــەمانتوانی گوێمــان لەهەواڵودەنگوباســەكان بێــت. وادیــارە نامەیــەكی نــوێ هــاتووە. دواجــار جوانووەكــە، كــە لەوەتــەی دوومانگــە هاوڕێمانە، سـەرمانبڕی. ئەوپـەڕی تەقـەللام كرد گـەردنی لەچـەقۆ رزگاربكـەم بـەڵام برسـێتی نەبـەزە. بـەمجۆرە لـەكاتی ئێسـتادا تینومـان نابێـت و بـڕواش ناكەم سبەینێ بەئاو رابگەین.

لەنێو دەنگوباسـەكانی ئێستگەكەدا هـەواڵی ئـەوە بڵاوكرایـەوە كـە سـەربازێك لەناوچەی تاتاریندا زامداربووە. ئەوەی واقـی مـن دەوڕمێنێت ئەمەیـە: ئەگـەر

بەوپەڕی وردیی باس لەزیانەکانی خۆیان دەکەن ئەدی بۆچی سەبارەت هەندێك خاڵی‌دیکە درۆدەکەن؟ ئەگەر دروست راستگۆن ئەدی ئەوانە کێن کە لەناوچەگەلی دووروتەریکی لەنموونەی کاراگواترندا وتا پیریلاس‌دا دوچاری زیانیان دەکەن؟ ئەم پرسیارانە هیچ وەڵامێکیان نییە تەنها ئەوە نەبێت کە ئەگەر جواکین پیاوەکانی خۆی بەسەر دوو دەستەدا دابەش کردبێت... هەروەها ئەگەری سەرهەڵدان و پەیدابوونی گروپگەلی نوێی سەربەخۆش هەیە.

بەرزایی:1200مەتر.

## 29ی ئاب

رۆژێکی پڕلەماندوێتی وبەسوێیە. پیاوەکان هیچ پێشڕەوییەکیان لەلێدانی ڕێگاکەدا نەکرد کە شایانی باس بێت بەڵکو لەدیاریکردنی ئاراستەی دروستدا بەهەڵەداچوون و بڕوایان وا بوو لەرێگادان بەرەو مازیکۆری. خێوەتەکەمان لەسەر بەرزایی1600مەترو لەشوێنێکی تارادەیەك شێداردا هەڵدا کە لەوێندەر جۆرێك لەقامیشی‌شەکر دەڕوێت شەربەتەکەی تینوێتی دەشکێنێت. بەهۆی نەبوونی ئاو ئامادەگیی ئەم پیاوانە بەتەواوی هەرەسی هاوردووە: شاباکۆو ئۆستاکیۆوچینۆ. پێویستە سبەینێ کار بۆ پشکنینی یەکەمین خاڵی ئاو بکەین، وادیارە مەکارییەکان بەچاکی بەرگەی باری گرانی رێگا دەگرن.

لەئێستگەکەدا هیچ دەنگوباسێکی جێی‌بایەخ نییەو قسەو لێدوانەکان بەشێوەیەکی گشتی باس لەدادگاییکردنەکەی دۆبرێ دەکەن کە هەفتە لەدوای هەفتە درێژتر دەبێتەوە.

## 30ی ئاب

هەڵوێستەکە بەشێوازێکی توند خەریکە دەبێتە مایەی نیگەرانیی چونکە ئەو پیاوانەی کە رێگا هەمواردەکەن لەهۆش خۆیان چوون و میگیل و داریۆ

میزەکانی خۆیان خواردەوەو چینۆش بەدوایاندا میزی خۆی خواردەوەو دەرەنجامەکان ترسناك بوون: سکچوون‌و ژانەسك. ئۆربانۆو بینینیۆوجۆلیۆ چەمێکیان دۆزییەوەو ئاویان لەنێویدا دۆزییەوەو پێیان راگەیاندم کە هێسترەکان ناتوانن بەو شوێنەدا تێپەڕن هەربۆیە بڕیارمدا لەتەك ناتۆدا بمێنمەوە بەلاّم ئانتی ئاوی هاوردە سەرەوەو بەمجۆرە ئێمە هەرسێکمان ماینەوە لەگۆشتی ماینەکەمان خوارد. نەمتوانی گوێ لەدەنگوباس بگرم چونکە رادیۆکە لەچەمەکەدا مایەوە.

بەرزایی:1200مەتر.

## 31ی ئاب

لەبەیانیدا ئانیسیتۆلیۆن بۆ ئەنجامدانی گەشتێکی پشکنین لەدۆڵەکەدا دەرچوون‌و لەدەوروبەری کاتژمێر چواردا هاتنەوەو وتیان رێرەوێك هەیە بۆ رێکردنی هێسترەکان لەو خێوەتەوە دەستپێدەکات کە لەدەوری خاڵی ئاوەکەوە هەڵدراوە بەلاّم ئەو گرفتەی کە هاتە سەر رێگامان گرفتی راگەیشتن بوو بەوجێیە، دواتر ناوچەکەم بەسەرکردەوەو تەماشام کرد ولاّخەکان دەتوانن پیایدا رێبکەن، بەمجۆرە فەرمانمدا بەمیگیل لەپشت دوایین تاشە بەردەوە خول بخوات‌و لەسەر لێدانی رێگا بەردەوامبێت، ئێمەش لەولاوە لەتەك هێسترەکاندا دادەبەزینە خوارەوە..

نامەیەکمان لەمانێلاوە پێراگەیشت‌و نەمانتوانی کۆدەکەی بکەینەوە.

# لێکدانەوەی مانگانە

گومان لەوەدا نییە ئەم مانگە خراپترین مانگ بوو لەرووی جەنگیپارتیزانییەوە کە بەخۆمانمانەوە بینی. چونکە بەلەدەستدانی سەرجەم حەشارگەکان بەو بەڵگەنامەو دەرمانانەش کە تیایاندابوو..گورزێکی بەسوێمان بەرکەوت، بەتایبەتی لەلایەنیدەروونییەوە. هەروەها لەدەستدانی دوو پیاو لەکۆتایی مانگداو ئەو رێکردنە دوورودرێژە کە بەدوایدا هات و لەماوەشیدا گەدەکان تەنها گۆشتی ئەسپیان تێچوو، بووە هۆی دابەزینی ورەگەلی پیاوەکان. هاوکات یەکەمین حاڵەتیکشانەوە روویدا، هەڵبەت مەبەستیشم لەو حاڵەتە کامبایە، ئەمەش بۆ خۆی شتێکی بەکەڵکە بەڵام لەم بارودۆخەی ئێستادا نا. هەروەها پچڕانی پەیوەندی بەدەرەوە بەتایبەتی بەجواکینەوەودانپێدانانی پیاوەکانی کە هەموو شتێکیان درکاند...هەموو ئەمانەش ورەگەلی گروپە بچوکەکەمان لەق کرد. نەخۆشییەکەشم هەندێك کەسی نیگەران کردو هەموو ئەمانەش لەو تاکە پێکدادانەدا کە لەتەك دوژمندا روبەرومان بووەوە، رەنگی دایەوە: دەبوو دوچاری زیانگەلێکی زۆری بکەین کەچی ئەنجامەکەی تەنها زامدارێك بوو. لەلایەکی دیکەوە ئەم رێکردنە دژوارە بەسەر تەپۆلکەگەلێکی خاڵیی لەئاودا هاوکات هەندێك خەسڵەتی خراپی نێو پیاوەکانیشی ئاشکراکرد.

ئەمانەی خوارەوەش گرنگترین تایبەتمەندییەکانن:

1)تائێستاکە بێهیچ پەیوەندییەکین و ئومێدیشمان نییە کە بەم زووانە پەیوەندی ببەستین.

2)تائێستاکه نەمانتوانیوە جوتیاران بەشداری پێبکەین ئەمەش مەسەلەیەکی لۆژیکییە ئەگەر رەچاوی کەمیی ئەندازەی ئەو پەیوەندییانە بکەین کە لەم ماوەیەی دواییدا لەتەکیاندا بەستومانە.
3)پێمواییێت ورەگەلی پیاوەکان لەکشانەوەیەکی کاتییدایە.
4)سوپا تائێستاکە نەیتوانیوە کارایی و توانای خۆی سەبارەت شەرکردن زیاتربکات.

ئەمێستابەقۆناغێکدا تێدەپەڕین دابەزینی ورەگەلو ئەفسانە شۆڕشگێڕییەکەمان بەخۆوە دەبینێت. هاوکات تا ئێستاکە ئەرکە بەپەلەودەستوبردەکانی بەردەستمان هەر ئەرکەکانی مانگی پێشووە، هەڵبەت مەبەستیشم لەو ئەرکانە ئەمانەیە: نوێکردنەوەی پەیوەندی، خڕکردنەوەی جەنگاوەران، پەیداکردنی ئازوخەی دەرمان وکەلوپەل.
هەروەها پێمخۆشە هێما بۆ ئانتی وکۆکۆ بکەم کە رۆژ لەدوای رۆژ وەکی دوو سەرکردەی سەربازیی و دوو شۆڕشگێڕی تۆکمەو توندوتۆڵ دەردەکەون.

## 1ی ئەیلول1967

لەكاتێكیزووداو لەدوای ڕوودانی چەند ڕووداوێكی لەنموونەی كەوتنێكی درامیی هێستره نێرینەكە، لەسواری هێسترەكان دابەزاینە خوارەوە، پزیشكەكەش لەنەخۆشییەكەی چاك نەبووەوە، هەرچیخودیخۆیشمە بەتەواوی چاك بوومەوەو ئەمرۆكە بەباشترین شێوە ڕێمكرد ئەگەرچی هێسترێكیشم بەشوێن خۆمدا كێشدەكرد. ئەمرۆكە ڕێكردنەكە زۆر لەوە زیاتری خایاند كە پێشبینیمان دەكردو لەدەوروبەری كاتژمێر شەشوچارەكدا كتوپڕ گەیشتینەجۆگە ئاوەكەی نزیك ماڵیهۆنۆراتۆومیگیل بەو خێراییەی كە لەتوانایدابوو درێژەیدا بەبەسەركردنەوەی ڕێگاكە بەڵام بەهۆی ئەوەوە كە شەو داهاتو دنیا تاریكبوو زۆر دورنەكەوتەوە. ئیدی بینینیۆوئۆربانۆ بەوریایی پێشڕەوییانكردو لەبەرئەوەی هیچ شتێكی سەیریان لەدەوروبەردا بەدینەكرد هەربۆیە خانووەكە كە خانوویەكیجێهێڵراو و پڕبوو لەچەندین شتگەل كە سوپا بەشێوەیەكی كاتیی جێیهێشتبوون پەلامارماندراو داگیرمانكرد. لەنێو خانووەكەدا ئاردوچەوریی ونمەكوگیسكمان دۆزییەوە. ئیدی دوو گیسكمان سەربڕیو بەهۆی ئەو خوێیەوە كە دۆزیمانەوە خوانێكی گەورەمان ئامادەكرد هەموو شەویخایاند. لەسپێدەدا كشاینەوەوچاودێرێكمان بۆ پاسەوانیی خانووەكەودەروازەی ڕێگاكە لەدوای خۆمانەوە جێهێشت.

بەرزایی:740مەتر.

## 2ی ئەیلول

لەوەتەی بەیانیزووەوە بەرەو كێڵگەكان ڕێمانكردو كۆكۆو پاچۆو بینینیۆمان جێهێشت تاوەكو لەژێرسەرپەرشتیمیگیلدا بۆسەیەك

لەخانووەکەدا دابنێن. لەلایەنەکەی دیکەشدا چاودێرێك مایەوە. لەکاتژمێر هەشتدا کۆکۆ هات و وتی شوانێك هاتووە بەشوێن هۆنۆراتۆدا، دەرکەوت کە چوار شوانن ئیدی فەرمانم دەرکرد سیانەکەی تریش بهێنن بۆ ئێرە. بەو هۆیەشەوە کاتێکی بەنرخمان لەکیسچووچونکە ماوەی نێوان خاڵی نیشتەجێبوونەکەمان و خانووەکە کاتژمێرێکی تەواوە. لەکاتژمێر یەك ونیودا گوێمان لەهەندێك تەقە بوو و بۆمان دەرکەوت کە جوتیارێك بەهاوڕێیەتی سەربازو ئەسپێك نزیکبووەتەوە. ئیدی چینۆ لەتەك پۆمبۆو ئۆستاکیۆدا کە خەریکی پاسەوانیی بوو هاواریکرد:(سەربازە)! ویستی تەقەی لێبکات بەڵام سەربازەکە زوو هاتە دەست و ئەو لەپێشدا تەقەی کردو هەڵهات، ئیدی پۆمبۆ لێی هاتەدەست و ئەسپەکەی کوشت. زۆر توڕەبووم و پێموابوو کە ئەم رووداوە ئەوپەڕی بێتواناییدەردەخات، چینۆ قوڕوقەپی لێکردو متەقی نەکرد. ئەو چوار شوانەمان بەرەڵاکرد کە لەم کاتەدا بەرەو خانووەکە گەڕابوونەوەو هەروەها دوو دیلەکەشمان ئازادکردو هەموانمان رەوانەی بەرزاییەکانی مازیکۆری کرد. پارێنێکمان بە700دۆلار لەشوانەکان کڕی و، لەبەرامبەر کارەکەیدا100دۆلارماندا بەهۆگۆو50 دۆلاریشمان بۆ نرخی هەندێك لەو پێویستییانەی پێدا کە لێمان وەرگرت. دەرکەوت ئەسپە تیاچووەکە پێشان ولاخێکی کەنەفت بوو هەربۆیە بۆ هۆنۆراتۆمان جێهێشت. شوانەکان ئەوەیان گێڕایەوە کە هاوسەرەکەی هۆنۆراتۆ سکالای لەسەر سویا تۆمارکردووە چونکە سەربازەکان لەمێردەکەیان داوەو هەرچی شتێك لەخانووەکەیدا بووە خواردویانە..وادیارە هۆنۆراتۆ لەریۆگراندی بوو چوو بوو بۆ چارەسەری زامێك کە بەهۆی قەپی پڵنگەوە توشی بووە، سەروەختێك کە پێش هەشت رۆژ لەمەوبەر شوانەکان سەردانی خانووەکەیان کرد. بەهەرحاڵ خانووەکە کەسێکی هەر تیادابوو، باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەبوو کاتێك کە ئێمە

گەیشتینە ئەوێندەر تەماشامانکرد ئاگرێك پەی کراوە. بەهۆی هەڵەکەی چینۆوە، بڕیارمدا لەئێوارەدا بەو ئاراستەیەدا کە شوانەکان وەبەریان گرت رێبکەین. بەڵکو توشی یەکەمین خانووی سەر رێگامان بین و بۆسەیەکی تیادادابنێین چونکە پێموابوو سەربازەکان ژمارەیان کەمەو لەناوچەکە کشاونەتەوە. بەلاّم زۆر درەنگ دەرچووین و تا پێش کاتژمێر چارەك بۆ چوار نەمانتوانی لەخاڵی پەڕینەوەکە تێپەڕین...جگە لەوە خانووی مەبەستمان نەدۆزییەوە ئیدی لەرەوتێکی گاوگۆل و لەچاوەڕوانیی هەڵهاتنی خۆردا لەجێیەکدا لێی خەوتین.

ئێستگەکە هەواڵێکی ئێجگار خراپی سەبارەت لەناوبردنی گروپێك لەپیاوان لەناوچەی کامیری بلاّوکردەوە کە ژمارەیان خۆی لە دە کەس دەدات و کوبایییەك رێبەرایەتییان دەکات بەجواکین ناسراوە. سەرچاوەی ئەم هەواڵە ئێستگەی دەنگی ئەمەریکا بوو و هیچ کام لەئێستگە ناوخۆییەکان باسیان نەکرد.

## 3ی ئەیلول

رۆژی یەکشەممە...بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا لەتەك سوپادا کەوتینە شەڕەوە. لەسپێدەدا مازیکۆری مان رووەو لای خوارەوەو تاوەکو سەرچاوەی رووبارەکە پشکنی، دواتر کەمێك بەئاراستەی پێچەوانەی ئاراستەی ریۆگراندی رێمانکرد. لەکاتژمێر یەکی دوای نیوەرۆدا ئانتی وکۆکۆو بینینیۆوپابلیتۆوجۆلیۆولیۆن لەتەقەللایەکدا بۆ راگەیشتن بەخانووەکە، ئەگەر لەسەربازان خاڵیبوو و، بۆ کڕینی هەندێك کەلوپەل و پێویستیی پێداویست بۆ گوزەرانمان، دەرچوون. پیاوانی گروپەکە لەسەرەتادا دوو جوتیاریان دەستگیرکردو لەکاتی پرسیارلێکردنیاندا وتیان خاوەن ماڵ لەوێندەر نییەو ناوچەکەش لەسەربازان خاڵییەو دەتوانرێت بڕێکی باش

لــەخۆراكو ئازوخــە بكرِدرێــت. هــەروەها وتیــان: دوێنــێ پێــنج ســەرباز بــەخێرایی و بێئــەوەی لەدەوارەکــە لابــدەن تێپــەڕیون وهۆنۆراتــۆ لەتــەك دوو كوڕیداو لەرێگایدا بەرەو خانووەكەی لەناوچەكەوە تێپەڕیوە. سەروەختێك كە پیاوەكانمان گەیشتنە خانووەكە توشیان بوو بەتوشی40 سەربازەوەو پێكدادانێكی دڕدۆنگ وناڕۆشن لەنێوانیاندا روویدا كە لەماوەیدا لایەنی كەم سەربازێكیان كوشت كە سەگێكی لەتەكدابوو. سەربازەكانیش وەڵامی تەقەكانیان دایەوەو ئابڵوقەی پیاوەكانمانیاندا بەڵام هاوڕێیانمان لەبەردەم هاوارو قیژەی ئەواندا كشانەوەو بەو هۆیەشەوە نەمانتوانیدەنكە برنجێك پەیدابكەین. فرۆكەكە دەستیكردە هەڵفڕین بەسەر ناوچەكەداو هەندێك لەموشەكەكانی بەئاراستەی نانكاهوازودا فڕێدایە خوارەوە. بەهۆی دووجوتیارەكەوە چەند زانیارییەكی دیكەشمان دەستگیربوو وەكی زانیاریگەلی ئەوەی كە ئەوان هیچ شوێنەوارێكی جەنگاوەرانیان لەم ناوچەیەدا بەرچاونەكەوتووەو بۆ یەكەمین جار لەرێگای ئەو شوانانەوە كە دوێنێ لێرەوە تێپەڕین زانیویانە جەنگاوەران لەم ناوچەیەدا هەن.

ئێستگەی دەنگی ئەمەریكا هەندێك وردەكاریی دیكەی سەبارەت ئەو شەڕە بڵاوكردەوە كە لەتەك سوپادا روویداوەو وتیجۆزێ كاریللۆ تەنها كەسە لەكۆی دە پیاوەكە كە لەمەرگ رزگاری بووە. لەبەرئەوەی كاریللۆ، باكۆیە، كە بەیەكێك لەشوێنبزران دادەنرێتو، لەبەرئەوەی پرۆسەی قەڵاچۆكردنەكە لەمازیكۆری ئەنجامدراوە، هەربۆیە هەموو بەڵگەكان هێما بۆ ئەوە دەكەن كە ئەو هەواڵە درۆیەكی هەڵبەستراوەو هیچیتر.

بەرزایی:650مەتر.

## 4ی ئەیلول

گروپێك لەهەشت پیاو و بەسەرپەرشتی میگیل بۆسەیەكیان لەسەر رێگای بەرەو مازیكۆری رووەو ماڵی هۆنۆراتۆ داناو، تاكاتژمێر یەكی دوای نیوەرۆ

لەشوێنی خۆیدا مایەوە بێئەوەی هیچ رووداوێکی تازە روویدات. لەم کاتەدا ناتۆولیۆن دوای زەحمەتێکی زۆر مانگایەکیان هاورد بەڵام دواتر دوو گای نایابمان دەستگیربوو. ئۆربانۆوکامبا ماوەی دە کیلۆمەتریان بەرەو بەرزایی رووبارەکە بڕی و لەوێندەر چوار خاڵی پەڕینەوەیان دۆزییەوە یەکێکیان تارادەیەکی باش قوڵە. پارێنەکەمان سەربڕی و داوای هەندێك خۆبەخشم کرد بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی ئازوخە پەیداکردن و هەواڵ کۆکردنەوە، ئیدی لەژێر رێبەرایەتی ئانتی‌دا کۆکۆوجۆلیۆوئانیسیتۆو شاباکۆوئارتۆرۆ هەڵبژێردران. هەروەها هەریەك لەپاچۆوپۆمبۆوئانتۆنیۆوئۆستاکیۆش خۆیان بەخشی و رێنماییەکانی ئانتی بەمجۆرەبوو: راگەیشتن بەخانووەکە لەسپێدەداو چاودێریکردنی جموجوڵەکان و پاشان ئازوخە پەیداکردن لەبارێکدا کە ئەگەر ناوچەکە لەسەربازان خاڵیبوو... ئەگەر سەربازیشی لێبوو دەبێت لەپشت خانووەکەوە بڕۆن و درێژە بەرێکردنەکە بدەن، لایەنی کەم لەگەڵ دیلکردنی سەربازێکدا ئەگەر توانرا، هەروەها ئەوەشی بیری پیاوەکان هاوردەوە کە گرنگ ئەوەیە دوچاری زەرەرو زیان نەبین و تەواو وریابین.

ئێستگەکە هەواڵی کوژرانی پیاوێك لەخاڵی یزیۆو لەجێیەکدا کرد کە زۆر لەو ناوچەیەوە دوور نییە کە گروپی پێشوو تیایدا دوابەدوای پێکدادانێکی نوێ قەلاچۆکراو، ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەیە بۆ ئەوەی کە چیرۆکی جواکین لەبنەڕەتدا هەڵبەستراوە، بەڵام ئێستگەکە لەلایەکی دییەوە چەند زانیارییەکی تێروتەسەلی سەبارەت نیگرۆ، پزیشکەپیرۆڤییەکە، باس کرد کە لە بالماریتۆ کوژراو گواسترایەوە بۆ کامیری، وادیارە بیلادۆ یارمەتیدەربووە لەناسینەوەی لاشەکەداو ئەمجارە هەواڵەکە راستە، هەرچی دەنگوباسەکانی دیکەشە سەبارەت لەناوبردنی گروپەکەی جواکین راستنین وهەڵبەستراون...رەنگە دەسەڵاتداران بەبزربوویان لەقەڵەم بدات،

بەهەرحاڵ ئەو راگەیاندنەی کە ئەمێستا باس لەمازیکۆری‌وکامیری دەکەن ناوەرۆکێکی سەیریان هەیە.

## 5ی ئەیلول

ئەمرۆکە بەبێ هیچ رووداوێکی تازە کە شایانی‌باس بێت تێپەڕی‌و، لەکاتژمێر چوارونیودا گروپەکە گەڕایەوەو هێسترێکی بارکراو بەهەندێك ئازوخەی بەشوێن خۆیدا کێش دەکرد. وادیارە پیاوەکان سەربازگەلیان لەخانووەکەی مۆرۆندا بینیوەو خەریکبووە بەهۆی سەگەکانیانەوە هاوڕێیانمان ئاشکرابکەن‌و بەشەویش خەریکی گەڕانن بەناوچەکەدا. پیاوەکان بەپشت خانووەکەدا سوڕاونەتەوەو رێگایەکیان بۆ خۆیان‌و بەئاراستەی ماڵی مۆنتانۆدا لێداوەو لەوێندەر گەنمەشامییان دۆزیوەتەوەو کەسیان نەبینیوە هەربۆیە لەتەك خۆیاندا کیسێك گەنمەشامییان هاوردووەتەوە. لەنیوەرۆدا لەرووبارەکە پەڕیونەتەوەو بەوخانووانە راگەیشتون کە لەبەری ئەوبەر دروستکراون‌و ژمارەیان دووخانوو بووە. سەروەختێك ئەمان گەیشتونەتەجێ دانیشتوانی خانووی یەکەم هەڵهاتون ئیدی دەست بەسەر ئەو هێسترەدا گیراوە کە لەنزیکەوە بەدارێکەوە بەستراوەتەوەودانیشتوانی‌خانووی دووەمیش تەنها لەپاش هەڕەشە ئەوجا بەهاوکاریکردنیان قایلبوون. دانیشتوانی ئەم خانووە وتویانە ئەمە جاری یەکەمە بوونی گروپێکی‌دی جگە لەو گروپە دەبیستین کە پێش کەرنەڤاڵ لەماڵی بیریز لایاندا(واتە گروپەکەی ئێمە). سەروەختێك کە پیاوەکانمان رۆیشتن‌و خۆیان شاردەوە تاوەکو شەو دادێت بۆ ئەوەی لەشەودا پەلاماری خانووەکەی مۆرۆن بدەن‌و داگیری بکەن، کاروبارەکان بەشێوەیەکی گونجاو رێیانکرد بەلام ئارتۆرۆ رێگای بزرکردو لەرێگاخەوت‌وگروپەکە دووکاتژمێری تەواویان لەسۆراخکردنی ئەودا بەفیڕۆدا. وادیارە پیاوەکان

هەنـدێك شـوێنەواریان لـەپاش خۆیانـەوە جێهێشـتووە كـە ڕەنگـە بوونمـان ئاشكرابكات ئەگـەر بـەهۆی شـوێنەواری ماڵیاتـەوە نەشاردرێتەوە، هـەروەها لەرێگا هەندێك پێویستیشیان لێكەوتووە. پیاوەكان هەر كە ئەم هەواڵانـەیان بیست دەسبەجێ ورەیان دابەزی.

ئێستگەكە باسی لەوە كرد كە دەسەڵاتداران توانیویانـە لاشـەی جـەنگاوەران بناسـنەوە. بـەڵام دەنگوباسـەگان ڕەنگـە بـەزویی وەڵامـی ئـەوە بدەنـەوە. بەتـەواوی كـۆدی نامەیـەكمان كـردەوە كـە دەڵێـت كۆبوونـەوەی ڕێكخـراوی هاوكاری میللەتانی‌ئەمـەریكای لاتین سـەركەوتنێكی گـەورە بـووەو نوێنـەری بۆلیڤیا زۆر خراپ بووە. وادیارە ئاڵدۆفلۆریس كەسەر بەپارتی كۆمۆنیستی بۆلیڤیایـە خـۆی كردووەتـە نوێنـەری سوپای ڕزگـاریخوازی نیشـتیمانیی، هەربۆیە پێویستە بەدرۆ بخرێتەوەو یەكێك لەپیاوەكانی كۆڵی بانگبكرێت بۆ ئەوەی لـەو بارەیـەوە قسـەی لەتەكدا بكرێت. هـەروەها لـەنێو نامەكـەدا ئـەوە هـاتووە كـە خانووەكـەی لۆزانـۆ پشـكنراوەو دەسـتی بەسـەردا گـیراوەو لۆزانـۆش خـۆی شـاردووەتەوەو، دۆبـریێ دەتوانرێـت ئـاڵوگۆڕی پێبكرێت...ئەمـە هـەموو شـتەكانە... گومـان لەوەدانییـە كـە ئـەوان نامـەی ئێمەیان پێرانەگەیشتووە.

## 6ی ئەیلول

بینینیۆ

جەژنی لەدایكبوونی‌بینینیۆ هات و، پەیمانگەلێكی لەتەك خۆیدا هاورد، ئەو ئاردەی كە هەمانبوو لەبەیانیدا شێلامان و كەمێك لـە(مـەتی)مـان بەشـەكرەوە خوارد. دواترمیگیل لەتەك هەشت پیاو لەپیاوەكانیدا دەرچوو و، لەولاشـەوە لیـۆن پـارێنێكی دیكـەی لەتـەك خۆیـدا هـاورد. كاتێك كـە كاتـژمێر بـووە دەو پیاوەكـان دواكـەوتن و هـەر نەهاتنـەوە، ئۆربـانۆم نـارد تـاوەكو پێیـان بڵێـت

لـەنیوەرۆدا بۆسـەکە جێبهـێڵن. لـەدوای چـەند دەقیقەیـەك گـوێم لـەدەنگی تەقەیـەكو ئینجـا کورتـە دەسـترێژێكو پاشـان تەقەیـەکی‌دی بـوو بـەرەو لای ئێمـە هـات. لەکاتێکـدا کـە ئێمـە خـەریکی ئـەوەبووین لەپێگەکانمانـدا دابمـەزرێین ئۆربـانۆ بەپەلـە هـاتو وتـی توشـم بـوو بەتوشـی دەورییەیـەك لەسـەربازانەوە سـەگەلیان لەتەکدایـە. هەڵوێسـتەکە رووی لـەخراپیی کـرد بەتایبـەت چـونکە نـۆ لـەپیاوەکانم لەبەرەکـەی دیکـەو لەجێیـەکن کـە نـازانم کوێیـە. دەسـتمانکردە چـاککردنی رێگاکـەو ویسـتمان بێئـەوەی بەبـەری رووبارەکـە رابگـەین لێی‌دەربچین‌و، مـۆرۆ‌و پۆمبـۆ‌و کامبا وکۆکـۆمـان بـۆ ئـەم مەبەستە رەوانـەکردو، نیـازم وا بـوو کیسـە ئازوخـەکان بگوێزمـەوەو خولێـك بەپیاوانی دواوە بـدەم ئەگـەر تـوانرا تـاوەکو پەیوەنـدی بەگروپـەکـەوە دەکـەن کە دەشێت لەلایەنەکەی ترەوە ئەوانیش بکەونە نێو بۆسەکەوە. بەڵام میگیل لەتـەك هـەموو پیاوەکانیـدا بـەنێو دەوەنـە چـڕەکاندا هاتـەوە، رووداوەکـان بـەمجۆرە روویانـدا بـوو: میگیـل بێئـەوەی چـاودێرێك لەسـەر ئـەو رێیـە کـە ئێمـەی لەسـەرین جێبهێڵێـت، پێشـڕەویی کردبـوو و، بـۆ هـاوردنی ماڵیـات چـوبوو. کـاتێکیش کـە لیـۆن گـوێی لەسـەگوەڕ بوبـوو، میگیـل بڕیاریـدا بەمەبەسـتی وریـابوون بگەڕێتـەوە. لـەم کاتـەدا تەقـە دەسـتیپێکرد و دەورییەکەیان بینی لەرێگای نێوان ئەوان‌و دارستانەکە تێدەپەڕێت‌و، کاتێك کە لێیان تێپەڕی رێگایەکیان بۆ خۆیان‌و بۆ پیاوەکـانی دی لێدا. بەهێواشی کشاینەوەو سێ هێسترو سێ گامان بەدوای خۆماندا کێش دەکردو لەچوار خـاڵی پەڕینەوەمانـدا دووانیـان زۆر مەترسـیداربوون، دواتـر خێوەتەکـەمان لەدوریی نزیکەی حەوت کیلۆمەتر لەخێوەتی یەکەمەوە هەڵدا. مانگایـەکمان سـەربڕی‌و گۆشـتمان خـوارد تـاوەکو زگـەکانمان پڕبـوون. پیـاوانی دواوە ئـەوەیان پێڕاگەیانـدین کـە گوێیـان لـەدەنگی ئـاڵوگۆڕێکی درێـژخایانی

تەقـەبووە بەئاراسـتەی رووەو خێوەتەکـەی ئێمـەدا کـە ژمارەیـەك لەدۆشـکە بەشدارییان تیادا کردووە.

بەرزایی:640 مەتر.


Donnerstag
7
SEPTEMBER

# 7ی ئەیلول

ڕێکردنێکیماوە کورت. هێشتا تەنها لەخاڵێکی ئاومان دابوو کاتێك کە پیاوانی پێشڕەو توشیان بوو بەتوشی تەپۆلکەیەکی ئێجگار سەختەوە، ئیدی بۆ هەڵدانی خێوەتو لەچاوەڕوانیی هاتنی ئێمەدا لایاندا. سبەینێ چەند گەڕانێکی بەرفراوانی پشکنین ئەنجام دەدەینو ئەمەش هەڵوێستمانە: وادیارە فرۆکەکان لەم ناوچەیەدا کۆشش بۆ دۆزینەوەمان ناکەن ئەگەرچی خێوەتەکەشمانیئاشکراکردووەو ئێستگەکەش ئەوەی ڕاگەیاند کە من سەرکردەی ئەو گروپەم کە لەم ناوچەیەدا چالاکیی دەکات. ئەو پرسیارانەی کە لێرەدا دێنەپێشەوە ئەمانەن: ئایا دەترسن؟ بڕواناکەم. ئایا گەرمکردنی شەڕەکە بەدژوارو ئەستەم دەزانن؟ لەسۆنگەی ئەو کارانەوە کە کردومانەو کە ئەوانیش دەیزانن، بڕواناکەم وابێت. ئایا دەیانەوێت ئێمە پێشڕەویی بکەینو ئەوان لەناوچەیەکی ستراتیژییدا چاوەڕوانمان بکەن؟ ئەمەیان ڕێیتێدەچێت. ئایا بڕوایان وایە کە ئێمە لەناوچەی مازیکۆریدا دەمێنینەوە بۆ ئازوخە پەیداکردن؟ ئەمەشیان هەر ڕێیتێدەچێت. پزیشکەکە تەندروستیی باشە بەڵام من لای خۆمەوە دوچاری نسکۆیەك بوومو شەوێکی سپیم بەسەربرد.

ئێستگەکە زانیاریگەلێکی بەنرخی باسکرد کە جۆزێ کاریللۆ(باکۆ)داویەتی...پێویستە بیکەینە سەرمەشق بۆ ئەوانیدی، دۆبرێش بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەکانی باکۆ هاتە وەڵامو وتی جاروبار بۆ شکار دەچوومو ئەو چەکەش کە پێم بووە هەر بۆ ئەوە بووە. ئێستگەی لاکروز دیل سور هەواڵی دۆزینەوەی لاشەکەی تانیای ژنە جانگاوەری لەبەری لای ڕووباری ڕیۆگراندی بڵاوکردەوە بەڵام ئەو وردەکارییەی کە لەو بارەیەوە باسکران بۆنی ئەوەیان لێنایەت کە هەواڵەکە ڕاستبێت، وەکی

ئەوەی كە دەربارەی نیگرۆ بلاوكرایەوە. لەنێو ئەو زانیارییانەشدا كە ئەم ئێستگەیە سەبارەت ئەو هەواڵە بلاویكردەوە وتی لاشەكە گواستراوەتەوە بۆ سانتاكروز... بەلام تاكە ئێستگەبوو باسی لەو هەواڵە كردو ئێستگەی تیبلانۆ بەلایدا نەچوو.

بەرزایی:720 مەتر.

قسەم لەتەك جۆلیۆدا كردو وادیارە رەوشی باشە بەلام ئەفسوسیی خۆی سەبارەت پچڕانی پەیوەندیو پابەندنەبوونی خەڵكی بەجولانەوەكەوە دەردەبڕێت.

## 8ی ئەیلول

رۆژێكی هێمنە. لەبەیانییەوە تاوەكو ئێوارەو بەسەركردایەتی ئانتۆنیۆوپۆمبۆ بۆسەیەكمان لەهەشت پیاو دانا. ولاخەكان لەكێڵگەیەكی بەحەیزەران چێنراودا بەچاكی لەوەڕانو، هێسترەكەش خەریكە لەزامەكەی ئەو رۆژە كە بەهۆی كەوتنەوە دوچاری بوو چاكدەبێتەوە. ئانیسیتۆوشاباكۆ بۆ پشكنین بەئاراستەی لای ژوورودا دەرچوونو دواتر هاتنەوەو وتیان رێگاكە تارادەیەك بەكەڵكی رێكردنی ولاخ دێت. كۆكۆوكامبا لەنێو ئاوێكدا كە دەگاتە سەرسنگ لەرووبارەكە پەڕینەوەو بەسەر سەرەولێژییەكدا سەركەوتن كە دەكەوێتە لای بەرامبەرمانەوە، بەلام لەوێندەر هیچیان نەدۆزییەوە. میگیلم لەتەك ئانیسیتۆدا نارد بۆ پشكنین و لەدوای كورتە گەشتێك ئەم ئەنجامەیان لەتەك خۆیاندا هاوردەوە: زۆر دژوارە بتوانرێت بەولاخەكانەوە رێبكرێت..سبەینێ هەوڵدەدەم ئەم بەرە بپشكنم چونكە بڕوام وایە دەتوانرێت ولاخەكان، لەدوای داگرتنیبارەكانیان، بەمەلە لەئاوەكە دەربكرێن.

لەنێو هەواڵەکانی ئێستگەدا ئەوە بڵاوکرایەوە کە باریانتۆس ئامادەی ناشتنی پاشماوەی لاشەکەی تانیا، ئافرەتە جەنگاوەرەکە(بەگوێرەی ڕێورەسم و سروتی ئایینی مەسیحیی)بووەو دواتر رووەو بۆیرتۆمۆریسیۆ رۆیشتووە. واتە بەرەو ماڵیھۆنۆراتۆو، پێشنیاری ئەوەی پێشچاوی ئەو بۆلیڤییە چەواشەکارانە خستووە کە کرێی چاوەڕواننەکراویان وەرنەگرتووە، بەدەستی بەرزکراوە بەرەو پێگەوینکە سەربازییەکان پێشڕەوییبکەن لەبەرامبەر ئەوەدا کە راوەدو نانرێن. دواتر فرۆکەیەکی بچوك بەچەشنێکی ئەوتۆ دەستیکردە بۆردومانیناوچەی نزمی دەوروبەری هۆنۆراتۆ کە هەر دەتوت نمایشی تایبەت بۆ باریانتۆس دەکات.
رۆژنامەیەك لەبۆدابستەوە رەخنەی لەچێ گیڤارا گرتو، بەمرۆڤێکی سەرنجراکێش و نابەرپرسی لەقەڵەمدا. هاوکات دەستخۆشیی لەهەڵوێستی مارکسییانەی پارتی چیللی کرد کە لەبەرامبەر رووداوەکاندا هەڵوێستی پراگماتییانە وەردەگرێت. چەندە پێمخۆشە بەدەسەڵات رابگەم بۆ ئەوەی دەمامکی سەر رووخساری ئەو ترسنۆك و کرێگرتە هەمەجۆرانە لابدەم و لوتیان لەپیساییەکانی خۆیان وەربدەم.

## 9ی ئەیلول

میگیل و ناتۆ بۆ پشکنین دەرچوون و لەگەڕانەوەیاندا وتیان پیاوەکان دەتوانن لەخاڵێکەوە کە وادیارە گونجاوە، لەرووبارەکە بپەڕنەوە و هەرچی ولاخەکانیشە دەبێت بەمەلە لەرووبارەکە بپەڕنەوە، هەروەها جۆگەیەکی گەورەیان دۆزیبویەوە کە دەرژێتە نێو بەری لای چەپەوە و بەکەڵکی ئەوە دێت خێوەتی تیادا هەڵبدرێت. پیاوەکان لەسەر بۆسەدانان و لەشێوەی گروپگەلی هەشت کەسیی و بەسەرپەرشتی ئانتۆنیۆوپۆمبۆ بەردەوامبوون بەلام هیچ شتێکی تازە روویندا. قسەم لەتەك ئانیسیتۆدا کرد...وادیارە

کەسێکی تۆکەمەیەو بڕوای وایە کە هەندێك لە بۆلیڤییەکان خەریکن کۆڵدەدەن وجێماندەهێڵن، هەروەها دادوبێدادیشییەتی لەفەرامۆشکردنی کاری سیاسی لەلایەن کۆکۆوئانتی‌یەوە. گۆشتی مانگاکەمان تەواوکردو تەنها پێیەکانیمان ماوە کە بۆ شۆربای سبەینێ تەرخانکراوە. گرنگترین هەواڵ کە لەنێو دەنگوباسی ئێستگەکاندا بڵاوکرایەوە هەواڵی دواخستنی دادگاییکردنەکەی دۆبرێ بوو لایەنی کەم بۆحەڤدەی ئەیلول.

## 10ی ئەیلول

رۆژێکی‌خراپە. بەمژدەگەلی باش دەستپێکرد بەلام ولاخەکان لەرێگا سەختەکەدا لەسەر رێکردن لایانداو دواجار هێسترەکە مانیگرت و هەنگاوێک پێشڕەویی‌نەکرد ئیدی لەبەرەکەی دی جێمانهێشت. پێشانیش کۆکۆ بەهۆی زۆر بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی رووبارەکەوە ئەم بڕیارەی دابوو، منیش لەبەرەکەی تری رووبارەکە چوار تفەنگم دانابوو کە لەنێویاندا تفەنگەکەی‌مۆرۆو سێ بۆمبی دژە تانکی‌چەکەکەی بینینیۆ هەبوو. بەهاوڕێیەتی هێسترە مێینەکە بەمەلە لەرووبارەکە پەڕیمەوە بەلام لەکاتی پەڕینەوەدا پێڵاوەکانم ئاو بردی، ئەمێستا ناچاردەبم سۆلێك لەپێ بکەم کە حەزی لێناکەم. ناتۆجلوپەرگەکان‌وچەکەکەی خۆی کردە نێو پارچەیەکی پلاستیکییەوەو کردییە تورەکە بەلام سەروەختێك خۆی توڕدایە نێو ئاوەکەوە کە ئاستی‌ئاوی رووبارەکە زۆر بەرز بوبووەوە ئیدی لەکاتی پەڕینەوەدا هەموو شتەکانی ئاوبردی. هەرچی هێسترە مێیینەکەی دیکەشە قاچی گیرکردو بەتەنیا بۆ پەڕینەوە لەرووبارەکە خۆی فرێدا بەلام لەبەرئەوەی پەڕینەوە دژواربوبوو گەڕاندمانەوە بەری لای خۆمان‌و، کاتێك کە بۆ جارێکی‌دی لەتەك لیۆن‌دا هەوڵی پەڕینەوەیدایەوە، لەبەرئەوەی رەشەبا هەڵیکردبووخەریکبوو نغرۆبن. دواجار هەموو گەیشتینە جۆگەکەو

لەوێندەر خێوەتمان هەڵداو پزیشکەکە لەبارێکی تەندروستیی ئەوتۆدا بوو ئیرەیی پێنابرێت. بەدرێژایی شەو ئازای گیانی داهێزرابوو. پلانێکمان دانا بۆ ئەوەی جارێکیدی ولاخەکان بەمەلە بنێرینەوە بۆ ئەوبەری رووبارەکە بەلام ئاستی ئاوەکە بەرزبوبووەوەو دەبوو چاوەڕوانی نزمبوونەوەی بکەین. جگە لەوەش هەندێك لەفرۆکەکان و فرۆکەی هیلیکۆپتەر بەسەر ناوچەکەدا هەڵفڕین. .زۆر لەهیلیکۆپتەر دەترسم چونکە دەتوانێت سەربازان دابەزێنێتە خوارەوەو بەدرێژایی رووبارەکە بۆسەگەل دابنێت. سبەینێ بەئاراستەی رووەو بەرزایی و لای خواروی رووبارەکەدا پشکنینێك دەکەین بۆ ئەوەی بتوانین شوێنی بوونمان کتومت دیاری بکەین.

بەرزایی:780 مەتر.

رێگا:34 کیلۆمەتر.

بیرم نەبوو هێما بۆ ئەم رووداوە بکەم: ئەمرۆکە لەپاش چاوەڕوانییەك کە پتر لەشەش مانگی خایاند خۆم شت و بەو هۆیەشەوە ژمارەیەکی پێوانەیی ئەوتۆم تۆمارکرد کە تەنها هەندێك لەهاوڕێیان پێیراگەیشتوون.

## 11ی ئەیلول

رۆژێکی ئارامە. هەندێك لەپیاوەکان بۆ پشکنینی بەرزایی رووبارەکەو جۆگەکە دەرچوون. ئەوانەی رووەو رووبارەکە چوبوون لەتەك داهاتنی تاریکیدا گەڕانەوەو وتیان لایەنی زۆر رێرەوێك هەیەو دژوارە بتوانرێت پێش دابەزینی ئاستی ئاوی رووبارەکە لەبوونی دڵنیابینەوە، هەروەها دوو رۆخی لەباروگونجاو بۆ ولاخەکانیشیان دۆزییەوە. هەرچی بینینیۆوجۆلیۆشە کە بۆ پشکنینی جۆگەکە دەرچوون، لەنیوەڕۆدا هاتنەوەو وادیارە پشکنینەکەیان بەپێی پێویست نەبووە. ناتۆو کۆکۆ بەیارمەتی پیاوانی پاشەوە بۆ هاوردنی ئەو پێویستییانە دەرچوون کە

لەبەرەکەی دیکەدا مانەوە دوای ئەوەی هێستره مێینەکەیان بەرەو پەڕینەوە لەرووبارەکە پاڵپێوەنا، دواتر هەموو شتێکیان لەتەك خۆیاندا هاوردو تەنها کیسێك‌و هەندێك مەخزەنی تایبەت بەدۆشکەکەیان لەوبەرەوە جێهێشت‌و نەیانهاورد.

رووداوێك روویدا کە جێی‌داخە: چینۆ هات بۆ لام‌و وتی‌ناتۆ گۆشتێکی سورەوکراوی لەگۆشتی مانگاکە دروستکردووەو بەتەنهاو بەبەرچاوی منەوە خواردویەتی. منیش بەتوندی سەرزەنشتم کرد چونکە ئەو لەقەدەغەکردنی بەرپرسیارە، لەدوای لێپێچینەوەی پێویست کاروبارەکان بەئەندازەیەکی ئەوتۆ زۆر ئاڵۆزبوون کە چیدی نەمدەتوانی ئەوە لەیەکدی جیابکەمەوە کە داخۆ چینۆ رێگای ئەوەی پێداوە یان نا. دواتر داوایکرد ئاڵوگۆڕ بەکارەکەی بکرێت، ئیدی پۆمبۆم لەم پۆستەدا دانا بەڵام سەبارەت چینۆ گورزێکی کاریگەرە.

ئەم بەیانییە ئێستگەکە لێدوانێکی باریانتۆس‌ی بڵاوکردەوە تیایدا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە من لەمێژە مردوم‌و ئەوەی کە دەربارەی بوونی من لێرە باسدەکرێت چیدی نییە جگە لەپڕوپاگەندە، بەڵام لەئێوارەدا خەڵاتی50000 دۆلار(واتە 4200 دۆلاری ئەمەریکی)بۆ هەر کەسێك تەرخانکرد کە زانیاریگەلێك بەردەستدەخات دەبێتە هۆی دیلکردنی‌من بەزیندویی یاخود مردویی. وادیارە هێزە چەکدارەکان(      )پێداوە.

فرۆکەکان بڵاوکراوەیان بەسەر ناوچەکەدا پەخشکرد کە لایەنی زۆر وێنەگەلی منی لەسەرەو ریکیتیریان وتی من بڕوام وایە خەڵاتەکەی باریانتۆس تەنهاجەنگێکی‌دەروونییەو هیچیتر، چونکە تۆکمەیی جەنگاوەران لای هەمووان ئاشکرایەو خۆیان بۆ جەنگێکی درێژخایان ئامادەدەکەن.

بەدووردرێـژیی قسـەم لەتـەك پـابلیتۆدا كـرد. ئـەویش وەكـی هاوڕێیـانیدی لەپچـڕان ونەمانی پەیوەنـدی نیگەرانـەو بـڕوای وایـە ئـەركی سـەرەكی ئێمـە لەنوێكردنـــەوەی پەیوەندییەكاندایــە بەشــارەوە، بــەڵام پێــداگریی لەســەر بــەدیهێنانی ئــەم دروشمــە كــرد:"نیشــتیمان یــان مــەرگ"بەهــەموو ئــەو قوربانیدانەوە كە ئەم دروشمە گەرەكێتی ودەیخوازێت.

## 12ی ئەیلول

رۆژمـان بـەم ڕووداوە تراژیـدیی ــ كۆمیدییـە دەسـتپێكرد: ڕێـك لەكاتـژمێر شەشیبەیانیدا، كە كاتی كـەرەنا لێدان و كۆكردنەوەیە، ئۆستاكیۆ هـات بـۆ لام بۆ ئەوەی لەهاتنی هەندێك هاتووان بەگوێ جۆگەكـەدا ئاگـادارم بكاتـەوە، منـیش سـەرجەم پیـاوانم كـۆكردەوەو هـەمووان خۆیـان بـۆ شـەڕ ئامـادەكرد. ئـانتۆنیۆ بەچـاوی خـۆی بینینـیو كاتێـك كـە دەربـارەی ژمارەیـان پرسـیارم لێكرد بەپێنج ئەنگوستیدەستی وەڵامیدایەوە. دواجار دەركەوت ئەوە تـەنها خەیاڵو وەهمگەل بوون كە بۆ سەر ورەگەلی تیمە بچوكەكەمان مەترسیدارن. دوابــەدوای ئــەم ڕووداوە پیاوەكــان دەســتیانكردە قســەكردن دەربــارەی شپرزەبوونوشڵەژانی دەروونیوئەقڵیی. لەدواییدا قسـەم لەتـەك ئـانتۆنیۆدا كـردو بەئاشـكرا وەكـی كەسـێكی ناسروشـتیی هاتەپێشچـاوم چـونكە دایـە پڕمـەی گریـانو پاشـان وتـی هـیچ شـتێك بیرو هـۆشمی سـەرقاڵ نـەكردووە، هەروەها وتی هۆكاری ئەمانە هەمووی بـۆ كـەم خـەویی دەگەڕێتـەوە، چـونكە دوابەدوای ئەو ڕووداوە كـە تیایـدا لەناوەندیچاودێرییەكەدا نووسـتو پێـی لەو تاوانەی خۆی نەنا، سزای شەش رۆژی پاسـەوانیی بـەردەوامی بەسـەردا سـەپێنرا. شـاباكۆ لەفـەرمانێك كـە پێیـدرابوو یـاخیبوو و بـەو هۆیەشـەوە مــاوەی ســێرۆژ پاســەوانیی بەســەردا ســەپێنرا بــەڵام لــەئێوارەدا منــی دۆزییەوەو داوایلێكردم سەردانی پێشڕەوەكە بكەم چونكە لەتەك ئانتۆنیۆدا

دانویان ناکوێت، منیش داواکەیم رەتکردەوە. ئانتی ولیۆن وئۆستاکیۆ بۆ پشکنینی ناوچەی جۆگەکە بەشێوەیەکی جدیی و کۆڵینەوە لەئەگەرو توانای گواستنەوە لەوێندەرەوە بۆ بەرەکەی تری زنجیرە چیایەکی بەرز کە لەدورەوەڕا دەردەکەوێت، دەرچوون. کۆکۆوئانیسیتۆوجۆلیۆش بەئاراستەی رووەو لای ژووری رووبارەکە دەرچوون بۆ سۆراخی خاڵگەلی پەڕینەوەو هۆکاری سەرکەوتوو بۆ کێشکردنی ولاخەکان ئەگەر بڕیاردرا لەوێندەرەوە درێژە بەرێکردنەکە بدەین.

وادیارەخەلاتەکەی باریانتۆس هەرایەکی گەورەی ناوەتەوە ... بەهەرحاڵ یەکێك لەرۆژنامەنووسەکان، ئەگەرچی کەسێکی خاوەن نیازیشە، بڕی4200 دۆلاری ئەمەریکی سەبارەت ئەو مەترسییەی کە من دروستی دەکەم بەکەم زانی. رادیۆی هاڤانا وتی رێکخراوی هاوکاریمیللەتانی ئەمەریکای لاتین نامەیەکی پشتگیری لەسوپای رزگاریخوازی نیشتیمانییەوە پێراگەیشتووە: ئای لەم بۆچوونە سەمەرانەی کە بلاودەکرێنەوە!

## 13ی ئەیلول

پشکنەرەکان گەڕانەوە: ئانتی وگروپەکەی بەدرێژایی رۆژ بەسەر بەرزایی رێرەوی جۆگەکەدا سەرکەوتن و لەناوچەیەکی بەرزو تارادەیەك ساردا لێی نووستن. جۆگەکە وادیارە لەزنجیرە شاخێکەوە هەڵدەقوڵێت کەوتووەتە بەرامبەرمانەوە بەئاراستەی خۆرئاوا - باکورداوشوێنی رێکردنی ولاخی نییە. کۆکۆوهاوڕێیانی ویستیان لەرووبارەکە بپەڕنەوە بەلام نەیانتوانی و بەرلەوەی بەم دۆڵی رووبارە بچوکە رابگەن: لایەنی زۆر رووباری بیسکایە، بەسەر 11 تاشەبەردی گەورەوبەرزدا سەرکەوتن. لەوێندەر هەندێك شوێنەواری ژیان و کێڵگەگەلی سوتاویان بینی و هەروەها گایەکیشیان دۆزییەوە. وتیان ولاخەکان دەبێت لەبەرەکەی ترەوە بپەڕنەوە دەنا مەگەر

کەڵـــەکێك دروســـت بکـــەین هـــەمووان بگوازێتـــەوە، لەدواییـــدا هەوڵیدروستکردنی ئەو کەڵەکە دەدەین.

قسـەم لەتـەك داریـۆدا کـردو پێمـوت ئەگـەر دەتـەوێت دەتوانیـت لای ئێمـە جێبهێڵێتوبڕۆیت. لەسەرەتادا بەوە وەڵامیدامەوەو وتـی کشـانەوە مەترسـی زۆری تیادایە، بەڵام من ئەوەم تێگەیاند کە جەنگیپارتیزانیی داڵدەو پـەناگا نییەو، ئەگەر بڕیاری مانەوەبدەیت، دەبێـت تاکۆتـایی جەنگەکە بمێنیتـەوە، ئـەویش قـایلبوو بـەوەو بەڵێنی ئەوەیدا کـە خـۆی چـاکبکات. بـابزانین چـۆن دەبێت.

گرنگترین هەواڵ کە لەئێستگەکەدا بڵاوکرایەوە ئـەو گورزەبـوو کـە ئاراسـتەی دۆبـــریەی بـــاوك کـــراو دەســـت بەســـەر هـــەموو دۆکیومێنـــتو بەڵگەنامـــە بەراییەکانی سەبارەت داکـۆکی لـەدۆبریەی کـوڕدا گیرا کـە دەربـارەی خـودی خۆی ئامادەی دەکات، ئەم دەستگرتنەش بەبیانووی ئـەوەی نایانـەوێت ئـەم داکۆکییە بەرەو پڕوپاگەندەیەکیسیاسی وەربچەرخێت.

## 14ی ئەیلول

رۆژێکی پڕ لەماندوێتییە. لەکاتژمێرحەوتدا میگیل لەتـەك سـەرجەم پیـاوانی پێشـڕەو و هـەروەها لەتـەك نـاتۆدا دەرچـوو و فـەرمانی ئـەوەیان پێبـوو درێـژترین مـاوە کـە لـەتوانادابێت لـەم بەرەیـەوە ببڕنو کەڵـەکێك لـەو جێیـەدا دروسـتبکەن کـە پەڕینـەوە لـەو شـوێنەوە دژوارە. ئـانتۆنیۆ لەتـەك هـەموو پیـاوانی پاشـەوەدا لەبۆسـەکەدا مایـەوە. دووچـەك لـەجۆریم ـــ 1 مـان لەئەشـکەوتێکی بچـوکدا شـاردەوە کـە نـاتۆویلـی شـوێنەکەی پێـدەزانن. کاتـژمێر بـووە یـەكونیو و هـیچ هـەواڵێکمان لەهاوڕێیانـەوە پێرانەگەیشـت ئیدی ئەو دەمە بڕیاری ڕێکردنماندا. نـەمانتوانی سـواری هێسـترەکان بینو، وێڕای رەبۆکەم، ناچاربووم ولاخەکە بدەمە لیۆنو بـەپێ درێـژە بەرێکردنەکە

بدەم. پیاوانی دواوە فەرمانی ئەوەیان پێدرا لەکاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆدا خۆیان بۆ سەفەر ئامادەبکەن. تەنها لەبارێکدا نەبێت ئەویش ئەگەر فەرمانێکی پێچەوانەیان پێبدرێت. پابلیتۆ لەدەوروبەری ئەو کاتەدا گەیشتەجێ و وتی گاکە لەبەرامبەر خاڵی پەڕینەوەی وڵاخەکاندایەو پیاوەکانیش لەجێیەکدا کە دەکەوێتە دوریی کیلۆمەترێك لێرەوە خەریکی دروستکردنی کەڵەکێکن.

چاوەڕوانی هاتنی وڵاخەکانم کرد بەڵام زۆریان پێچوو و تەنها لەکاتژمێر شەش وچارەك ودوای ئەوەی هەندێك لەپیاوانم بەشوێنیاندا نارد ئەوجا هاتن. ئەوەبوو دووهێسترەکەو(هەروەها گایەکیش)لەرووبارەکە پەڕینەوەو ئێمەش رووەو ئەوشوێنە کە کەڵەکەکەی تیادا دروستکرا بەخاویی درێژەماندا بەرێکردن. لەوێندەر12 پیاو هەبوون هێشتا لەرووبارەکە نەپەڕیبوونەوەو10 پیاویش چوبوونە بەری ئەوبەر. بەمجۆرە شەومان دوور لەیەکدی بەسەربردو دوایین ژەممان لەگۆشتی گاکە خوارد کە خەریکبوو بۆگەن بکات.

بەرزایی:720 مەتر.

## 15ی ئەیلول

ئەو ماوەیەی کە بڕیمان کەمێك دوورودرێژبوو: 5 ـ 6 کیلۆمەترێك بوو، بەڵام بەرووباری بیسکا رانەگەیشتین چونکە دووجار ناچاربووین وڵاخەکان ناچار بەپەڕینەوە بکەین و هێسترێکی مێینەش لەپەڕینەوە مانیگرت. تەنها پەڕینەوەیەکمان ماوە بابزانین هێسترەکان ئەمجارە بەگوێمان دەکەن.

ئێستگەکە دەستگیرکردنی لۆیۆلای راگەیاندو پێموابێت بەهۆی وێنەکانەوەیە. ئەو گایەی کە مابوومان مرداربووەوە، بەڵام بێگومان بەدەستی جەللاد.

بەرزایی:780 مەتر.

## 16ی ئەیلول

ئەمرۆکەمان لەدروستکردنی کەڵەکێك و پەڕینەوە لەرووبارەکە بەسەربردو تەنها نزیکەی500 مەترێك و بەرەو ئەو خێوەتە رێمانکرد کە لەنزیك سەرچاوەیەکی ئاوی بچوکەوە هەڵماندابوو. پرۆسەی پەڕینەوەکە بێ هیچ رووداوێك و لەسەر کەڵەکێکی تۆکمە کە لە هەردوو بەری رووبارەکەوە بەهۆی گوریسەوە رادەکێشرا، کۆتاییهات. دواجار کاتێك ئانتۆنیۆ وشاباکۆمان بەتەنیا بەجێهێشت دەمەقاڵێیەکی دیکە لەنێوانیاندا روویداو ئانتۆنیۆ بەتۆمەتی سوکایەتی پێکردن سزای شەش رۆژی بەسەر ئەوی دیدا سەپاند. ئەگەرچی لەراستیی ئەم بڕیارە بەدگومانیش بووم بەڵام رێزم لێنا. لەئێوارەشدا رووداوێکی تر روویدا سەروەختێك ئۆستاکیۆ ناتۆی بەخواردنی ژەمەخواردنێکی دی تۆمەتبارکرد، دواتر دەرکەوت خواردنەکەچەرمی بەرازێکی کەوڵکراوبوو. بەم چەشنە خواردن هۆکارێك بوو لەگرژبوونی هەڵوێستەکەدا. بەهۆی نەخۆشیی پزیشکەکەو ئەو توانج وپلارە هەمەجۆرانەی لەپاش هەندێك سەرنج و تێبینیی جۆلیۆ لەلایەن جەنگاوەرانەوە دەدرێن، گرفتێکی دیکەم بۆ دروستبوو. هەموو ئەمانە وەکی شتگەلێکی بێبایەخ پێشچاودەکەون.

بەرزایی:820 مەتر.

## 17ی ئەیلول

پابلیتۆ.

رۆژم لەچارەسەری نەخۆشەکاندا بەسەربردو چەند ددانێکم بۆ ئارتۆرۆ وشاباکۆ هەڵکێشا. میگیل ئەو ناوچەیەی پشکنی کە بەرەو رووبارەکە درێژدەبێتەوەو بینینیۆش رێگاکەی بەسەرکردەوە. دواتر

پێیانراگەیاندم هێسترەکان دەتوانن درێژە بەرێکردنەکە بدەن بەلآم پێش ئەوە ناچاردەبن بەمەلە لەرووبارەکە بپەڕنەوەو بپرۆن وبێن. بەهۆی جەژنی لەدایکبوونی پابلیتۆوە کەمێك برنجمان لێنا..ئەمرۆکە تەمەنی بووە بیست ودوو ساڵ و بچوکترین پیاوی نێو ریزەکانمانە.
رادیۆکە هیچ دەنگوباسێکی تازەی تیادانییە تەنها دواخستنی دادگاییەکەو نارەزایی دەربڕینی لۆیۆلاگۆزمان نەبێت بەهۆی دەستگیرکردنی دۆبرێوە.

## 18ی ئەیلول

لەکاتژمێرحەوتدا رێکردنمان دەستپێکرد و هێشتا ماوەیەکی کەممان بڕیبوو میگیل بەپەلە هات بۆ ئەوەی ئەوەمان پێرابگەیێنێت کە لەسەرەولێژییەکەدا سێ جوتیاری بینیوەو لەوە دڵنیانییە کە ئەوان ئێمەیان نەبینیوە. فەرمانم پێدا دەستگیریان بکات. شاباکۆ ئاژاوەیەکی باوی نایەوە کاتێك ئارتۆرۆی بەدزینی 15 گوللە لەمەخزەنەکانی وی تاوانبارکرد. دروست مرۆڤێکی سامناکە...تاکە لایەنی باش لەم گرفتەدا ئەوەیە کە بۆلیڤییەکان هیچ گوێی پێنادەن، ئەمە وێڕای ناکۆکی بەردەوامی لەتەك کوباییەکاندا. هێسترەکان هەموو ماوەکەیان بەبێ پێویستیبوون بەمەلەکردن بڕی بەلآم لەکاتێکدا کە خەریکی پەڕینەوە بووین لەرێڕەوی رووبارەکە هێسترە رەشەکە لەدەستمان هەڵهات و لەدووریی 50 مەتر لەولامانەوە سەرسمیداو کەمێك گیانی روشا.
چوار جوتیارمان دەستگیرکرد کە لەتەك گوێدرێژە بچوکەکەیاندا بەرەو بیرایبندی دەچوون، لەرووبارێکی بچوکەوە کە دەکەوێتە دوریی کاتژمێرێك لێرەوە بەئاراستەی بەرەو بەرزایی رووبارەکەدا، جوتیارەکان پێیان وتین ئالادینۆ گۆتییێریز لەتەك پیاوەکانیدا لەرۆخەکانی ریۆگراندی دامەزراوە کە لەوێندەر خەریکی شکاری باڵندەو راوە ماسیین. بینینیو کارێکی زۆر بێئەقلآنەی کرد کاتێك دەرفەتیدا بەجوتیارێك وخێزانەکەی و هەروەها

جوتیارێکی‌دیکـەش کـە ئـەویان بینیبـوو، درێـژە بەرێکردنەکـەیان بـدەن‌و بێئەوەی دەستگیریان بکات لێی‌بدەن‌و بڕۆن. سەروەختێك ئـەوەم پێراگەیانـد زۆر توڕەبـوم‌و وتم ئـەو کـارە ناپاکییـەکی ئاشـکرایە، ئیدی بینینیـۆ بـەکوڵ دەستیکرد بەگریان. ئەوەمان بەسـەرجەم جوتیارەکان راگەیانـد کـە سبەینێ هەمووتان لەتەکماندا دێن بۆ زیتـانۆ، واتـە بـەرەو ئـەو کێڵگەیـەی کـە تیایـدا نیشـتەجێن‌و دەکەوێتـە دوریـی شـەش یـاخود هەشـت کاتـژمێر رێکـردن لێـرەوە. دواتـر ئـالادینۆو هاوسـەرەکەی خۆیـان دزییـەوەو تـەنها لـەپاش زەحمەتێکی زۆر ئەوجا توانیمان بەوە قایلیان بکەین کە هەندێك خواردنمان پێبفرۆشن.

هەرئێسـتا ئێسـتگەکە هەواڵی‌ئـەوەی بلاوکـردەوە کـە لۆیـۆلا (لەترسـی تۆڵەسـەندنەوەی جـەنگاوەران)دوو هـەوڵی بـۆ خۆکوشـتن داوە، هـەروەها هەواڵی دەستگیرکردنی ژمارەیەك لەمامۆستای هاوسۆزی ئێمە، ئەمە ئەگەر لەبەشدارانیش نـەبن، بلاوکـردەوە. گومـان لەوەدانییـە شـتگەلێکی زۆریـان بەلۆیـۆلا گرتـووە بـەڵام هـیچ لـەوە سـەرم ناسـوڕمێت ئەگـەر بـزانم هۆکـاری ئاشکرابوونی تۆڕەکەمان ئەو وێنەگەلانەیە کە لەئەشکەوتەکەدا دۆزرانـەوە. فرۆکە بچوکەکەو فرۆکەیـەکی(مۆستانگ)بەشێوەیەکی جێی‌گومان‌و لەگـەڵ داهاتنی‌تاریکیدا دەستیانکردەوە بەهەڵفڕین بەسەر ناوچەکەدا.

بەرزایی:800 مەتر.

## 19ی ئەیلول

بـەیانی‌زوو رێمـان نـەکرد چـونکەجوتیارەکان ولاخـەکانیان بزرکـرد. دواجـار لەتـەك کـاروانی دیلەکانـداوپاش ئـەوەی قسـەگەلی گەرم‌وخۆشـم بـۆ کـردن رێکردنمـان دەسـتپێکرد. مـن‌ومـۆرۆ بـەخاویی رێمـانکردو سـەروەختێك گەیشتینە شوێنی‌چەمانەوەی رووبارەکە بۆمان دەرکەوت کە سێ‌دیلی دیکـە هـەن‌و، ماوەیـەکی کـەم پـێش ئێسـتا پیـاوانی پێشـڕەو لـەرێگادا بـەرەو

کێڵگەیەکی برشت بەقامیشیشەکر پێشڕەوییان کردووە کە دووکاتژمێر ڕێکردن لێرەوە دوورە. ڕێگای بەرەو ئەو کێڵگەیە دوربوو. لەدەوروبەری کاتژمێر نۆی ئێوارەدا گەیشتینە کێڵگەکە کە لەراستیدا کێڵگەیەکی بەقامیشیشەکر چێنراوەو پیاوانی پێشڕەویش لەدوای ئەم وادەیە هاتن.
سەبارەت هەندێك خاڵگەلی لاوازی تایبەت بەخواردن قسەم لەتەك ئانتیدا کرد ئەویش زۆر بەتەنگییەوە هاوبۆچوونم بوو و، وتی لەیەکەمین کۆبوونەوەماندا رەخنەیەکیخۆیی وئاشکرای خۆم دەکەم، بەڵام هەندێك لەو تۆمەتانەی رەتکردەوەو وتی راستنین. ئەمێستا لەبەرزایی1000 مەترەوە چووینەتە بەرزایی1440مەترو لەماوەی سێکاتژمێر یاخود چوارکاتژمێر ڕێکردن بەوتەی بەدبینان، بەلۆسیاتانۆ رادەگەین. دواجار گۆشتی بەرازمان خواردو هەرچی ئەو پیاوانەشە کە حەزیان لەشیرەمەنییە ئەوانیش لە(شانکاکا)یان خوارد.
ئێستگەکە بەدوورودرێژیی باسی لەمەسەلەکەی لۆیۆلا کردو وادیارە مامۆستاکان مانیان گرتووە، هەروەهاخوێندکارانی ئەو قوتابخانە ناوەندییەش، کە هیگێراس کە یەکێکە لەگیراوەکان، وانەی تیادا دەڵێتەوە، مانیان لەنانخواردن گرتووە...هەروەها وادیارە کرێکارانی نەوتیش دوابەدوای دامەزراندنیکۆمپانیای نەوت خەریکیئەوەن مانبگرن.
یەکێك لەنیشانەکانی ئەم قەیرانە ئەمەیە: مەرەکەبم نەماوە.

## 20ی ئەیلول

بڕیارماندا لەکاتژمێر سێی پاش نیوەرۆدا درێژە بەرێکردنەکە بدەین تاوەکو بتوانین بەر لەداهاتنی تاریکی بەکێڵگەی لۆسیتانۆ رابگەین، پێشانیش پشکنەران ئەوەیان پێراگەیاندم کە گەشتەکە ماوەی پتر لەسێ کاتژمێر ناخایەنێت. بەڵام هەندێك ئاستەنگی کتوپڕ سەفەرەکەمانی تاوەکو

کاتژمێرپێنج دواخست و بەتاریکی بەسەر ڕێگای تەپۆلکەکەدا سەرکەوتین و بەمەبەستی پەلەکردن لەڕێکردندا پلێتەیەکمان پەیکرد بەڵام ئەم هەوڵەمان دادی نەدا چونکە پێش کاتژمێر یانزە بەماڵی ئالادینۆ گۆتیێرێز ڕانەگەیشتین و تەنها هەندێك جگەرەو شتگەلی دیکەش نەبێت هیچیئەوتۆی نەبوو کە شایانیکڕین بێت. هیچ پۆشاکێکمان لا بەدی نەکرد و بەمجۆرە کەمێك لێیخەوتین بۆ ئەوەی لەکاتژمێر سێی بەیانیدا بەرەو ئاڵتۆسیکۆ کە دەکەوێتە دوورییچوار کاتژمێر ڕێکردن لێرەوە، درێژە بەرێکردنەکە بدەین. دەستمان بەسەر تەلەفونیموختارەکەدا گرت بەڵام دەرکەوت لەوەتەی چەند ساڵێکە لەکارکەوتووەو هێڵەکە بڕدراوەو زانیاری ئەوەشمان دەستگیربوو کە موختارەکە ناوی فارگاسەوە لەوەتەی ماوەیەکی کەمە کراوەتە موختار. ئێستگەکان هیچ هەواڵێکی گرنگیان بڵاونەکردەوە..ئەمێستا گەیشتوینەتە بەرزایی1800مەترو پێشان لەلۆسیتانۆ بەرزاییمان1400 مەتربوو. ماوەی نزیکەی دووکاتژمێر ڕێمانکرد تاگەیشتینە کێڵگەکە.

## 21ی ئەیلول

لەکاتژمێر سێدا، لەژێر تریفەی ڕۆشنیمانگداو، لەسەر ڕێیەك کە پێشان پشکنرابوو دەرچووین و تادەوروبەری کاتژمێرنۆ ڕێمانکرد و توشی هیچ نەبووین و، بەبەرزایی2040مەتر ڕاگەیشتین کە بەرزترین شوێنە تائێستاکە پێیراگەیشتوین. لەوێندەر چاومان بەدووشوان کەوت و ڕێگای ئاڵتۆسیکۆیان پیشاندایین، دەرکەوت دوو کاتژمێری دیکەمان لەپێشەوەیە، شەو وڕۆژ بەوێنەی بروسکە ڕێمانکرد و تەنهاماوەی دووکاتژمێر ڕێکردنمان بڕی. سەروەختێك بەسەرەتای ئەو خانووانە ڕاگەیشتین کە دەکەونە سەرەتای سەرەولێژبوونەوەکەوە هەندێك خواردنمان کڕی وبۆ نانخواردن بەرەو ماڵی موختارەکە ڕێمانکرد..دواتر توشی ئاشێکی گەنمەشامیی

بـــــووین کـــــه بـــــههێزی ئـــــاو کاردهکـــــاتو کهوتووهتـــــه گـــــوێی بیرامیری(1400مـهتر)ەوه، خەڵکەکەی زۆر ترسانو ویستیان لـه دەستمان هـەڵبێن. ئێمـەش بەهۆی کەم جوڵەییەوه کاتێکی بێشومارمان لەکیسچوو، چـونکه ئـەو دوو فەرسـەنگەی بـەرەو ئاڵتۆسـیکۆمـان بەنزیکـەی چـوار کاتژمێرونیو بڕی(لەکاتژمێر 12,30بۆ کاتژمێر5).

## 22ی ئەیلول

کاتێـك کـه ئێمـه ــ گرووپـی ناوەراسـت ــ بـەئاڵتۆسـیکۆ راگەیشـتین بۆمـان دەرکـــەوت کـــه موختارەکـــه دوێنێشـــەو لـــەماڵ دەرچـــووەو چـــووه لای دەسـەڵاتداران خەبـەرمان لێبـدات، ئیـدی ئێمـەش وەکـی تۆڵەسـەندنەوەیەك پـەلاماری کۆگاکەیمانـداو دەستمان بەسـەر شتومەکانیدا گـرت. ئاڵتۆسـیکۆ گوندێکی‌بچـــوکه لـــه50 مـــاڵ پێکهـــاتووەو لەبـــەرزایی1900 مـــەتردا دروســـتکراوه..دانیشـــتوانەکەی بەئاوێتەیـــەك لەترسوخۆتێهەڵقورتانـــەوه پێشوازییان لێکردین. ئامێری ئازوخەخستن بەباشی کەوتووەته گەڕ، لەنێو خێوەتەکەمانـــدا ـــــ کـــه بریتییـــه لـــەکوختێکی‌جێهێڵراو و دەکەوێتـــه سەرچاوەیەکی ئـاوەوە ـ بڕێکـی زۆر لـەخۆراكو ئازوخـه لەماوەیـەکی کەمـدا گردبـووەوه. ئۆتۆمبیلـه بارهـەڵگره بچـوکەکه لەگەشـتەکەی بـۆ قالیێ‌گرانـدی نەگەڕایەوه ئەمەش بەڵگەی ئەوەیه که دروست موختارەکه چووه خەبـەرمان لێبدات. هاوسـەرەکەی بەشینو گریانـەوه هاتو دەستیکرده پاڕانـەوه لـێمو تکای ئاسمانو منداڵەکانی لێکردم تاوەکو پارەی ئـەو شتومەکانەی پێبـدەم کـه لەکۆگاکـه بردمـان بـەڵام بـەهیچ جۆرێـك مـن قایـل نـەبوومو داواکـەیم رەتکـــردەوه، لـــەئێوارەدا ئـــانتی لـــەهۆڵی قوتابخانەکـــەدا(پـــۆلی یەکەمودووەم)کۆبوونەوەیەکی ئەنجامداو تیایدا ئامانجەکانیشۆڕشەکەمانی بـــۆ دەســـتەیەك لـــەجوتیاران کـــه واقیـــان وڕمـــابوو و متـــەقیان

نەدەکرد(ژمارەیان15کەس بوو) شرۆڤەکرد و، مامۆستای گوندەکە تاکە کەس بوو داوای قسەکردنی کرد تاوەکو لەو بارەیەوە پرسیاربکات کە ئایا ئێوە لەدێهاتەکاندا شەڕ دەکەن، ناوبراو ئاوێتەیەکە لەجوتیارێکی فێڵبازی خوێندەوارو، منداڵێکی بەستەزمان، کۆمەڵێکی زۆر پرسیاری سەبارەت سۆشیالیزم کرد. یەکێك لەمێردمنداڵەکان داوایکرد رێبەریمان بکات بەلام لەو مامۆستایە هۆشداری کردینەوە کە خەڵکی ناوچەکە بەرێوی ناویدەبەن.
لەکاتژمێر یەك ونیودا بەرەو سانتائیلینا رێمانکردو لەکاتژمێر دەدا گەیشتینە ئەوێندەر.
بەرزایی:1300 مەتر.
باریانتۆس وئۆفاندۆ کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانییان ئەنجامداو لەماوەی کۆنگرەکەدا سەرجەم ئەو زانیارییانەیان پێشچاوخست کە لەبەڵگەنامە دەستبەسەرگیراوەکانەوە دەستگیریان بوبوو وتیان گروپەکەی جواکین تەفروتوناکرا.

## 23ی ئەیلول

خێوەتەکەمان لەکێڵگەیەکی سەرنجراکێشی پرتەقاڵدا هەڵدا کە بەروبومەکان بەدرەختەکانییەوە شۆڕبوونەتەوە خوارەوە، دوابەدوای پاڵپشتیکردنیپاسەوانییهەموو رۆژمان بەپشو و خەوتنەوە بەسەربرد.
لەکاتژمێر یەکدا هەستاین بۆ ئەوەی لەکاتژمێر دوودا رووەو لۆمالارگا بەرێبکەوین کە لەسپێدەو لەبەرزایی1800مەتردا پێیراگەیشتین و پیاوەکان کەلوپەل وکۆڵ باری گرانکردبوون و رێکردنەکەش خلیچکبوو منیش لەلایەنی خۆمەوە بەهۆی ئەوخواردنەوە کە بینینیۆ ئامادەیکرد دوچاری بەدهەرسیی بووم.

## 24ی ئەیلول

گەیشتینە گوندێکی بچوك کە لۆمالارگای پێدەڵێنو، من دوچاری نۆبە ئازارێکی جگەرو رشانەوە بووم، رێکردنێکی زۆرودوورودرێژ پیاوەکانی شەکەتکرد. بڕیارمدا شەو لەسەر رێگای بەیەکگەیشتن لەتەك بۆجیۆدا بەسەرببەینو پیاوەکان بەرازێکیان سەربڕی لەو تەنها پیاوەمان کڕی کە لەسۆستیتۆس فارگاس لەماڵەکەیدا مابووەوە...هەرچی ئەوانی دیکەشە هەڵهاتن.

بەرزایی:1400مەتر.

## 25ی ئەیلول

بەیانی شەبەقی گەیشتینە بۆجیۆو لەوێندەر توشمان بوو بەتوشی خەڵکانێکەوە کە شەوی دوێنێ چاویان پێمان کەوتبوو، بەدەستەواژەیەکی دی رادیۆ پامبا(28)جاری لێدابووینو ئاشکرای کردبووین، بۆجیۆ گوندێکیخنجیلانەیە دەکەوێتە سەر بەرزاییەكودانیشتوانەکەی باشن.. لەسەرەتادا کە چاویان بەئێمە کەوت هەڵهاتن بەڵام لەدواییدا پەیتاپەیتا لێمان نزیکبوونەوەو هەڵسوکەوتێکی باشیان لەتەکدا کردین. لەسپێدەدا یەکێك لەپیاوانی قەناس دەرچوو کە پێشان لەسیرانۆوە بەرەو شۆکیزکاو بۆ دەستگیرکردنی پیاوێك هاتبوو کە قەرزداربوو و قەرزەکانی نەدەدایەوە. ئەمێستا ئێمە ئەوەتاین لەسەر دووڕیانی سێ پارێزگاو رێکردنەکەمان لەتەك هێسترەکاندا چیدی مەترسیداربووە بەڵام ناچارم بەکاریانبهێنم تاوەکو پزیشکەکە بتوانێت لەباشترین هەلومەرجی پێویستدا کە لەتوانادابێت سەفەربکات لەبەرئەوەی زۆر سستولاواز بووە. جوتیارەکان پێیان وتین سوپامان لەم ناوچەیەدا نەبینیوە. بەشێوەیەکی پچڕپچڕ رێمانکرد

تاگەیشتینە ترانکامایۆو لەوێندەر لەرێ لاماندا و لێی نووستین چونکە میگیل، وەکی مشورخواردنێك، ئەو رێوشوێنانەی وەبەرنەگرت کە داوام لێیکرد. بۆمان دەرکەوت کە موختاری هیگیراس لەناوچەکەدایە هەربۆیە فەرمانمدا بەپاسەوانان کە دەستگیری بکەن.

بەرزایی:1800مەتر.

من وئانتی قسەمان لەتەك کامبادا کردو لەسەر ئەوە رێککەوتین کە بەرەو هیگیرا کە شوێنێکە لەنزیك بۆکاراو...دەتوانێت لەوێندەرەوە بەرەو سانتاکروز بڕوات لەتەکماندا بێت.

## 26ی ئەیلول

شکست. لەسپێدەدا گەیشتینە بیکاشۆولەوێندەر سەرجەم دانیشتوان جەژنیان دەکرد، بەو هۆیەشەوە بەبەرزترین بەرزایی:2280مەتر راگەیشتین کە تائێستاکە پێیراگەیشتوین. جوتیارەکان بەباشی رەفتاریان لەتەکدا کردین و، بێ هیچ ترس ودودڵییەك کە شایانی باس بێت درێژەماندا بەرێکردنەکەمان، ئەگەرچی ئۆفاندۆ لەلێدوانێکیدا وتبوی دیلکردنم لەچەند ساتێکی دیاریکراودا بووەتە مەسەلەیەکی بێچەندوچون. سەروەختێك بەهیگیرا راگەیشتین هەموو شتێك گۆڕا، چونکە پیاوەکان هیچیان دیارنەمان و لەنێو شارۆچکەکەدا تەنها ژن وئافرەتمان بینی. کۆکۆ بەرەو سەنتەری پۆست وتەلەفونەکە رۆیشت و لەوێندەر نووسراوێکی دەستگیربوو بەرواری بیست ودووی مانگی لەسەربوو لەلایەن جێگری حاکمی ڤالیێ گراندیەوە رەوانەی موختاری ناوچەکە کرابوو و تیایدا لەبوونی هەندێك جەنگاوەر لەناوچەکەدا ئاگاداری دەکاتەوەو داوای لێدەکات لە هەر گۆڕانکارییەکی تازە ئاگاداری بکاتەوەو ئەویش ئامادەیە خەرجیی تێچوونەکان لەئەستۆبگرێت. کابرای موختار هەڵهاتبوو بەڵام هاوسەرەکەی

پێیوتین ئەمرۆکە تەلەفونەکە بەکارنەهێنراوە چونکە(جاگای)کە گوندەکەی هاوسێمانە، جەژن دەکەن.

پیاوانی پێشڕەو لەکاتژمێر یەکدا بەنیازی راگەیشتن بەجاگای و بۆئەوەی لەوێنەدەر بڕیار سەبارەت هێسترەکان و پزیشکەکە بدەن دەرچوون...دوابەدوای ئەوە بەماوەیەکی کەم من سەرقاڵی قسەکردن بووم لەتەك تاکە پیاوی گوندەکەدا کە لەبینینی من زەندەقی چوبوو کاتێك کە بازرگانەکەی کۆکا هات و وتی هەر ئێستا لەڤالییگراندی وبۆکاراوە هاتوم و هیچم بەدی نەکردووە. هەروەها زۆر دەمارگیرو توڕەشبوو منیش پێموابوو کە بەهۆی بوونی ئێمەوەیە لەناوچەکەدا.. ئیدی، ئەگەرچی درۆشیان کرد، بەلام وازم لێهاوردن ورۆیشتن. سەروەختێك بەرەو لوتکەی قەدپاڵەکە سەرکەوتم، کاتژمێر دەوروبەری یەك ونیو دەبوو، دەنگیچەند تەقەیەك لەشاخەکەوە هاتەبەرگوێم، دەسبەجێ زانیم پیاوەکانمان کەوتونەتە نێو بۆسەوە. لەچاوەڕوانیی هاتنەوەی ئەوانەدا کە لەبۆسەکە رزگاریان بووە دەستمکرد بەرێکخستنی بەرگری لەگوندە بچوکەکەداو تاکە دەروازەی دەرچوونمانم دیاریکرد کە ئەویش رووەو ریۆگراندی دەچێت. لەدوای چەند ساتێك بینینیۆ بەپێکراوی گەڕایەوەو پاشان ئانیسیتۆوپابلیتۆ کە لاقی پێکرابوو بەشوێنیدا هاتنەوە. هەریەك لەمیگیل وکۆکۆ وجۆلیۆ کوژران و کامباش دوای ئەوەی کەلوپەلەکانی فڕێدا، شوێنبزر بوو. پیاوانی دواوە بەخێرایی و بەگوێ رێگاکەدا دەرچوون و منیش کە دوو هێسترم بەدوای خۆمدا کێشدەکرد شوێنیان کەوتم..هەرچی ئەو پیاوانەشە کە لەپاشمانەوە بوون بەهۆی ئەو تەقانەوە کە لێیان دەکرا بەجێمان، هەروەها ئانتیش بەتەواوی پەیوەندی پێمانەوە پچڕا. ماوەی نیوکاتژمێر لەبۆسەیەکی بچوکدا چاوەڕوانی ئانتیمان کردو بەرپەرچی هێرشێکی دیکەمان دەدایەوە کە لەبەری شاخەکەوە دەکرایە سەرمان، نەماندەتوانی لەوە زیاتر

چاوەڕێبکەین ئیدی بڕیارماندا جێیبهێڵین بەڵام پاش ماوەیەك پەیوەندی پێوە کردینەوە..کتومت لەم کاتەدا لیۆنمان لێ بزربوو و نەماندۆزییەوەو ئانتی وتی کەلوپەلەکانیم بینیوە لەگوێ ئەو ڕێگایەوە کە بێگومان وەبەری گرتووە، فرێدراوە. دروست لەدواییدا پیاوێکمان بینی بەخێرایی بەنێو دۆڵەکەدا ڕێی دەکردو بڕوامان وا بوو کە ئەوە لیۆنە، لەتەقەللایەکدا بۆ چەواشەکردنی دوژمن سەبارەت ئاراستە ڕاستەقینەکەمان لێگەڕاین هێسترەکان ڕووەو لای خوارەوەی دۆڵەکە بڕۆن و بەنێو دۆڵێکی تەنگەبەردا کە هەندێك ئاوی تاڵی تیادایە درێژەماندا بەرێکردنەکە. لەکاتژمێر دوانزەداو لەپاش دژواربوونی پێشڕەویکردنمان لەجێیەکدا لێی نووستین.

## 27ی ئەیلول

لەکاتژمێر چواردا درێژەماندا بەرێکردنەکە بەڵکو بتوانین شوێنێك بدۆزینەوە کە بتوانین لەرێگایەوە لەدۆڵەکە دەربچین، لەدەوروبەری کاتژمێرحەوتدا لەکارەکەماندا سەرکەوتوبووین، بەڵام لەبەرەکەی دیکەدا دۆزیمانەوە کە لەبەرامبەرماندا بەرزاییەکی ڕوتەن هەبوو دیمەنەکەی بۆنی بێدەنگیی و هێمنیی لێدەهات. کەمێك بەئاراستەی دارستانێکی بچوکدا سەرکەوتینە سەرەوە کە تیایدا خۆمان لەفرۆکە شاردەوەو ڕێیەکمان لەسەر بەرزاییەکەدا دۆزییەوە بەدرێژایی ڕۆژی ئەمرۆ مرۆڤ گوزەری پیادا نەکردووە. کاتێك شەوداهات جوتیارو سەربازێك بەرەو نیوەی قەدپاڵەکە سەرکەوتن و پاشان کەمێك لەوێندەر لایانداو ئێمەیان نەبینی. پێشان ئانیسیتۆ لەگەڕانێکی پشکنین گەڕابووەوەو لەماڵێکی نزیك لێرەوە گروپێکی ژمارە زۆر لەسەربازانی بینی...ئەو جێیە باشترین ڕێبوو بۆ ئێمە بەڵام لێماندا خرا..لەبەیانیدا پۆلێك لەسەربازانمان بینی بەسەر گردێکی تەنیشت ئێمەدا سەردەکەوتن و سەربازەکانی لەژێر تیشکی خۆرەتاودا

خەریکی گواستنەوەی شتگەل بوون، لەنیوەرۆدا گوێمان لەهەندێك تەقەی پچڕپچڕو هەندێك دەستڕێژو هاوارکردنێکیبەمجۆرەبوو: "ئەوەتا لەوێدا، وەرە دەرەوە لەویا، دێیتە دەرەوە یان نا؟"ئەمە هاوڕا بەهەندێك تەقە. نەمانزانی چارەنووسی پیاوە راوەدونراوەکە چیبوو و بڕوامان وا بوو کە ئەو پیاوە کامبایە. لەگەڵ تاریك داهات لەهەوڵێکدا بۆ راگەیشتن بەئاو لەبەرەکەی دییەوە دەرچووین بەلام خۆمان لەنێو دەوەنێکی ئێجگار چڕدا بینییەوەو...دوای ئەوەی توشمان بوو بەتوشی بەرزاییەکی هەردی ئێجگار سەختەوە، ناچاربووین ئاو لەدۆڵەکە بهێنین.

ئێستگەکە باسی لەپێکدادانەکەمان لەتەك بەتالیۆنەکەی گالندۆو کوژرانی سیان لەهاوڕێیانی ئێمەی کرد دواتر لاشەکانیان بەرەو ڤالییگراندی دەگوێزرێنەوە بۆ ئەوەی بزانرێت کێن. وادیارە هیچ کام لەکامبا و لیۆنیان دەستگیرنەکردووە. ئەمجارە زیانەکانمان گەورەوگران بوو و لەهەمووشیخراپتر کوژرانی کۆکۆبوو..بەلام میگیلوجۆلیۆش هەر دیسان دوو جەنگاوەری ئازاو سەرنجراکێش بوون، پێموابێت بەهای مرۆیی ئەو سێپیاوە بێسنورو بێئەندازەیە.

لیۆن وێنەکێشانونیگارکردنیدەزانی.

بەرزایی:1400مەتر.

## 28ی ئەیلول

رۆژێکە لەنیگەرانیودڵەراوکێی ئێجگار زۆر، بڕوامان وا بوو ئەمە دوایین رۆژمانە. لەکازیوەدا ئاومان هاوردو دەسبەجێ دوای ئەوە ئانتیوویلی بۆ پشکنینی سەرەولێژییەکی دیکە دەرچوون کە بەرەو دۆڵەکە دەچێت بەلام پاش ئەوەی رێیەکیان بەدیکرد ئەو تەپۆلکەیەی بەرامبەر ئێمە دەبڕێتو لەوێندەر جوتیارێکیان بەسواری ئەسپەکەیەوە بینی هەر خێرا گەڕانەوە.

لەکاتژمێر دەدا40 سەرباز لەو جێیەوە تێپەڕین کە دەکەوێتە بەرامبەرمان، سەربازەکان کەلوپەل و بارەکانیان بەکۆڵەوەبوو و هێندە بەخاویی دورکەوتنەوە وامدەزانی سەدەگەلێکیان پێچووە. لەکاتژمێر دوانزەدا گروپێکی دی کە لە77 سەرباز پێکهاتبوو بەناوچەکەدا تێپەڕین و ئەوەی کە بارودۆخەکەی ئاڵۆزترکرد گوللەیەك بوو کە تەقێنرا، ئیدی سەربازەکان دەسبەجێ لەپێگەکانیاندا دامەزران. ئەفسەرەکە فەرمانی پێدان بەرەو ڕێرەوی دۆڵەکە، کە ئێمە بڕوان وا بوو دەرەیخۆمانە، بچنەخوارەوە بەڵام دواجار پەیوەندییان بەجیهازەوە کردو ڕەنگورویان ڕۆشن بووەوەو دەستبەرداری چوونەخوارەوە بەرەو دۆڵەکە بوون.

پەناگاکەمان ئەگەر ئاشکرای بکەن دژوارە بتوانرێت لەبەردەم هێرشێکی لەلای سەرووەوە بەرگری لێبکرێت کە هیچ تواناو جێیەکمان نییە بۆ دەربازبوون. سەربازێك بەجێماو بەوێنەی سەگیماندو تێپەڕی و سەربازەکانی دی دەستیان دابووە جلوبەرگەکانی و پەلکێشیان دەکرد و هانی پەلەکردنیان دەدا، دوای ئەوە بەماوەیەکی کەم جوتیارێك تێپەڕی کە ڕێبەریی یەکێك لەسەربازە سەرگەردانەکانی دەکردو دواتر گەڕایەوەو هیچ ڕووداوێکی تازە ڕوویندەدا. ئەو ساتەی کە گوللەکەی تیادا تەقێنراودەنگیدایەوە ساتێکبوو لەشڵەژان و دڵەراوکێیەکی ئێجگار زۆر. سەربازەکان هەموویان بەکەلوپەلەکانیانەوە تێپەڕین و بڕوامان وا بوو بەرەو پاشەوە دەکشێنەوەو لەنێو کوختە بچوکەکەدا هیچ شوێنەوارێکی ئاگرمان بەدینەکرد. هەروەها گوێشمان لەدەنگی تەقە نەبوو کە بەشێوەیەکی باو بەهۆیەوە پێشوازی داهاتنی شەو و تاریکیدەکرێت. سبەینێ بەدرێژایی ڕۆژ پشکنین بەنێو گوندەکەدا دەکەین. نمە بارانێك دایکردو بەتەواوی جلوبەرگەکانمانی تەڕکرد بەڵام بۆ سڕینەوەی شوێنەوارو شوێن پێیەکانمان بەس نەبوو.

لەنێو دەنگوباسەکانی ئێستگەکەدا هەواڵی ئەوە بڵاوکرایەوە کە لاشەکەی کۆکۆ ناسراوەتەوە، بەڵام ئەو وردەکارییانەی کە دەربارەی جۆلیۆ باسیانکرد رۆشن نەبوو. میگیل‌وئانتۆنیۆ تێکەڵاو دەکەن. لەساتێکی دیاریکراویشدا هەواڵی کوژرانی منیان بڵاوکردەوەو پاش کەمێك رەتیان کردەوە.

## 29ی ئەیلول

رۆژێکی‌دیکەیە لەبارگرژیی، ئانتی‌وئانیستۆ بەدرێژایی رۆژ بۆ چاودێریکردنی خانووەکە دەرچوون‌و، هەر زوو جموجوڵ لەسەر رێگاکە دەستپێکردو لەناوەراستی‌بەیانیداو لە هەردوو لاوە...سەربازگەلێك تێپەڕین کەلوپەلیان پێنەبوو، هەروەها چەند سەربازێکی‌دیکەش تێپەڕین گوێدرێژێکی بارنەکراویان لەتەکدابوو و دواتر کە گەڕانەوە بارێکی زۆریان لێنابوو. ئانتی لەکاتژمێر شەش‌وچارەکدا هات‌و وتی ئەو شانزە سەربازەی کە چوونە نێو دۆڵەکەوە لەوێندەر چوونە نێو کێڵگەکەوەو ئیدی شوێنەواریان نەما..لایەنی زۆر گوێدرێژەکە لەوێندەر بەئازوخە بارکراوە. لەئاست ئەم دەنگوباسانەدا دژواربوو بڕیار دەربارەی وەبەرگرتنی ئەم رێگا ئاسان‌و لۆژیکییە بدرێت چونکە سەبارەت سەربازەکانیش هەر ئاسانە کە بۆسەگەلی تیادا دابنێن‌و لەبەرئەوەی خانووەکە سەگەلی لێیەو ئاشکرامان دەکەن. سبەینێ دوو پشکنین ئەنجامدەدەین: یەکەمیان لەهەمان شوێن‌وجێداو، دووەمیشیان بەرێکردن بەرەو سەر بەپێی‌توانا، بۆ سۆراخی دەروازەیەك لەوێندەر ئەگەر بەگوزەرکردن بەو رێیەشدابێت کە سەربازەکان بەکاریدەهێنن.

ئێستگەکان هیچ هەواڵێکی تازەیان بڵاونەکردەوە.

# 30ی ئەیلول

ڕۆژێکی‌دیکەیە لەبارگرژیی. لەنێو هەواڵەکانی ئێستگەی سالماسیدادا لەچیللی دەنگوباسی ئەوە بڵاوکرایەوە کە لەرێگای سەرچاوەگەلێکی فەرمیی نێو سوپاوە زانیاری ئەوەیان دەستگیربووە کە چێ گیڤارا لەنێو دەرەیەکی چۆڵدا گەمارۆدراوە. ئێستگەکانی ناوخۆ باسیان لەم هەواڵە نەکرد. ڕەنگە تەنها بۆ مانۆڕێك بێت لەلایەن ئەوانەوەو لەوانەیشە زادەی قەناعەتی دڵنیایان بێت سەبارەت بوونی ئێمە لەناوچەکەدا. جموجوڵی سەربازەکان لە هەردوو بەری ڕێگاکەوە دوانەکەوت، بۆ نموونە لەکاتژمێر دوانزەدا40 سەرباز بەچەند پۆلێکی جیاجیاو پرچەك بەتفەنگ تێپەڕین‌و چوون بۆ خانووە بچوکەکەو پاش ئەوەی پاسەوانییەکی توندیان دامەزراند، خێوەتیان لەوێندەر هەڵدا. ئانیسیتۆوپاچۆ ئەم هەموو زانیارییانەیان لەتەك خۆیاندا بۆ هاوردینەوە.

ئانتی‌وویلی بەدەنگوباسی ئەوەوە هاتنەوە کە ریۆگراندی لەماوەی دوو کیلۆمەترو لەسەر ڕاستەهێڵێکە لێرەوەو لەوێندەر لەسەرەتای دۆڵەکەدا سێ‌خانوو هەن‌و هەروەها هەر لەوێندەر شوێنگەلێکی ئەوتۆ باشیان بۆ هەڵدانی خێوەت دۆزیوەتەوە کە دژوارە بتوانرێت لەهیچ لایەکەوە ببینرێن.

ئاومان پەیداکردو لەکاتژمێر دەی ئێوارەدا ڕێکردنێکی شەوانەی سەختمان دەستپێکرد ئەوەی کە ڕێکردنەکەشی دژوارترکردین ئەوەیە چینۆ ناتوانێت بەتاریکی ڕێبکات. وادیارە بینینیۆ تەندروستیی باشە بەڵام ڕەوشی پزیشکەکە لەخراپەوە بەرەو خراپتر دەچێت.

## لێکدانەوەی مانگانە

دەبوو ئەم مانگە ماوەی ئامادەگیی بێت بۆ هێزەکان..بەکردەوە هەر واش دەبوو ئەگەر ئەو بۆسەیە نەبووایە کە میگیل وکۆکۆوجۆلیۆی تیادا کوژراو شێوازەی هەمووشتێکی تێکداو تەنانەت هەلومەرج وهەلوێستمانی مەترسیدارکرد، ئەمە وێڕای بزربوونی لیۆن. هەرچی دیارنەمانی کامباشە دەستکەوتێکی دیارە بۆ ئێمە.

لەتەك سوپادا توشی چەند پێکدادانێکی بچوك بووین و ئەسپێك و سەربازێکمان کوشت و سەربازێکی دیکەشمان زامدارکردو، ئوربانۆ لەتەك دەورییەیەکدا روبەروبووەوەو دواتر ئەو بۆسە نەفرەتییەی هیگیرای بەسەرداهات..دەستبەرداری هێسترەکانیش بووین و پێموابێت بۆ ماوەیەکی زۆر درێژخایان ولاخگەلی لەوجۆرەمان دەستگیرنابێت تەنها لەبارێکدا نەبێت ئەویش ئەگەر جارێکیدی دوچاری نۆبەی رەبۆ ببمەوە.

لەلایەکی دییەوە گێڕانەوەکان دەربارەی کوژرانی پیاوانی گروپەکەی‌دی هەمەجۆرن کە پێویستە وەکی گروپێك کە دوایی‌هاتووە تەماشابکرێت، ئەگەرچی ئومێدێکی بچوکیش هەیە، ئومێدی دەستەیەکی‌بچوك کە جموجوڵ‌دەکات و خۆی لەروبەروبوونەوەی لەتەك سوپادا بەدوور دەگرێت...چونکە هەواڵی‌کوژرانی هەر حەوت پیاوەکە لەیەك کاتدا بەلای منەوە زێدەرۆیی تیادایە ئەگەر هەر ناراست و درۆش نەبێت.

تایبەتمەندییەکانی ئەم مانگە هەر هەمان تایبەتمەندییەکانی مانگی پێشووە لەگەڵ زیادکردنی ئەوەدا کە سوپاچالاکیی وکارایی زیاتری سەلماندو جەماوەری جوتیارانیش هیچ دەستگیرۆییەکمان ناکەن و جوتیاران بوونەتە سیخوڕ.

ئەرکی بەپەلەودەستوبردمان وا دەخوازێت کە هەڵبێین و بەشوێن ناوچەگەلی لەباردا بگەڕێین و پاشان پەیوەندییەکان نوێبکەینەوە ئەگەرچی تۆڕی پەیوەندیمان لەلاپاز تێکشکێنراوەو گورزگەلێکی کەمەرشکێنی لێدراوە. ورەگەلی پاشماوەی تیمەکە هێشتا بەرزەو، تەنها سەبارەت ویلیبەدگومانم کە، ئەگەر قسەی لەتەکدا نەکەم، رەنگە بۆنەی هەراو پشێوییەك بۆ دەربازبوون بەتەنیا بقۆزێتەوەو دەربازبێت.

## 1ی تشرینی یەکەم1967

بەرزایی:1600مەتر.

یەکەمین رۆژی مانگ تێپەڕی بێئەوەی هیچ رووداوێکی تازە رووبداتو لەگەڵ هەڵهاتنیخۆردا گەیشتینە دارستانێکی بچکوكو دوای ئەوەی لەدەوروبەری خاڵە هەمەجۆرەکانی دەوروبەرماندا پاسەوانییمان توندکرد خێوەتەکەمان تیادا هەڵدا. چل سەربازەکە بەرەو چەمێك دورکەوتنەوە کە نیازمان وا بوو بەهۆی تەقاندنی چەند گوللەیەکەوە پەلاماری بدەین. لەکاتژمێر دوودا گوێمان لەدەنگیدوایین گوللەبوو و هێمنیی باڵی کێشاو هەموو شتێك بەوجۆرە دەهاتەپێشچاو هەر دەتوت خانووە بچوکەکان لەدانیشتوانەکانیخاڵین...ئەگەرچی ئۆربانۆ چاوی لەپێنج سەرباز بوو لەو لایەنەوە بەرەوخوارەوە لێژدەبوونەوەو بەرەو جێیەك کە نەمانتوانی دەستنیشانی بکەین درێژەیاندا بەرێگاکەیان. بڕیارمدا رۆژێکی دیکەش لێرە بمێنینەوە چونکە ناوچەکەم بەلاوە گونجاوەو سەبارەت کشانەوە بەسەلامەتیی یاریدەدەمان دەدات چونکە لەبەرزاییەکانییەوە چاودێریی هەموو جموجوڵەکانی دوژمن دەکەین. پاچۆوناتۆوداریۆوئۆستاکیۆ بۆ هاوردنی ئاو دەرچوونو لەکاتژمێر نۆی ئێوارەدا گەڕانەوە. شاباکۆ هەندێك خواردنی سورەوکراوی بۆ ئامادەکردینو کەمێکی ئەوتۆ لەگۆشتی وشككراوەی مانگای بەسەر پیاوەکاندا دابەشكرد کە زگە برسییەکان تێربوون.

هیچ هەواڵێکی تازە نییە.

## 2ی تشرینی یەکەم

سەربازەکان بەدرێژایی ئەمرۆ شوێنەواریان نەبوو بەلام هەندێك ئەسپ بەهاوڕێیەتی سەگەلێکی هەوشار لەنزیك پێگەکانمانەوە رەتبوونو زۆر

بەتوندی دەستیانکرد بەوەڕین. بڕیارماندا بەدەوری کێڵگەیەکی بچوکدا خول بخۆین کە زۆر لەدۆڵەکەوە دوورنییەو، لەدەوروبەری کاتژمێر شەشدا پرۆسەی لێژبوونەوەمان دەستپێکرد تا بەویەڕی ئارامی دەگەینەجێ و پێش پەڕینەوە خواردنەکەمان ئامادەدەکەین. بەڵام ناتۆ ڕێگای لێهەڵەبوو و لەسەر درێژەدان بەرێکردنە هەڵەکەی سووربوو. سەروەختێکیش بڕیاری گەڕانەوەماندا ڕێگامان لێتێکچوو و شەومان لەوێندەر بەسەربرد بێئەوەی بتوانین خواردن ئامادەبکەین یاخود تینوێتی لەرادەبەدەرمان بشکێنین. ئێستگەی کروز دیل سور لێدوانێکیدەربارەی بڵاوبوونەوەی هێزی زۆری سوپا لەبەرواری سیمانگی رابوردودا لەناوچەکەدا خوێندەوەو هۆکارەکەشی بۆ پێکدادانێك گەڕاندەوە کە لەنێوان سوپاو گروپێکی بچوك لەهاوڕێیانی ئێمەدا روویداو هەردوولا بێزیان بوون، ئەگەرچیهەندێك لەبەرپرسان دەڵێن شوێنەواری خوێن لەشوێنی پێکدادانەکەدا بینراوە...ئەم گروپەش بەگوێرەی راگەیاندنەکە لەشەش کەس پێکدەهات.

## 3ی تشرینی یەکەم

رۆژێکیدورودرێژو بێهیچ هۆیەکیش بارگرژە: لەو کاتەدا کە ئێمە خەریکی ئەوەبووین پەیوەندی بەبنکەکەمانەوە بکەین ئۆربانۆ هات و ئەوەی راگەیاند کە گوێیلەهەندێك لەجوتیارەکان بووە وتویانە:"ئەوە ئەوانن..کە دوێنێ شەو باسیان دەکردن"ئەم قسانەی لەکاتی رێکردنەکەدا بیستووە. هەواڵەکە بەهیچ کلۆجێك لەوە نەدەچوو کە راستبێت بەڵام وێڕای ئەوە بڕیارمدا بەوجەشنە رەفتاربکەم وەك ئەوەی هەواڵێکی تەواو دروست بووبێت، ئیدی پێش ئەوەی تینوێتییەکەمان بشکێنین بڕیاری سەرکەوتنمدا بەسەر تەپۆلکەیەکدا کە بەسەر رێگای سەربازەکاندا دەڕوانێت. رۆژ تەواو بەهێمنیی ئاوابوو و کاتێك کە تاریك داهات لەشوێنەکەمان

سەرەولێژبووینەوەو قاوەیەکمان خواردەوە بەلامانەوە تامی زۆر خۆشبوو ئەگەرچی‌ئاوەکە تاڵ بوو و ئەو قۆرییەش کە تیایدا لێنرا چڵکن بوو، ئینجا لەدواییدا بەمەبەستی نانخواردن هەویرمان شێلا، هەروەهاخواردنێکیشمان دروستکرد کە لەبرنج‌و گۆشتی تاپیر پێکهاتبوو. لەکاتژمێر سێداو لەدوای گەشتێکی پشکنین کە بەوپەڕی ئاسانی توخنی کێڵگەکە نەکەوتین، رێکردنمان بەرەو ئەو چەمە کە هەڵمانبژارد دەستپێکردو لەوێندەر هیچ شوێنەوارێکی‌ئاو یاخود نیشانەیەکی‌ئەوەمان بەدینەکرد کە سەربازەکان شوێنەکەیان پشکنیبێت.

ئێستگەکە هەواڵی ئەوەی راگەیاند کە ئەم دوو پیاوە لەپیاوەکانی ئێمە دیلکراون: ئانتۆنیۆ دۆمنفیرفلۆریس(لیۆن)و، ئۆرلاندۆ خیمینیز بازان(کامبا)و کامبا دانی ناوە بەهەڵگرتنی‌چەك لەدژی سوپاولیۆن‌یش ئەوەی راگەیاندووە کە متمانەی تەواوی بە وتەی سەرۆکە. ناوبراوان هەردوکیان زانیاریگەلێکی تێروتەسەلیان سەبارەت فیرناندۆو نەخۆشییەکەی‌وئەوانی دی داوە، وێڕای زانیاریگەلێکی دیکە کە لایەنی زۆر بڵاوناکرێنەوە.

بەمجۆرە سەربوردەی دووجەنگاوەری چاونەترس دوایی‌هات.

بەرزایی:1360مەتر.

گوێمان لەچاوپێکەوتنێکی‌دۆبرێ بوو: لەروبەروبوونەوەی داواکەرێکدا کە جارسی‌کردبوو، زۆر دلێربوو.

## 4ی تشرینی یەکەم

لەپاش وچانێکی کەم لەدۆڵەکەدا، بەئاراستەی رێرەوی رێگاکەدا درێژەماندا بەرێکردنەکە تا بەدۆڵێکی‌دی راگەیشتین، ئیدی کەمێك سەرکەوتین‌و تاوەکو کاتژمێر سێ وەکی‌هەڵهاتنێك لەدەست گەرمای‌خۆرەتاو پشووماندا. دواتر

مــاوەی نیوکاتــژمێری‌دی ڕێکردنەکــەمان دەســتپێکردەوەودیداری ئــەو پشــکنەرانەمان کــرد کــە هــەموو چــەمەکەیان تــەی‌کردبوو بێئــەوەی هــیچ شــوێنەوارێکی‌ئاو بدۆزنــەوە، لەکاتــژمێر شەشــدا دۆڵەکــەمان جێهێشــت و بەسەر ڕانە ڕێیەکی بچوکدا درێژەماندا بەڕێکردنەکە تا کاتژمێر حەوت‌ونیو و تــاریکی بــاڵی بەســەر ناوچــەکەدا کێشــابوو و هــەموو شــتێکی داپۆشــیبوو ئیدی تا کاتژمێر سێی‌بەیانی لەوێندەر ماینەوە.

ئێستگەکە هەواڵی‌گواستنەوەی بنکــەی سەرکردایەتی‌گشــتی فیرقــەی چــواری لــەلاگۆنیلاس‌ەوە بــۆ بــادیلا بەمەبەســتی تۆکمــەکردنی چــاودێریی لەناوچــەی ســیرانۆدا بڵاوکــردەوە، چــونکە وا بــڕوا دەکرێــت کــە جــەنگاوەران پــەنای بۆدەبەن، هەروەها لەئێستگەی ناوبراودا هەواڵی ئەوە بڵاوکرایەوە کە ئەگەر هێزەکــانی فیرقــەی چــوار مــن دیلبکــەن ئــەوا دادگاییکردنەکــەم لــەکامیری دەبێت، بەڵام ئەگەر هێزەکانی فیرقەی هەشت دیلیان کردم ئەوا لەسانتاکروز دەبێت.

بەرزایی:1650مەتر.

## 5ی تشرینی یەکەم

ســەروەختێك ڕێکردنمــان دەســتپێکردەوە تــاوەکو کاتــژمێر سێ‌وچــارەکی دوای‌نیــوەڕۆ زۆر بــەدژواریی پێشــڕەویمانکرد و لــەم کاتــەدا ڕەوتــی بزنمــان جێهێشــت و چــووینە نێــو دارســـتانێکی بچــوکەوە کـــە دارودرەختـــە لەبــەرزەکانی‌دەتوانن لەخراپــەی چــاوی خۆتێهەڵقورتێنــەران بمانپــارێزن. بینینیۆ بــۆ چــەند گــەڕانێکی پشــکنین دەرچــووە درەوە بەمەبەستی‌هاوردنی ئــاو و بەپشــت خانووەکــەی نزیکمانــەوە ســوڕانەوەو هــیچ شــوێنەوارێکی ئاویــان نەدۆزییــەوە..ئەگەرچــی بەڵگــەکان ئامــاژە بــۆ بــوونی بیرێــك لەدەوروبەرمانــدا دەکــەن. کــاتێکیش کــە لەپشــکنینی ســەرجەم ناوچــەکە

تـــەواوبون و گەڕانـــەوە، چـــاویان لەشـــەش ســـەربازبوو دەچـــوونە نێـــو خانووەکـەوە، وادیـاربوو وەك ئـەوەی تـەنها ڕێبـواربن و هیچـیتر. ئێـوارە کـە تاریك داهات هاتینەدەرەوەو تینوێتی بەتـەواوی شکاندبووینی و لەولاشـەوە ئۆسـتاکیۆ بـۆ چـۆڕێك ئـاو دەسـتیکردە گریان وشین وشـەپۆر. دوابـەدوای تێپـەڕبوون بەرێیـەکی سـەختی پـڕ لەئاسـتەنگدا لەگـەڵ زەردەدا گەیشـتینە دارسـتانێکی بچـوك و لەوێنـدەر لەناوچـەکانی دەوروبەر گوێمـان لـەدەنگی سـەگوەڕبوو هـەروەها لـەنزیك خۆشمانـەوە تەپۆلکەیـەکی روتـەن و ئێجگـار بەرزمان بینی.

هەرچـی فریاگوزارییـەك لەتوانامـدا هـەبوو بـۆ بینینیـۆم کـرد کـە زامەکـەی کـەمێك زۆخـاوی کردبـوو، هـەروەها دەرزییەکیشـمدا لـەپزیشـکەکەو ئاکـامی کارەکەشم ئەوەبوو بینینیۆ بەدرێژایی شەو لەکڕوزانەوە نەکەوت.

لـەنێو دەنگوباسـی ئێسـتگەکاندا هـەواڵی ئـەوە بڵاوکرایـەوە کـە هـەردوو هاوڕێکـــەی پێشـــوومان وەکـــی دوو شـــایەت لەدۆزەکـــەی دۆبـــرێدا گواستراونەتەوە بۆ کامیری.

بەرزایی: 2000مەتر.

## 6ی تشرینی یەکەم

لـــــەدوای پشکنینی ناوچـــــەکە بۆمـــــان دەرکـــــەوت خانوویـــــەك لەنزیکمان وخانوویەکی دیکەش کـەمێك لـەو دوورتـر هەیـە کـە ئـاوی تیادایـە. ئیـدی بـەرەو ئەوێنـدەر بەرێکـەوتین و بەدرێـژایی ڕۆژو لـەژێر گابـەردێکی ساف ولوســـدا کـــە لـــەبینین پاراســـتینی دەســـتمانکرد بـــەخواردن سازکردن... بەڵام دڵـم ئۆقرەی نـەگرت چونکە بـەرۆژی رووناك لەشـوێنێکی نزیـك لەناوچـە ئاوەدانەکانـداین. کاتێـك کـە ئامادەکردنی خواردنەکـە زۆری خایانـد بڕیارمانـدا لەگـەڵ هـەڵهاتنی خۆردا بـەرەو زێیـەکی نزیـك لـەم جۆگـە

بچوکە بڕۆین و لەوێندەر بەوردیی ناوچەکە بپشکنین بۆ ئەوەی ئەو ئاقارە دەستنیشان بکەین کە وەبەری دەگرین.
ئێستگەی لاکروز دیل سور باسی دیدارێکی کرد کە لەتەك دوو هاوڕێکەی پێشووماندا سازکراوەو ئۆرلاندۆ لەهاوڕێکەیدی کەم خراپتر دیاربووە، هەروەها ئێستگەی چیللی هەواڵێك کە سانسۆر لایبرد، سەبارەت بوونی 1800 سەرباز کە شوێن پێی ئێمە هەڵدەگرن، بڵاوکردەوە.
بەرزایی: 1750 مەتر.

## 7ی تشرینی یەکەم

یانزە مانگ بەسەر دەستپێکردنی جەنگیپارتیزانییدا تێپەڕی بێئەوەی ئاڵۆزیگەلێکیئەوتۆ کە شایانی باس بێت رووبدات، لەکاتژمێر دوانزەونیودا پیرەژنێك هات بۆ پاسەوانیی بزنەکانی لەو دۆڵەدا کە ئێمە خێوەتمان تیادا هەڵداوە هەربۆیە ناچاربووین دەستگیری بکەین. ژنەکە هیچ زانیارییەکی سەبارەت سەربازەکان پێنەداین. وتی لەبوونیان بێخەبەرمو لەوەتەیماوەیەکی زۆر دورودرێژە بۆ ئەو ناوچەو شوێنانە نەچووم. هەندێك زانیاری سەبارەت رێگاکان پێداین کە وادیارە، ئەگەر راست بکات، کاتژمێرێك رێکردن لەهیگیراس و کاتژمێرێك لەجاگای و نزیکەی دوو کاتژمێر لەبۆکاراوە دوورە. ئانتی وئانیسیتۆ وپابلیتۆ لەکاتژمێر پێنج ونیوی دوای نیوەڕۆدا سەردانی پیرەژنەکەیان کرد کە لەتەك کچێکیدا کە چەقەلوی دوچاری هەڵئاوسان بووەو چاویشی کزە نیشتەجێیەو...بڕی 50 پیزۆسیان پێدان و داوای ئەوەیان لێکردن کە قسەنەکەن و بێدەنگبن بەڵام لەراستیدا بێئەوەی ئومێدێکیزۆر بەبێدەنگبوونیان هەبێت.
لەکاتژمێر پێنجداو بەپشتبەستن بەتریفەیەکیخامۆشی مانگ دەرچووین و رێکردنەکە پڕ لەماندوێتی بوو ئیدی شوێنەوارگەلێکمان لەو دۆڵە کە تیایدا

نیشتەجێین، لەپاش خۆمانەوە بەجێهێشت...راستە خانووگەلی نزیکی لاوە نییە بەڵام کێڵگەگەلێکی بەپەتاتە چێنراو و ئاودراو بەئاوەرۆی تایبەت کە لەجۆگەکەوە راکێشرابوون لەدەورویەردا هەبوون. لەکاتژمێردووداو دوای ئەوەی رێکردنەکە بەهۆی خلیچکییە لەرادەبەدەرەکەیەوە کەڵکی نەما، بەمەبەستی پشوو لاماندا..چینۆ لەرێکردنە شەوانەکاندا بارێکی گرانی سەرشانمان بوو.

سوپا راگەیاندنێکی سەیری دەربارەی بوونی250سەرباز لەسیرانۆ بۆ رێگرتن لەدزەکردنی جەنگاوەران کە ژمارەیان37 کەسە بڵاوکردەوەو، راگەیاندنەکە ئەو ناوچەیەی کە ئێمە پەنامان بۆ بردووە لەنێوان ئاسیرۆوئۆرۆدا دەستنیشانکرد. وادیارە مەبەست لەمانە بۆسەرلێشێواندن و چەواشەکردنمانە.

بەرزایی:2000مەتر.

## سەرنج

ئەم رۆژانەی لای خوارەوە لەنێو رۆژانەکانی چێ گیڤارای سەرکردەدا هێمایان بۆ نەکراوە:

4، 5، 8، 9ی کانوونی دووەم.

8، 9ی شوبات.

14ی ئادار.

4، 5ی نیسان.

9، 10ی حوزەیران.

4، 5، 26ی تەمموز.

## پەراوێزەکان

(1)مەبەست لەگوانتانامۆیە.

(2)مەبەست لەکاتی بڵاوکردنەوەی ڕۆژانەکانە لەکۆتایی سالانی شەستەکانی سەدەی رابوردودا. (3)خۆسێ مارتی Marti, Jose Jolin (1853—1895): شاعیروقارەمانێکی کوبابیە. سیمبولی خەباتی کوبایە لەپێناو ئازادبوون لەکۆلۆنیالیزمی ئیسپانیا. لەنێو گەرمەی جەنگی لەپێناو سەربەخۆییدا گیانی لەدەستداوە.(شیعرگەلێکی سەرفراز Versos Libres یەکێکە لەدیارترین بەرهەمەکانی کە لەنێوان سالی1878 و سالی1882دا نووسیویەتی.

(4) رادیۆپامیا: دەستەواژەیەکی میللییە لەکوبا، مەبەست لێی بڵاوبوونەوەی قسەوباس و پڕوپاگەندەیە.

(5)دۆمینیکان RepublicaDominicana: کۆمارێکە دەکەوێتە بەشی خۆرهەلاتی دورگەی هیسپانیۆلا لەدەریای کاریبیدا. میللەتەکەی بەزمانی ئیسپانی دەدوێت. لەسالی1844دا بووەتە کۆماری سەربەخۆی دۆمینیکان. لە28ی نیسانی1965دا لەلایەن هێزە سەربازییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە پەلاماردراوە.

(6)مەبەست لەسالی1968ە.

(7)پاشنگۆ دواتر بەناوی پاچۆش ناودەبرێت.

(8)لەچەندجێیەکی دیکەدا ناوی تۆمایە.

(9)هەروەها بەناوەکانی لۆرۆ وجۆرجیش ناودەبرێت.

(10)هەروەهابەناوەکانی ریکاردۆ وشنشۆش ناودەبرێت.

(11)جۆرێکە لەتفەنگ.

